زنجیرەی کتێبی یەکەم



# دۆستی باوەڕداران و هاوڕێی سەرفیرازن

## (أنيس المؤمنين)

کۆمەڵێک بەسەرهات و داستانی ڕوداوین و لەزۆربەی زۆری پێشەواو سەرکردەی زانا و بەتواناکانی ئیسلامەوە وەرگیراوە

نوسینی

صفوك سعدالله المختار

وەرگێڕانی

عبدالله حسن سعید (خەلەکانی)

چاپی شەشەم

هێندێک بەدەستکارییەوە

١٤٣٥ك ٢٠١٤ز

زنجیرەی کتێبی
یەکەم

# دۆستی باوەڕداران و
# هاوڕێی سەرفیرازن

## (أنيس المؤمنين)

کۆمەڵێك بەسەرهات و داستانی ڕوداوین و لەزۆربەی زۆری
پێشەوا و سەرکردەی زانا و بەتوانایانی ئیسلامەوە وەرگیراوە


نوسینی
صفوك سعدالله المختار
وەرگێڕانی
عبدالله حسن سعيد ( خەلەکانی )



چاپی شەشەم
هێندێك بەدەستکارییەوە

١٤٣٥ ك ٢٠١٤ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ ﴾يوسف/١١١

**واتە : بەڕاستی لە گێڕانەوەی باسی بە سەرهاتی پێغەمبەراندا پەندوئامۆژگاری وەرگرتن زۆرە بۆ ئەوانەی خاوەن بیرو هۆشن .**


**ناوی کتێب بەعەرەبی: انیس المؤمنین**

**ناوی نوسەر: صفوك سعدالله المختار**

**ناوی کتێب بەکوردی: دۆستی باوەڕداران**

**ناوی وەرگێڕ: عبدالله حسن سعید**

**نەخشەسازی و بەرگ : نووسینگەی (هیوا)**

**نۆرەوساڵی چاپ:شەشەم:٢٠١٤ز**

**چاپخانە:**

**ژمارەی سپاردن: (٢٩٦) ساڵی (١٩٩٩)ی وەزارەتی ڕۆشەنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانی پێ سپێردراوە .**

# ﴿ پێشکەش بێت ﴾

١- بەگیانی پاکی هەموو ئەوانەی کە بەرەو ئازادیو ڕزگاری کۆشش دەکەنو ڕێگەی ڕاستی دەگرنەبەرو, بەتەنگ دوا ڕۆژی ئیسلامەوەن .

٢- بە گیانی شیرینی هەموو کوردێکی موسوڵمان کەدەیانەوێ پەروەردەو پێگەیاندنی ڕۆڵەکانیان لەسەر ڕێبازی ئیسلام پێبگەیەنن.

٣- بەگیانی ڕەنگینی ئەوتازە لاوانەی کەچێژ لەئامۆژگاریو ڕەوشتی باش وەردەگرنو غونچەی نەوبەهاری ژیانیان بەنە سیمی فێنکی ئازادی چەوساوەکان دەپشکوێت .

٤ - بەگیانی دایکمو, باوکی کۆچ کردومو, براوخوشکەکانمو،هاوسەرە بەڕێزەکەمو، کچ وکوڕە خۆشەویستەکانمو, هەموودۆستوئاشنای دڵسۆزی موسوڵمان .

وەرگێڕ/ خەڵەکان

١٩٨٧/٦/١٨

ئازیزان و خۆشەویستانی خوێنەر: بەخۆشحاڵییەوە دەڵێم کاتێک ئەم کتێبەی ( **انیس المؤمنین**)م بەردەست و خوێندمەوە زۆرم پێ خۆش بوو، زۆر بەخێرایی وەرمگێرایە سەر زوبانی کوردی وەهەر خێرا بەکوێرەی ناونیشانی کتێبەکە رۆیشتم بۆ موسڵ بۆ لای نوسەری کتێبەکەی **(صفوك سعدالله)**.

داوای مۆڵەتی وەرگێران و لەچاپ دانیم لێ کرد، سوپاس بۆ خودا زۆر بەدڵنیاییەوە وەڵامی دامەوەو ئەم چەند دێڕەی بۆ نووسیم.

## بسم الله الرحمن الرحيم

السيد مدير عام رقابة المطبوعات المحترم

اني (صفوك سعدالله المختار)، مؤلف كتاب (**أنيس المؤمنين**) قد رخصت للسيد (**عبدالله حسن سعيد**) بترجمة وطبع كتابي (**أنيس المؤمنين**) باللغة الكردية . مع الشكرو التقدير.

**صفوك سعدالله المختار**
**الموصل - العكيدات**
**مؤلف: انيس المؤنين**
**١٩٨٧/٩/٢٩**

## ﴿پێشـــەکی﴾

الحمدلله رب العالمين, رب يسّروأعــن ياكريم، يامالك يوم الــدين, إيــاك نعبــد وإيــاك نستعين، والصلاة والسلام عــلى محمد خير خلق الله اجمعين، وقائد المجاهدين وامام المتقين، وعــلى آله الطاهرين، واصحابه الهادين، واتباعه المخلصين .

خوێنـــەرانی ئــازیز:شـــوکرو ســـوپاس بـــۆ خـــودا کـــە توانیومانـــە لەناوئەوهەموونەخشە و پیلانە گلاّوانەی کە بەرامبەر بە ئیسلام و, موسڵمانان دەکرێ بۆ لادان و هەڵدێرانیان، بەموسڵمانی ماوینەوە .

لـەخوداش دەخـوازین پیلانـی ناحـەزان کارمـان تێنـەکات: چـونکە بـەردەوام خـەریکن ڕاسـتی ئیـسلام بـشێوێنن و, نەخـشەی خـەراپی جـۆراو جـۆر بـە موسڵمانان پیشان بدەن و, چەواشە و سەرگەردانیان بکەن و، ڕێـچکە و کوێرە ڕێیان بۆ دیاری بکەن .

ئەوکاتــە بەدبــەخت و, ســەرگەردان دەبـین و، زەرەرمەنـدی دونیـاو، دوا ڕۆژ دەبین کە بەڕاستی ئەوەش زەرەرو ماڵ وێرانیە !.

خسر الد نيا والاخرة ذلك هو الخسران المبين

دەبـا ئێمــەش پـێش ئـەوەی ژیانمـان لێ تێـك بـچێ و ڕێگـەمان لێ ون ببـێ باثاوڕێك لە بەرنامە ڕاستەکەی خودا بدەینەوە, کەهەموو کاتێك چاوی لێمانەو بەپەرۆشەوە بۆمان دەڕوانێ، کە ڕێگەمان لێتێك نەچێ, بۆیە دەفەرموێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَــادِ﴾الفجر/١٤ بەڕاستی خـودا لەکـەمین دایـە بۆیـا ڕێزگاریمـان. بۆیەلـە جێگەیەکی تردا دەفـەرموێ:﴿ وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ الـسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ الأنعام/١٥٣.

دەبێ زۆرباش بـزانین کەڕێگـەی ڕاسـت تـەنها بەرنامـەی خودایە .خوداش فـەرمانمان پێـدەکات کـە بەڕاسـتی ئـەو ڕێگەیـە بگـرین و بـەدوای ڕێـچکۆڵەکان نەکـەوین, چـونکە(سـبل) ڕێگـاو ڕێـچکەی زۆر بـچوکن، چـەند هـەنگاوێك دەڕۆن

وکۆتاییاندیْوناتکەیەننــەجێگای مەبەســت و,پەرتەوازەوبەدبــەخت دەبــی و,لەڕۆیشتنیش دا توشی ڕیْ لێتێك چون و هەڵدێران دەبی.

ئینجا خوێنەرانی ئازیز : بۆ ئەوەی بتوانین تەمەنی ڕاستە قینەی هەردوو جیهان بەسەر بەرین و, سەربەست و ئازاد و بەختەوەر بژین .

وەبۆ ئەوەی لەزەلکاوی نەگبەتی و, بەدبەختی و،لەگۆماوی قوڕو لیتەدا نەخنکێین,بارێبازی پێغەمبەر ﷺ و بەرنامە پڕ ڕێزو شیرینەکەی بگرینەبەر، چونکە بەڕاستی کەسەیری ڕێبازو هەڵس وکەوتی موسڵمانانی پێشو دەکەین، کەچۆن ئازاو چاو نەترس و بەخەم یەکەوە بوون، وەلەپێناوی سەرکەوتنی وشەی (لااله إلاالله) دا خۆیان بەخت دە کردو هەموو هیواو ئاواتیان سەربەرزی دینەکەیان بوو, چونکە دەیان زانی سەرکەوتنی بەرنامەی خودا ڕزگار بوونی ئادەمیزادەکانە، لە دەستی ستەمو زۆرداری تاغوتان دا،وە هەموو کاتێك وەکو برای دایك وباوکی دەژیان و، دەست بەسەری و تاوانیان قبوڵ نەدەکرد .

ئینجا بۆئەو مەبەستە، نامیلکەی (أنیس المؤمنین) ئامادەو ڕێکخستنی مامۆستا ( صفوك سعدالله ا لمختار) کە بەڕاستی زۆر پێویستە لاوەکان بەتێکەیشتنەوە وەری بگرن،کە زۆربەی باسەکانی لە ڕوداوی ڕاستی و واقیعدا وەرگیراون و ڕاستن، کە ئادەمیزاد فێری چاونەترسی و، ئازایەتی و، خۆنەویستی و، بەخە م یەکترەوە بوون دەکا ت . بێگومان ئەوانەش سەرچاوەی بەرزی ڕزگاری مرۆڤن.

خوێنەری ئازیز :مامۆستای بەڕێز . لەپێشەکی نامیلکە کەیدا دەفەرموێ: ڕۆژگارێکی زۆر بەسەر موسڵمانان دا تێپەڕیوە,کە دڵ و دەرونی زۆربەیان ڕەق بووەو, تاریك وڕەش هەڵگەڕاوە . بەجۆرێك کە ڕاست لە درۆو,چاك لەخراپ و, دروست لە ناڕەوا, جیاواز ناکەنەوە:

وە نەزانی و نادانیان گەیشتۆتە ڕادەیەك، بەجۆرێك کە لەپێشەواو گەورە پیاوانی موسڵمان, هێندێکیان تەنها ناوەکانیان دەزانن. بەڵام نازانن ئەو

ناودارانە چین و چیان کردووە ؟ .بەلأم لە بارەی سەرکردە و ناودارانی ڕۆژ هەلأت و ڕۆژئاوادا زانیاریان زۆرەو باشیان دەناسن .

دەفەرموێ: زۆرم دیون کە شالأو بۆ گۆڤارو، ڕۆژنامەو، پەرتوك خانەکان دەبەن بۆ کرین، یان خوێندنەوەی ئەوپەرتوك و گۆڤارانەی کەبەسەرهاتی ژیانی پیاوێکی ڕۆژهەلأت،یان ڕۆژ ئاوای بێ دین و بێ ڕەوشتی تێدابێت .ئەوخوێندنەوە زۆرکاریان تێدەکات و دەیان هەژێنێ و، ڕێبازی پوچەلی ئەوان دەگرنەبەر .لەگەلێ ئەوەش دا، ئەولاوانە نازانن،یان خۆیان نەزانن و، کەم بیر دەکەنەوە، لەوەی کە لەناوسەرۆك و سەرکردەو پێشەوایانی موسلمانانندا، کەلەپیاوی زاناو شارەزای واهەبووە. لە سەرکردایەتی داو، لە سیاسەت و بە ڕێوەبردنی وولأت: نەئێستا و نەلەمەودواش، لەناو ڕۆژ هەلأت و ڕۆژ ئاوادا بەدی ناکرێت و نابێت. بۆیە بەپێویستم زانی کەمێك باسی ئەوزاناو سەرکردەو پیاوە لێهاتوانەی ئیسلام لەبارەی ئابوری و، سیاسی و، سەربازیو، کۆمەلأیەتی، بکەم بەکوێرەی ئامۆژگاریو، سوود لێوەرگرتن بەشێوەیەکی ئاسان : خوێنەر تێی بگات و پەندی لێوەر بگرێ و، بیکاتە دۆستی خۆی :وەباسەکانی ئەوپەڕتوکەشم لەسەرچاوەی زۆرلە کتێب وگۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئیسلامی دا دەرهێناون ........

لێرەدا ووتەکانی مامۆستای بەڕێز کۆتایی هات.

خوێنەرانی ئازیز .لەبەرگرنگی ئەو باس و بەسەرهاتانە،بەندەش وەك و قوتابیەك بۆ ئەزمون وتاقی کردنەوە نوکی خامەم گرتە دەست و، خستمە سەرکاغەز بۆ وەرگێرانی ئەو باس و ڕوداوانەی ناو ئەو پەرتوکە، هیوادارم لە خودای بالأ دەست، ئەگەرچی کەم و کوڕیشی هەبێ ببێتە زەخیرەیەك بۆ دواڕۆژو،کەلێنێکی بچوکی فەرهەنگی کوردی پڕبکاتەوە و . دلی خوێنەران خۆش بکات و، لەکەم و کوڕیو ڕەخنەگرتن،چاو پۆشیم لێبکەن و، ڕاستەوخۆ ئاگادارم بکەنەوە، تانەو تەشەر نەهاون : چونکە کەس بێ هەلە نیە تەنها خودا

نەبیّ.

خوێنەری ئازیز : بائەوەش بێنمەناو باسەکە، ئەوەی کەمن کردومە : باوەڕم پیّ بکەن بەخزمەتی دادەنێم، باتێرو پڕیش نەبێت،بەمەرجێك نافەرمانی خوداو پێغەمبەری(ﷺ) تێدا نەبێت و, نەبێتە هۆی سەرلیّ شێوانی مرۆڤەکانیش,چونکە سەیر دەکەم زۆر لە ئا دەمیزادەکان بەڕون و ئاشکرا ڕێگەی لاروچەوت دەگرنەبەرو, سەرلەمرۆڤەکان دەشێوێنن و, بەناڕەوا دەیان چەوسێننەوەو حەق‌و مافیان دەخۆن و نیشتمانێك وێران دەکەن و، لەگەلّ ئەو هەموو وێران کردنەشدا بەخزمەت و پێشکەوتوی دادەنێن : تەنها مەبەستیشیان ئارەزوبازی و، تێرکردنی جینس و, پێگەیاندنی خۆیان و, دەورو بەریانە، بەبیّ ڕەزامەندی خوداو پێغەمبەرو ڕێبازی ئیسلام: لە کۆتایی دا لەخودای گەورە داواکارم کە یارمەتی‌و, کۆمەکی هەموو لایەکمان بکات بۆ پەیڕەو کردنی ڕێبازی ئیسلام .

وە لە هەموو ئیش و کارێکماندا مەبەستمان پیّ ڕەزابوونی خودا بێت و بەس. وەڕەزابوونی خوداش سەرچاوەی هەموو کردارو گوفتارێکمان بێت .

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

**وەرگێڕ**

**لە / ١٨-٦-١٩٨٧**

## ﴿پرۆگرام وشێوازی دەربڕینی وشەی پێغەمبەری خودا ﷺ﴾

## ( منهج الرسول علـيه الصلاة والسلام)

پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ: ناسینو زانیاری، سەرچاوەی ماڵ و سەروەتمە، ژیری بنەرەتی ئاینمە، خۆشەویستی بنیاتمە، ئارەزو سوار چاکی منە، وە زیکرویادی خودا، هۆگری منە، وەپشت بەستن ومتمانە، خەزێنەو سەروەتی منە، کزی وداماوی، هاوەڵی منە، زانیاری، چەکی منە، ئارامی وهێدی، سەرپۆشمە، ئارەزو لابردن، پیشەمە، قایل بوون، دەوڵەمەندی منە، دڵنیایی و باوەڕکردن، هێزو توانای منە، ڕاستی وڕەوایی, دۆست و بەشی منە، خودا پەرستی،خۆشەویستی منە، تێکۆشان و بەربەرەکانی، ڕەوشت و ئابڕوی منە، وە ڕووناکی چاوانم، لە نوێژدایە .

## ﴿ ناسینی خودای گەورە ﴾

## (معرفة الله )

جارێکیان بەحەزرەتی (ئەبوبەکر)یان ووت ﷺ : ئەی (ئەبوبەکر) خودات بەچی ناسی ؟! لە وەڵام دا فەرمووی : خودام بەوەی ناسی , کە خودامەو پەروەردگارمە، وەئەگەر خودام نەبا،خودام نەدەناسی ؟.

دووبارە: لێیان پرسی چۆن خودات ناسی ؟ بەڕێز ئەبوبەکریش لەوەڵامدا فەرمووی: داماوی لە تێگەیشتن, تێگەیشتنە, وەلێکۆڵینەوە لەسەرچاوەو, بنەڕەتی خودا, هاوبەشی کردنە .

## ﴿بەڕێزوگەورەترین پێویستی کەل وپەل ﴾

(اشرف شیء)

(عەبدالله ی کوڕی عەباس)ﷺ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە. فەرموویەتی:

١- گەورە ترین باوەڕ ئەوەیە, کە ئادەمیزاد دڵنیابێ لێت .

٢- گەورە ترین موسڵمانەتی ئەوەیە، کە ئادەمیزاد لە دەست و زمانت دڵنیابن.

٣- گەورە ترین کۆچ کردن، دوورکەوتنەوەیە لە خەراپە.

٤- گەورە ترین تێکۆشان (جیهاد) ئەوەیە، لە پێناوی خودا بکوژرێی و ولاغەکەت سەرببڕدرێت .

٥- گەورە ترین ئارەزو لابردن و, چاوتێری ئەوەیە ؟دڵی خۆت ڕابگری لەسەرئەوەی کە خودا پێی داوی .

٦- وەگەورەترین کەلو پەل کە لە خودای داوا بکەی،لەش ساغیە بۆدینو دونیا.

## ﴿ دەستی هەڵاوە سراو ﴾

(اليد المعلقة)

(حافیزی بەیهەقی)ﷺدەگێڕێتەوە: لە (خوبەیبی کوڕی یوسفەوە)ﷺ دەڵێ :من و پیاوێك لەخێڵەکەمان, لەپێشی موسڵمان بونمان لەکاتی جەنگ و هەرای موسڵمانو بێباوەڕان، ڕێك کەوتینوچوین بۆلای پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ئارەزومان هەیە کە لەو جەنگ و هەرایانەدا بەشداریتان لەگەڵ دا بکەین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا ئێوە موسڵمان بوون ؟

ئێمەش وتمان : نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا موسڵمان نەبووین ! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئێمە داوای یارمەتی لە کەسێك ناکەین کە هاوەڵ بۆ خودا

بڕیاربدا, بۆ سەر ئەوانەی کە هاوەڵ بۆ خودا پەیداکەرن, دەڵێ: ئێمەش خێرا موسڵمان بووین ئامادەبونی خۆمان پێشکەش کرد لەگەڵ پێغەمبەری(ﷺ) خودا دا چووینە ناوکۆڕی جەنگێك لە جەنگەکاندا, وەلەناوجەنگەی شەرێدا، شیرێك بەسەرشانم کەوتو شانم وشك بوو کاری نەکردووکەوتو هەڵوا سرا، خێرا دەستەکەم گرتەوەو بەرەولای پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتم, پێغەمبەرﷺ تفی موبارەکی لەشانم داو دەستەکەی بە شوێنی خۆیەوە ناوگرتیەوەو ئێش و ئازاری نەما, هەرخێرا گەڕامەوە مەیدانی جەنگ، ئەو کابرایەم دۆزی یەوە کە شیرەکەی لێ دابوم، بۆلای چوم و شیرێکم لێداو بەرەو دۆزەخ ڕەوانم کرد .

## ﴿ خوێندن و بیرکردنەوە﴾

### ( قراءة وتدبر)

دەگێڕنەوە جارێك (بلالی حەبەشی)ﷺ هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خودا (ﷺ)بە یانیەك لەکاتی بەرەبەیاندا ڕۆیشت بۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺبۆ بانگ دان کە گەیشتە مزگەوت سەیری کرد پێغەمبەر لە مزگەوت دانیشتووەو دەگریا: (بلالی کوڕی ڕەباح)ی حەبەشی (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا گیانم بە فیدات بێ چی بووە, بۆچی دەگریەی .؟ پێغەمبەریش ﷺلە وەڵامدا فەرمووی: ئەی بلال، چۆن نەگریەم ! خودای گەورە ئەم شەو ئایەتێکی لە قورئان بۆ ناردووم، هاوارو بەدبەختی بۆ ئەوانەی کەئەو ئایەتە بەئاشکرا ئەخوێننەوەو بەدڵ بیری لێ ناکەنەوە:ئەوەش ئایەتە کەیە کە خودا دە فەرموێ:﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴾ عمران/١٩٠

واتە:بەڕاستی ئەو بوونەوەرە لەهەموو گۆشەیەکەوە کەلێی وورد ببیتەوە, لەدروست کردنی ئاسمانەکانداو لەو ئەستێرانەی کە لەسەرمان ئەدرەوشێتەوەو هاتو چۆ ئەکەن و ئەسوڕێنەوەو بە هەناسەیەکیش پاش و پیش ناکەون, وە

دروست کردنی زەوی بەخۆیو دارو بەردو گیان لەبەریەوە, بەو کەلەشە گەورەو زەبەلاحەیەوە دە سوڕێتەوە بەدەوری ڕۆژداو جوڵە ناکات . بەڕاستی بەڵگەو نیشانەن لەسەر تاكو تەنهایی خودا,بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن هۆش وبیری پاكو بێ دەردونەخۆشین .

## ﴿ کڕنۆشێکی درێژخایەن ﴾

### (سجدة طويلة)

ئەگێڕنەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) ﷺ. بەلای پێغەمبەری خودا دا( ﷺ) تێپەڕی کە سەیری کرد پێغەمبەری خوداﷺ لەبن دار خورمایەك سەری لەسەر زەوی داناوەو کڕنۆش (سجد)ە بۆخودا دەبات: وە بەڕاستی کڕنۆشەکەی زۆر درێژەی خایاند:

(عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) ﷺڕاوەستا هەتا پێغەمبەر (ﷺ) سەری لەسەر زەوی بەرزکردەوە ئینجا ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی کڕنۆشەکەت زۆر درێژەی خایاند وام بە خەیاڵ داهات کە گیانی پیرۆزت تێدا نەما بێت !وە هەتاكو ئێستا نەم دیوی کڕنۆشی وا درێژخایەن بەری.؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەلآمی عبدالرحمن دا فەرمووی: ئێستا حەزرەتی (جبرائیل )ﷺ هاتەلام و فەرمووی: خودای گەورە سەلامت لێ دەکاو دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەرکەسێك سەلآواتت لەسەر لێبدات ئەمن بۆخۆم سەلآواتی لەسەر ئەوکەسە لێدەدەم . منیش بەبۆنەی ئەو موژدە خۆشەوە, کڕنۆشی سوپاسم بۆ خودا برد .

## ﴿ بانگی خودا ﴾

### (نداء الله )

دەگێڕنەوە ڕۆژێك هاوەڵی پێغەمبەری خوداﷺ :(عبداللەی کوڕی اُم مکتوم ) ﷺ ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەری خوداوﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا چاوساغێکی وام نیە کە ڕێگەی مزگەوتم نیشان بدات وەیان دەستم بگریٚ و بمبا بۆ مزگەوت، وەڕێگاکەشمان زۆر ناخۆش و درکاوییە، ئایا ڕێگەم دەدەی لەماڵەوە نوێژیٚ بکەم و نەیەم بۆ مزگەوت ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عبدالله گوێت لەدەنگی بانگ دەبێت .؟ (عبدالله ی کوڕی اُم مەکتوم) ﷺووتی: بەڵیٚ ئەی پێغەمبەری خودا, ئینجا پێغەمبەر لەوەڵامدا فەرمووی: ئەی عبدالله دەبیٚ وەڵامی بانگی خودا بدەیتەوەو بەدەنگی بانگیشەوە بڕۆی و نوێژ لە مزگەوت بکەی .

## ﴿ڕوویەکی ڕاست و گەشاوە﴾

### (وجه صادق)

لەوکاتەی کە پێغەمبەری (ﷺ) خودا لەبەر ستەم ودەست درێژیە ناڕەواکانی دانیشتوانی مەککە, کە کۆچی کردو چووە ناو شاری مەدینەوە،(عبدالله ی کوڕی سەلام) ﷺکەئەوکات گاورێکی بیٚ باوەڕبوو دەڵیٚ: یەکەم جار: کە چاوم بەدەم و ڕوخساری پێغەمبەر ﷺکەوت بەبیٚ ڕاوەستان ووتم (اشهد ان لااله إلاالله واشهد ان محمداً رسول الله)، باوەڕم پیٚ کردو موسڵمان بوم: ئینجا گاورەکانی دەورو بەرم هەموو لەلام کۆبونەوەو دەستیان کرد بەلۆمەو سەرزەنشتم و پێیان ووتم : ئەی عبدالله چی هۆیەك بوو پاڵی پێوە نای ئەو ووشانەت ووت و باوەڕت بە محمد هێنا ؟. عبدالله کوڕی سەلام لەوەڵامدا ووتی: سوێند بەوخوایەی کە کەسی لە وێنەو ڕەنگ نیە : ئەودەم و چاوەی پێغەمبەرﷺ کە ڕاستی تێدا ئەدرەوشێتەوە بەدەم و چاوی درۆزن ناچیٚ ! بەڕاستی پێغەمبەری خودایەو داوایەکەی ڕاستەو بەبیٚ لەکەیە .

## ﴿ قورئان سەرچاوەی هەمووشتێکە﴾

( لا شيء بعدالقرآن)

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا (ﷺ)چاوی بە حەزرەتی(عومەر)کەوت(رضي الله عنه) نوسخەیەکی لە(تەورات)پێ بوو,پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە چییە بەدەستەوە ئەی عومەر .؟

حەزرەتی عومەریش(رضي الله عنه) فەرمووی: ئەوە نوسخەیەکە لە تەورات ئەی پێغەمبەری خودا, پێغەمبەر (ﷺ) دەموچاوی سور هەڵگەڕاو توڕە بوو ووتی: ئەی عومەر بۆچی تۆ هێشتا لەسەرگەردانی و دوودڵی داماویەوە وەك وگاورو جولەکە؟. ئەدی نابینی خودای گەورە قورئانێکی بۆناردووین کە سەرچاوەی ڕاستەقینەیەو، خۆراکی ژین و، بەرنامەی ژیانەو، پاك وبێخەوشە، بەڕاستی ئەگەر ئێستا حەزرەتی(موساعلیەالسلام)ی برام زیندو ببایەوە بەدوای هیچ نەدەکەوت: تەنهاڕێگەی منی دەگرت و بەفەرموودەی قورئان بەڕێدا ئەڕۆیشت .

## ﴿ دانیشتن لە کۆڕی هەژاران ﴾

( جليس الفقراء)

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا (ﷺ)لە کۆڕێکی هەژاری موسڵمانان دانیشتبوو، کابرایەکی دەوڵەمەندی شار هات و چوو بۆلای کۆڕەکە : شوێنێکی وەهای دەست نەکەوت کەلێی دابنیشێ تەنها لەلای هەژارەکان نەبێت: کابرای دەوڵەمەند بەدوو دڵیەوە خۆی خڕکردەوەو، لە سوچێکی لای هەژارەکاندا دانیشت، پێغەمبەر (ﷺ)چاوی لێ بوو فەرمووی: ئەی برا پێم بڵێ بۆچی کە دانیشتی جلەکانت کۆکردەوە لەوە ترسای کە ئەو هەژارە زۆریت لێ بکا .؟ یان تۆ دەوڵەمەندی و هاوسێیەتی ئەو هەژارەت پێ ناخۆشە.؟ لەو کاتەدا کابرای

دەوڵەمەند هەستی بەدڵ تەنگیەکی زۆر کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە پاداشتی ئەوەی کەمن بیری خەراپم بەدڵ داهات :ئەوا نیوەی سەروەت و سامانەکەم پێشکەشی ئەو هەژارە کرد پێغەمبەر (ﷺ) بە هەژارەکەی فەرموو : بەندەی خودا تۆ ڕازی ئەو دیاری یە وەربگری کە ئەو کابرایە بەخشیویەتی بەتۆ، هەژارەکە لە وەڵامدا ووتی: نەخێر! ئەی پێغەمبەری خودا من وەری ناگرم : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ئەوە دیاری یە بۆتۆ بۆ وەری ناگری .؟ هەژارەکە ووتی: دەترسم وەری بگرم دەوڵەمەند ببم و هەوا بەسەر بەندە هەژارەکانی خودادا بکەم .!

## ﴿ ڕەوشتی پاك و بەرز﴾

## ( مكارم الأ خلاق)

دەگێڕنەوە: کابرایەك لە هۆزی یەمامە : بەناوی (سەمامەی کوڕی ئاسال) خۆی ئامادە کردو بەچەکی کوشندەوە، بە بیرو باوەڕی پوچ و خەراپ، بەرەو شاری مەدینەی پێغەمبەری خوداﷺ کەوتەڕێ : بە نیازی لە ناوبردن و کوشتنی پێغەمبەریﷺ ئازادی خوازی مرۆڤایەتی، بەو قین و بیرە نالەبارە گەیشتە شاری مەدینەو، مزگەوتی پێغەمبەری خودا ﷺحەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ کە بەڕاستی پیاوێکی لێ هات و زیرەك و چاونەترس و بەسام و هەیبەت بوو، کە چاوی بەو کابرایە کەوت، تێی گەیشت کە بەدوا ئیشێکی سەخت و پڕ مەترسی دا دەگەڕێ؟. بۆیە بانگی کردو پرسیاری لێ کرد .؟ کابرا دەزانم ئەتۆ بێ باوەڕی و،هاوبەش بۆخودا بڕیاردەری بۆچی هاتویە مەدینەو، مزگەوتی پێغەمبەری خودا .؟ کابراش بەبێ ترس و دوو دڵی ووتی: ئەی عومەر بەڕاستی من بۆیە هاتووم محمد بکوژم .حەزرەتی عومەر(ﷺ) کە ئەو وتەی لە کابرا بیست! هەر خێرا بێ دوو دڵی کابرای گرت و، شیرەکەی لێ ستاندو بە

جلەکانی خۆی پێچایەوەو لولی داو بە کۆڵەگەی مزگەوتی بەستەوە: بۆ خۆشی بەرەو ماڵی پێغەمبەر (ﷺ)کەوتەڕێ بەسەر هاتەکەی بۆپێغەمبەرﷺ گێڕایەوە, کە کابرایەك بەو شێوەیە هاتووەو بیری کوشتنی پێغەمبەری لە مێشك دایە ! پێغەمبەر (ﷺ) دەی توانی تەنها بە ووشە یەك بفەرموێ : ئەی عومەر بڕۆ ملی بپەڕێنن و کۆتایی بەو کابرایە بهێنن, بەلاَم نەخشەی پێغەمبەرایەتی زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ نەخشەی ئادەمیزادە چاو بەستراوە بەدوا کەوتووەکان :بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)لە ماڵەوە هاتە دەرەوە بەرەو مزگەوت ڕێگەی گرتە بەر, بۆ ئەوەی ئەو پیاوە داخ لە دڵەی ببینێ کە دەیەوێ پێغەمبەری خودا بکوژێت ! پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مزگەوت کە سەیری کرد کابرا لە جلەکانیەوە لول دراوەو لە کۆڵەگەیەك بەستراوەتەوە : حەزرەتی عومەرﷺ لەلای ڕاوەستاوەو شیرەکەی بەڕووتی بەدەستی یەوەیە، چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کوشتنی دەربکات و ئەویش خێرا بەچاو نوقانێك بیکوژێ و لەبەر چاوان نەمێنێ، بەلاَم پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەیری کۆمەڵە یارەکانی کردو فەرمووی: برایان خواردنتان بۆ ئامادە کردووە .؟

حەزرەتی عومەر)(ﷺ) کە گوێی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر بوو: خەریك بوو لەبەر قین وتوڕەیی وەلاَمی بۆ نەدرێتەوە: چونکە ئەو چاوەڕوانی نەمانی کابرای دەکرد، بۆیە بەسەر سوڕمانێکەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺچی خواردنێك دەخوات و ئارەزووی لە چیە .؟ ئەو پیاوەی کە بۆ کوشتنی تۆ ڕێگای هیلاك و ماندوو بوونی بڕیوە, نەك بۆ چاکەو موسڵمان بوون! پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: بڕۆن لە ماڵی ئێمە شیری بۆ بهێنن, لە دوای ماوەیەك کە حەیوان دۆشراو شیریان هێنا،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەست و قاچی بکەنەوە حەزرەتی عومەریشﷺ لەبەرقین و تەوژمی توڕەیی وەك ولەسەر پشکۆی ئاگر ڕاوەستابێ وەهابوو,لەدوای خواردنەوەی شیرەکە, پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەنەرمییەوە بەو کابرایەی فەرموو: ئەی برام بڵێ: ( ا شهد ان لاإلـه إلا الله)

## دۆستی باوەڕداران

:؟!!! کابرا بێ باوەڕە کە ووتی: شتی وەها نالْێم؟! دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڵێ ( اشهد ان لاإله إلا الله واشهد أن محمدا رسول الله).؟!!

کابرای بێ باوەڕ ووتی: بە هیچ جۆرێ شتی وا نالْێم و موسڵمان نابم،بەو شێوەیە لە دوای ئەوەی پێغەمبەرﷺ دڵنیا بوو لەوەی کە ئەو کابرایە، ئاینی باوك و باپیری خۆی واز لێ ناهێنێ, فەرمانی بەردانی دەرکردو،خێرا فەرمانەکەیان بەجێ هێنا, کابرایان بەرداو بەرەو نیشتیمانەکەی گەڕایەوە، لەدوای ڕۆیشتنێکی کەم, کە هێشتالەمزگەوت دورنەکەوتبۆوەولەبەرچاو ون نەبو بوو گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەرو ووتی: ( اشهد ان لااله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) ئیمانی هێناو مومسڵمان بوو, پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ کردو فەرمووی: ئەدی بۆکەمن داوام لێ کردی موسڵمان ببە : تۆ سەر پێچیت کردو دانت بە ڕاستی دا نەهێناو موسڵمان نەبووی, هۆی چی بوو ؟, وەلەبەر چی ڕۆیشتیو دورکەوتیەوە, ئینجاگەڕایەوەو موسڵمان بوی .؟ کابرا ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوکاتە من لەژێر دەستی ئێوەدا دیل بووم: لەوە دەترسام کە باوەرم بهێنابایە, ئەوکاتە دەیان ووت :لە ترسان با وەڕی هێنا، بۆیە سەرپێچیم کرد: وەلەدوای ئەوەی کەئازاد تان کردم و سەربەست بوم، بەبێ دوو دڵی لەبەر ڕەزامەندی خودای گەورە باوەڕم هێنا، لەدوای باوەڕ ئەو کابرایە ووتی: بەڕا ستی ئەوکاتەی کە هاتمە ناوشاری مەدینە هیچ کەسێکم بە ئەندازەی محمد ڕق لێ نەدەبۆوە : وە ئەو کاتەش کە شاری مەدینەم بەجێ هێشت هیچ کەسێکم بەدڵ لەسەر ڕووی زەوی هێندەی محمد خۆش نە دەویست !!!

# ﴿ پێشەنگ و ڕابەری جوان ﴾

## ( قدوة حسنة)

دەگێرنـەوە: ڕۆژێـك لـەكاتی تـین و تـەوژمی گـەرمای نیـوەڕۆدا پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) لـە تـاوی ئـازاری برسـیایەتی، كـە لەماڵـەوەیان هیـچیان نـەبوو هاتەدرەوە، لەو كاتەدا چاوی بەحەزرەتی ابوبكر(ﷺ) كەوت لێی پرسی, ئەی ابوبكر هۆی چییە لەوكاتـەدا هاتویە دەرەوە ؟ حەزرەتی ابوبكر(ﷺ) لەوەڵامـدا فـەرمووی: چیت لی بشارمەوە ئـەی پێغەمبـەری خـودا بەڕاسـتی لەبـەر ئـازاری برسیایەتی هاتومەتـە دەرەوە, ئەوجا هـەردوكیان بەجوتـە دەڕۆیشتن لـە پرێكدا چـاویان بەحـەزرەتی عومـەر(ﷺ)كـەوت پێغەمبـەر(ﷺ) ڕوی كـردە حـەزرەتی عومەرو فەرمووی: ئەی عومەر لەبەرچی لـەوكاتی تـەوژمی گەرمییەدا لەماڵەوە هاتویـە دەرێ ؟ حـەزرەتی عومـەر(ﷺ) لەوەڵامـدا فـەرمووی: سوێند بـەخودا ئـەی نێـردراوی خـودا مـن لەبـەر برسـیایەتی و ئـازاری زگـم هاتومەتـە دەر؟ ئـەوجا حەزرەتی ابوبكرو حەزرەتی عومەر ڕووی پرسیاریان كردە پێغەمبـەری خوداو وتیـان: ئـەی نێر دراوی خـودا ئـەوا ئێمـە لـە ئازارو تینـی برسیایەتی هاتوینـە دەرێ لەماڵەوە، ئەدی ئەتۆ بۆچی هاتویە دەرێ .؟ پێغەمبـەریش ( ﷺ)فەرمووی: سـوێند بـەو كەسـەی كـە گیـانی منـی بەدەسـتە ئـەوەی كـەئێوەی لەماڵـەوە دەركردۆتـە دەرێ هەرئـەوەش منـی دەرپەڕانـدووە لەماڵـەوە ئینجـا هەرسـێكیان بەكۆمـەڵ ڕۆیـشتن بـۆ مـاڵی ئـەبو ئـە یـوبی ئەنـساری (ﷺ) لـەوێ نـان و ئاویـان خـوارد، لـەدوای نـان و ئـاو خواردنـەوە حـەزرەتی محمـدیش (ﷺ) قاپێـك ئـاوی بەرزكردەوە بۆ خواردنەوە فەرمووی﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ التكاثر/٨.

واتە: سوێند بە خودا پرسیارتان لێ دەكرێ لەرۆژی دوایـی دا لـەو نیعمە تانـەی كە پێتان دراوەو ئێوە پێیان نازانن !.

## ﴿ پێشەنگو ڕابەری خێرومەندوو چاك ﴾

### (قدوة صالحة)

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێك لەیارەکانیدا دەرۆن بۆ گەشت و گوزار بۆهەوای ساف هەڵمژین، مەڕێکیان پێ بوو بۆ سەر بڕین : یەکێك لە هاوڕێکانی ووتی: من مەڕەکە سەردەبڕم, یەکێ تریان ووتی : منیش کەوڵی دەکەم, یەکی کەشیان ووتی: منیش دەی کوڵێنم, پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: منیش دارو چیلکە کۆدەکەمەوە, هاوڕێ کانی هەموویان وتیان : ئەی پێغەمبەری خودا نامانەوێ تۆ خۆت ماندو بکەی، ئێمە بەخۆشیەوە ئیشەکەی تۆش دەکەین, پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: سوێند بەخودا من دانانیشمو ئێوەش کار بکەن ؟ چونکە خودای گەورە ئەو بەندەیەی خۆش ناوێ کەخۆی لەهاوەڵەکانی جودا دەکاتەوە، تەشریفی موبارەکی ڕۆیشت و داری کۆ کردەوە .

## ﴿ ژیری و شکۆمەندی و لە سەرەخۆیی ﴾

### (حكمة ووقار)

ڕۆژێك گەنجێکی جوانی تازە پێگەیشتو دەچێ بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) کەلەو کاتەدا پێغەمبەر لەناو هاوەڵەکانی دا نیشتبو, گەنجەکە ڕو لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکاو بە دەنگێکی بەرز،زۆر بێ شەرمانە ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێگەم بدە بچم داوێن پیسی (زینا) بکەم؟! چونکە بەڕاستی زۆرم ئارەزو لێ یە.؟
یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانەی لەخزمەتی دانیشتبون: زۆربە توندی ڕاست بونەوەو ڕویان لە گەنجەکە کردو سەرزەنشتیان کرد : بەلام لەبەرقین وتوڕەیی نەیان دەزانی چی دەڵێن و چی دەکەن،تەنها پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەڕەو شتێکی ئارام ونەرمو لە سەرەخۆوە، بەووتەیەکی شیرین و جوان، هیچ خۆی نە

# حۆستی باوەڕداران

شێواند تیشکی زێڕینی ئارامی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو تیشکی مانگ پەخشان دەبوو دە درە وشایەوە لە پێشی هەموو شتێك، داوای لە یارەکانی کرد کە بەئارام‌وله سەرەخۆبن, لەدوایی دا ڕوی لە گەنجەکە کردو فەرمووی : وەرە لەلام دانیشە، گەنجەکە لەلای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت،پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پیرۆزی هاویشتە سەر ملی گەنجەکەو فەرمووی: چیت دەویٚ ئەی تازە پێگەیشتو پێم بڵێ .؟

گەنجەکە ووتی:دەمەویٚ ڕێگەم بدەی بچم داوین پیسی(زینا)بکەم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ .؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی : ئەی گەنج تۆ پێت خۆشە کەسێك داوین پیسی لەگەڵ دایکت دا بکات .؟!

گەنجەکە ووتی: ناوەالله، ئەی پێغەمبەری خوداﷺ گیانم بە فیدات بیٚ پێم خۆش نیەو, زۆریشم پیٚ ناخۆشە, دوو بارە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی پێت خۆشە کەسێك داوێن پیسی لە گەڵ خوشکت دا بکات .؟ یان لەگەڵ پورت دابکات .؟ یان لەگەڵ خزمێکی نزیکت دا بکات .؟ ئەوجا گەنجەکە هەستی کرد بەگەورەیی خەراپەی ئەو گوناهە، وە داوای شتێکی زۆر ناشرینی لە پێغەمبەری خوداﷺ کردووە،پەشیمان بوٚوە, ڕۆیشتە بەردەمی پێغەمبەرﷺ ووتی: ئەی ڕەسولی خودا پەشیمانم داوای لیٚ بوردنم بۆ بکە لە خوای مهرەبان،پێغەمبەر(ﷺ) سیٚ داوای لیٚ بوردنی لە خودا بۆ گەنجەکە کرد, فەرمووی: (اللهم حصن فرجە، وطهر قلبە, واغفر ذنبە) واتە: ئەی خودایە، داوێنی بپارێزە، دڵی پاك بکەوە و, لە گوناهی خۆش بە, لە دوایی دا گەنجەکە ووتی : ئەو کاتەی کە لە لای پێغەمبەرﷺ ڕویشتم هیچ کەسێکم بەئەندازەی پێغەمبەری خودا ﷺخۆش نەدەویست لەسەر ڕوی زەوی, وە بەو شێوەیە ئەو گەنجە بەو فەرموودە پرماناو لەسەرخۆیانەی پێغەمبەرﷺ دڵی سارێژ بوو، وە ئەو کردەوە ناشیرینەی لیٚ بوو بەتاوانێکی زۆر گەورەو لەبەر چاوی کەوت .

## ﴿ لێبوردن وچاوپۆشیو ڕەفتارو ڕەوشت﴾
### (سماحة وأخلاق)

دەگێڕنــەوە ڕۆژێــك پێغەمبــەری خــودا(ﷺ) لــەناویارە شــیرینەکانی دانیشتبوولە ناکاو کابرایەك، لەگەورە پیاوانی گاور، بەناوی (زەیدی کوری سەعنە) هاتەناو کۆڕی یارەکان،بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین بەناو یارەکانداتێ پــەڕی تاگەیــشتە لای پێغەمبــەر(ﷺ) زۆر بەتونــدی بــەرۆکی گــرت و، ڕای وەشاندو، بەتوڕەیی یەوە ووتی: ئەی محمد بەڕاستی ئێوە بەرەی هاشمن زۆر وام (قەرز) کوێرن و زۆر بەدرەنگەوە دەی دەنەوە خاوەنەکەی، ئەتۆ بۆ قەرزەکەم نادەیەوە ؟ بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) قەرزی لەوکابرا گاورە کردبوو, بەڵام هێشتا وادەی دانەوەی قەرزکەی نەهاتبوو، لەوکاتەدا حەزرەتی عومەر(ﷺ) شیری ڕاکێشابوو زۆر بەرقو توڕەییەوە دەی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا فەرمان بدە باسەری ئەوگاورە بپەڕێنم: پێغەمبەری ڕۆشەن کەرەوەی جیهان فەرمووی : ئەی عومەر لەسەر خۆبە: ئێمە بۆ ئەوە بانگ نەکراوین، هەرچی بوولەسەری بدەین : تۆ لەسەرت پێویستە بەشێوەیەکی زۆر جوان فەرمان بدەی، بەو کابرایە بڵێی ؟ برام بەشێوەیەکی جوان داوای قەرزەکەت بکەوە، وە داوا لەمنیش بکەی بەچاکیوپاکی قەرزەکەی بدەمەوە: ئەوجا کابرای گاور: کەڕەوشتی ئارام و لەسەر خۆیی پێغەمبەری چاو پێکەوت، بەرۆکی پێغەمبەری بەرداو زۆر بەئەدەب وشەرمەوە لەبەردەمی پێغەمبەر ڕاوەستا ووتی: سوێند بەوکەسەی کەتۆی بەڕاست ناردووە من بۆیە نەهاتوم کەداوای قەرزەکەم بکەم، چونکە دەزانم کە هێشتا کاتی دانەوەی قەرزەکەم نەهاتووە، تەنها من چاوم بەڕەوشتەکانت کەوتووەو, لەتەوراتیشدا خوێندومەتەوە کەبەڕاستی هەموو ڕەوشتەکانت زۆر جوان و پەسندن، تەنها ئەو ڕەوشتەتم بەتاقی نەکردبۆوە کە ئارام و لەسەرە خۆیی یە، وائەویشم بۆ دەرکەوت کەبەڕاستی زۆر بەئارام و

لەسەر خۆی، وەکردەوەی نەزانی و ڕەش بینی لەلای تۆ ئارامی و لە سەرە خۆیی پێ زیاد دەبێ: بەڕاستی هەموو شتێکم بۆ دەرکەوت ئینجا ووتی ( اشهد ان لا الـه الا الله واشهد ان محمدا رسول الله.) وابە بەرەکەتی ئارامی و لەسەر خۆیت موسڵمان بووم و،باوەڕم بەخودای گەورەو پێغەمبەرێتی تۆ هێنا, وە ئەو قەرزەی کە لەسەرتۆمە بەهۆی کردەوەی چاکەت و ڕەوشتی پاکەت لەپێناوی پیرۆزی ئیسلامدا کردمە خێرو بەخشیش بۆ هەژارو نەدارانی موسڵمانان .

## ﴿ لەگەڵ سەرکردەی داد پەروەرو ئازایەتی کۆمەلآیەتی ﴾

## (مع رائد العدالة الإجتماعية )

ڕۆژێک حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خودای لێبێ) هاتە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری إسلام زۆر حەزدەکەم کەلەلای خێزانەکانتدا بەئاشکرا دەری بڕی و پێیان بڵێی کەمن لەلای تۆ لەهەموو هاوسەرەکانت خۆشەویستترم

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: زۆر باشە وا دەڵێم! ئە تۆ جارێ ئەو درهەمە بگرە : دوایی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر هەموو هاوسەرەکانیدا گەڕاو, بە نهێنیە وە هەریەکەی درهەمێکی پێدان :

ئەمجار هاتەوە بۆلای عائیشەو فەرمووی: ئەی عائیشە بڕۆ هەموو هاوسەرەکانم بانگ بکە بۆ ئێرە، بۆ ئەوەی پێتان بڵێم کە کامەتانم لە هەمووان خۆشتر دەوێ ؟. کاتێک هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەموویان کۆبوونەوە، حەزرەتی عائیشە زۆر بەخۆش حاڵییەوە فەرمووی : ئەی ڕەسولی خودا بۆمان روون بکەوە کامە هاوسەرەت لە هەمووان خۆشتر دەوێت :

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خودای لێبێت) بۆیە وای فەرموو: چونکە وای هەست دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) بفەرموێ: ئەی عائیشە تۆ لە هەمووان خۆشەویستری،

بەلأم ڕەوشت و ئاكاری پێغەمبەر جیاوازییەكی زۆری هەیە لەگەڵ ڕەوشتی ئادەمیزادەكان : بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە گوفتارو فەرمووی: ئەی هاوسەرەكانم باش بزانن ئەوەی درهەمم داوەتێ لە هەموویانم خۆشتر دەوێ ؟ بادەست بەرز بكات ؟!! ئینجا لەو كاتەدا هەموو خێزانو هاوسەرەكانی هەریەك لەبەر خۆیەوە زۆركەیف خۆش بوو وای دەزانی كەبەتەنها ئەودرهەمەی دراوەتێ بۆیە بەخۆشیەوە دەستی بەرز دەكرد كاتێ سەریان هەڵبڕی سەیردەكەن چی دەبینن بەجارێك هەموو هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ دەستیان بەرزكردۆتەوە .

## ﴿ ئـاسودە دەبێ یان ئاسودە دەبن ﴾

## (مستریح ومستراح)

ڕۆژێك جەنازەیەك بەلای پێغەمبەردا ڕابورد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئینسان كە مرد یان بۆ خۆی ئاسودە دەبێ: یان بەنەمانی ئاسودە دەبن: یارەكانی پێغەمبەر فەرموویان : ئەوە مانای چیە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ؟ دە فەرمووی: خۆی ئاسودە دەبێ, یان بەنەمانی ئاسودە دەبن : پێغەمبەر ﷺلە وەلأمدا فەرمووی: ئادەمیزادی موسڵمان كە دەمرێ لە ناڕەحەتی دونیا ئاسودەو ڕزگاری دەبێ دەچێتە بارەگای مهرەبانی خودا،وە ئادەمیزادی بێ بڕو باوەڕ بە مردنو نەمانی،كۆمەڵانی خەڵكو نیشتمانوداروبەرد لەبەری ئاسودە دەبنو دەحەسێنەوە .

## ﴿ زانیاری وەرگرتن لە پێغەمبەری خوا( ﷺ )﴾

### (أقباس من النبوة)

دەگێڕنــەوە پادشــای ئیمپراتۆریــەتی (کــسرا)، نێردراوێکــی نــارد بۆکــار بەدەستــەکانی یەمــەن ووتــی:ئاگــادارم کــە ئینــسانێکی عــەرەب نــاوی (محمــدە )داوای پێغەمبەرایەتی دەکات، ئینجا ئەو ناوە( محمــد )ەم بە زووترین کات بە زیندو, یان, بە مردو, بۆمی بنێرن: لێپرسراوی شاری یەمەن بەبێ دواکەوتن بە فــەرمانی ئیمپراتۆرەکــەی دوو کەســی نــارد بــۆلای پێغەمبــەری خــودا ﷺ: کــە گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺچۆنیەتی هاتنەکەیانی بۆپێغەمبەرﷺ باس کرد : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :ئێستا بڕۆن بەیانی وەرنەوە، بۆ بەیانی کە دوو نێردراوەکە هاتنــەوە بۆلای پێغەمبــەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی : بــەڕێزان ئێــوە بڕۆنــەوە مــن نایەم،چــونکە ئــەم شــەو کوڕەکــەی (کیــسرا) بــاوکی خــۆی کوشتووە ؟.

## ﴿ دەم و زوبانی پاک﴾

### (الفم الشريف )

دەگێڕنــەوە ڕۆژێــك یــەکێك لــە یارەکــانی پێغەمبــەر(ﷺ) بــەناوی (عبــدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عباس)(ﷺ)پرسیارێکی لە پێغەمبــەرﷺ کردو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من بەسەرهاتو فەرمایشتو ڕوداوەکانی تۆ دەنوسم، هەرچــیەکی بیکەیوبفــەرمووی، ئینجــا ئــەی پێغەمبــەری خــودا ﷺ ئــەتۆش ئادەمیزادێکی وەك وئێمە لە هێنـدێك کات دا تـوڕە دەبیو لـە هێنـدێك کاتیشدا بــە ئــارامو هێمنــی, لــەو کاتانــەی کــە تــوڕە دەبیــتو ڕقــت هەڵدەســتێ, فەرماشـیتەکانت بنوسـم یـان نـا.؟ پێغەمبـەر (ﷺ)لـە وەڵامـدا فـەرمووی: ئـەی عبدالله هەرچی لە دەمم دەرچو بینوسەو کەم تەرخەم مەبەو وازی لێمەهێنەو تـــەرکی مەکە،ســـوێند بەوکەســـەی کـــەگیانی منـــی بەدەستە،هەرچـــی ڕاستوڕەوانەبێ لەودەمەی من دەر ناچێ !!.

## ﴿ کیژۆڵەو کچێکی موسڵمان ﴾

(الفتاة المسلمة)

دەگێڕنەوە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کیژۆڵەیەکی گاور بەبیرو بڕوایەکی بەهێزەوە موسڵمان دەبێت: وە بەو بیرو بڕوایەوە لەسەر ڕێگا ڕۆشنە سەربەرزەکەی ئیسلام کۆچی دوایی دەکات‌و ئەسپەردەی خاک دەکرێت، لەدوای ئەسپەردەی خاك، دایك‌وباوکی ئەو کیژۆڵە موسڵمانە دێنە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ دەڵێن: ئەی (محمد) ئێمە دەمانەوێ بزانین کچەکەمان لە بەهەشتێیە, یان لە دۆزەخ دایە؟ پێغەمبەری إسلام (ﷺ) بۆ تێگەیاندنی ئەودایك‌و باوکە گاورە، بەرامبەر بەکیژە بڕوا دارەکەیان, ڕاستە ڕێگەیان گرتە بەرو بەرەو گۆڕستان کەوتنەڕێ! پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتە سەر گۆڕەکەی و لە خودا پاڕایەوە کە لە چۆنیەتی ئەوکیژۆڵە ئاگاداریان بکات, پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئەی کچی فلان وەڵامم بدەوە ؟ کچەکە لە ناو گۆڕەکەیدا ووتی: وائامادەو لە خزمەت دام ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بفەرموو؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی کچی بڕوادار واباوکت لێرە ئامادەیەو وەڵامی بدەوە چیت لێ پرسیار دەکات .؟

کچەکە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لێم ببورە چونکە باوکم بێ باوەڕە وەڵامی نادەمەوە ؟. دووبارە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی کچی بڕوادار لەبەرچی وەڵامی نادەیەوە ئەوە باوکتەو چاکەی زۆر لە گەڵدا کردوی کچەکە لە وەڵامی پێغەمبەرداﷺ ووتی : ئەی ڕەهبەری نازدار بەڕاستی خودای گەورە زۆر زیاتر لە باوك‌ودایکم دڵ سۆزی بۆ نواندم و مهرەبانی لەگەڵم دا بەکار هێناوە پاداشت و چاکەی زۆری داومەوە کەلەژمارە نایات، کاتێك ئەو باوك ودایکە گاورە گوێیان لە ووتەی کچە کەیان بوو, هەردووکیان، بەجارێك ووتیان:

( اشهد أن لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله )
ئەی محمد بەڕاستی خودای گەورە تۆی بەڕاست ناردووە: وە ڕێبازەکەت ڕێبازێکی ڕاستەو، دوورە لە هەڵەوناڕێکی، وەمزگێنی هێنەری بۆ ئەوانەی ڕێبازی اسلام بەڕاستی وەردەگرن : وەترس هێنەریشی بۆ ئەوانەی کە لە ڕێبازی ڕاستی اسلام خۆیان گێل و کەڕ دەکەن: بەوجۆرە ئەو باوك و دایکەش ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلامیان کردە ڕێبازی ڕزگاربونی خۆیان .

## ﴿ بەیەك هاتنەوەی گۆڕ ﴾

## (ضمة القبر)

ئەگێڕنەوە( فاتمەی کچی ئەسەد) خێزانی (ئەبو تالیب )و دایکی حەزرتی علی، بە بیرو باوەڕێکی پاکەوە باوەڕی بە اسلام هێناو ڕێبازی اسلامی بەجوانی وەرگرت: وەلەهەمان کاتیش دا پێغەمبەری خوداﷺی زۆر خۆش دەویست و ڕێزی زۆری بۆ دادەناو, بە دڵ خزمەتی دەکرد بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) ئاواتی ئەوە بوو نەختێك پاداشتی ئەو کردەوە باشانەی بداتەوە، هەروەك و (حافیزی باوکی نەعیم) دەگێڕێتەوە، کاتێ (فاتمەی کچی ئەسەد) کۆچی دوایی کرد, لەدوای ئەوەی کە گۆڕیان بۆ هەڵکەند، پێشی ئەوەی بیخەنە ناوگۆڕەوە پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) لە دەوری تابوتەکەی دەهات و دەچوو دەستی بەسەر تەرمەکەدا دەهێنا، دوای ڕۆیشتە ناو گۆڕەکەوەو, کراسەکەی داناو لەناو گۆڕەکەیدا ڕاخستو، تۆزێك درێژ بوو، ئینجا هاتە دەرەوەو, تەرمی فاتمەیان ئەسپەردەی خاك کرد،یارەکانی پێغەمبەرﷺ فەرموویان: یارسول الله(ﷺ) لەبەرچی ئاوات کرد پێغەمبەر(ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: بۆ ئەوەی ئاگری دۆزەخ تینی بۆ نەهێنێ ! وە بۆ ئەوە خودای گەورە بەمهرەبانی و پیرۆزی خۆی گۆڕەکەی بۆ فراوان بکات

لەدوایی فەرمووی: سوێند بەخودا کەس لەبەیەك هاتنەوەی گوڕ ڕزگاری نەبووە: تەنها (فاتمەی کچی ئەسعد )نەبێ،وە بەڕاستی فاتمە لەناو باخ و باخاتی بەهەشتێ لە جێگەی ڕەزامەندی پادشای خاوەن دەسەلآت دا نوستووە .( ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ{٥٤} فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ{٥٥}﴾القمر/٥٤-٥٥

## ﴿پرسیاری گۆڕ﴾

## (سؤال القبر)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك حەزرەتی (ابراهیمی کوڕی پێغەمبەر) (ﷺ) نەخۆش کەوتبو لەباوەشی ماریەی دایکی شیری دا درێژ ببوو، تەمەنی لە شانزە مانگانە دابوو، نەخۆشیەکی بەتینی هەبوو، چاوەڕوانی نەمانی لێدەکراو،مردن باڵی ڕەشی بەسەر داهێنابوو، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوکاتەی لەلای کۆرپەکەی دانیشتبو چاوی لە چاوی ابراهیم بڕی بوو: دڵی وەك و ئاگر گری گرتبوو دەیفەرموو: ئە ی ابراهیم کۆرپەی تاقانەو خۆشەویستم بەڕاستی من خاوەنی هیچ شتێك نیم لەلای خودا هەتا بۆتی داوابکەم پێغەمبەر (ﷺ) لەو جۆرە فەرمایشتانە دابوو کۆرپە تاقانەکەی گیانی بەخاك سپاردو کۆچی دوایی کردو پێغەمبەری (ﷺ) بەبێ کوڕی بۆ هەتا هەتایە بەجێ هێشت .ئەوباوکە بە مهرەبان و بەوەفایە:کۆرپە ساوابێ نازەکەی لەباوەش گرت و،بردیانە گۆڕستان ولەژێر خاکدا شاردیانەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر گۆڕەکەی ڕاوەستاو فەرمووی: ئەی ابراهیم کە فریشتەی خودا هاتنە لات بڵێ خودای من (الله) یە ؟. بڵێ پێغەمبەری خودا ﷺباوکمە ؟. وەدینی سەربەرزی ئیسلام ڕێبازو ڕەوشت و ئاینمە: پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیە تەڵقینی کوڕە دونیا نەدیتوەکەی ئەدا، پێغەمبەرﷺ گوێی لە دەنگێك بوو کە ئاوڕی دواوەی دایەوە:

## دۆستی باوەڕداران

سە یری کرد حەزرەتی عومەر ﷺ ڕاوەستاوەو بە دڵێکی بە کوڵ و هەناسەیەکی سارد: هەنیسكو قوڵپی گریانی پیاو شێت دەکات،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : یاعومەر مەگریە؟ بۆچی دەگریەی ؟!

حەزرەتی عومەر (ﷺ) لەوەڵامدا ووتی: ئەی ڕەسوڵی خودا کوڕیە تاقانەکەت منداڵەو تەکلیفی دینی لەسەر نیە ؟ تۆش تەڵقینی ئەدەی ! ئەدی ئەمن چیبکەم لەڕۆژی دوایی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەورە بووم و هەموو پێویستیەکی شەرعیم لەسەر پێو یست کراوە و؟

لەکاتی مردنیشم یەکێکی وەکو تۆم بەدە ست ناکەوێ تەلقینم بدا !! ئەو کاتە چی بکەم و هاوار بە حاڵم، ئینجا خودای گەورە : بۆ دڵ نەوازی و وەڵامی پرسیارەکەی حەزرەتی عەمەر ﷺئەو ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ:

﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ﴾ ابراهيم/٢٧.

واتە :خودای گەورە ئەو کەسانەی کە بیرو باوەڕیان هێناوە بە تەواوی بەدینی سەربەرزی ئیسلام، قەرار گرتوو دامەزراویان دەکات بەهۆی گوتن گووتە بێژیان بەکردەوەی باش لەو دونیاو, لە دواڕۆژیشدا دایان دەمەزرێنێ، وەهەر وەها زۆردارو ستەمکارانیش گومڕا دەکات بەتەواوی بە گووتەی بێ جێگەو ڕێگە لە هەردوك دونیادا وەخودا خواستی لە هەرچیبێ دە یکات .

## ﴿ پیاوی بڕوادار لەکاتی مردنیدا﴾

(رجال عندالموت)

دەگێڕنـەوە هـاوەڵی بـەڕێزی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)( بـلالی کـوڕی ڕەبـاحی) حەبەشی(ﷺ)نەخۆشـیەکی پڕ مەترسـی تـوش بـوو هیـوای ژیـانی لێ نـەدەکرا : هاوسەرەکەی کەچاوی پـێ کـەوت هـاواری کـردو گـووتی: ئای لەوموسیبە تـەی بەسـەرم دابـاریوە !! هـاوار بـۆبێ کەسـی خـۆم؟ لـەدوای ماوەیـەك بـلال لـە نەخۆشیەکەی چاك بۆوەو هۆشی هاتـەوە بـەرخۆی بەهاوسـەرەکەی گـووت : مـن لەو هاوارو شینەی تۆ بێ بەریم و پەیوەنـدیم بەسـەرەوە نیـە ؟ ئەگـەر مـردم هـیچ هاوارو شینم بۆ مەکە، لـەباتی شین و زاری شـادی دەربـڕە و شـوکرو سوپاسـی خودا بکە و، بڵێ خودایە زۆر ڕازیم و کەیف خۆشم بەوەی کەبلال مردو ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەرە خۆشەو یستەکەی و، هاوەڵە بەڕێزو پیرۆزەکانی .

## ﴿سەردانی ماڵ ئاوایی﴾

( زیارة الوداع)

دەگێڕنەوە کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) موعەلیمی دونیـای هەسـتی،نەخۆش کەوت،نەخۆشـی دوا تەمـەنی، لەسـەر جێگـا کـەوتبوو, کۆمـەڵێك لـەیارەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) هاتنـە خزمـەتی بۆهـەواڵ پرسینی: بـەڵام دیدەن وسـەردانی مـاڵ ئاوایی بوو،لـەناو یارەکانیـشی دا (عبداللـەی کـوڕی مەسـعود(ﷺ)) یـان لەگـەڵ دابوو پێغەمبەر(ﷺ) چاوی هەڵێنا بەخێر هاتنێکی باشی لێ کردن و فەرمووی: خـودا پایـەدارتان بکـاتو پاداشـتان بداتـەوە، فـەرو پـیرۆزی لـە دڵتانـدا بـچە سپێنی و بەهێزو قوەت و پـارێزراو بن، وەخـودا فەرمانی بە منـیش و ئێـوەش کـردوە کـەخۆ پـارێزین و، بەندایـەتی بـۆ خـودا بکـەین و خۆمـان فـەرز نەکـەین

بەسەر ئادەمیزادەکانداو, لە ولاّت و نیشتمانیشدا بەفیزو لە خۆبایی نەبین ؟ وەخودای گەورە بەرامبەر بە هەموومان بەبێ فەرق و جیاوازی و خۆهەڵکێشان فەرموویەتی: ﴿ تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾القصص/٨٣ –

واتە: ئەو خانوماڵەی ڕۆژی دوایی کە شوێنی خۆشیو کەیفو سەمایە و, جێگەی مانەوەی هەتا هەتایەیە و، خەم و ئازار ڕووی تێ ناکا، دەی بەخشێ بەو کەسانەی کە نایانەوێ بەناڕەوا خۆیان لەسەر کۆمەڵانی خەڵك بە فەڕزو گەورە بزانن و, ستەمو زۆریان ناوێ بۆ کۆمەڵانی خەڵك، وە لەسەر پەیمان و بەڵێن دەژیەنو سەر شۆڕیو نامەردی قبوڵ ناکەن، وە بەڕاستی دوا ڕۆژی باش و بەختەوەر بۆ ئەوانە یە، کە خۆیان لە تاوان باری دەپارێزن هەتا بە ئاواتی خۆیان دەگەن, لەدوایی دا ئەو وتو وێژەی خوارەوە لە بەینی پێغەمبەری خواﷺ (عبداللەی کوڕی مەسعود ﷺ) ڕوی دا:

عبدالله : ئەی ڕەسوڵی خودا کەی مردن بەرەنگارت دەبێ ؟

پێغەمبەرﷺ: ئەی کوڕی مەسعود کۆچی دوایم نزیك بۆ تەوە شەربەتی مردنم هاتۆتە پێش .

عبدالله: لەدوای مرد نت کێ دەت شوات ئەی ڕەسوڵی خودا ﷺ ؟

پێغەمبەرﷺ: کومەڵێك لەئەهل و بە یتم ئەوانەی کە زۆرم لێ نزیکن، لەگەڵ کومەڵێك لە فریشتەکانی خودا : کە ئێوە ئەوان نابینن، بەلاّم ئەوان ئێوە دەبینن.

عبدالله: ئەی خەلاّ تت لەچی بۆ بکە ین ؟

پێغەمبەرﷺ: لە پەرۆزە یەکی قوماشی سپی .

عبدالله: ئەدی کێ نوێژت لەسەر دەکات ؟

پێغەمبەرﷺ: کە شۆرام و خەلاّتم بۆ کرا لەسەر ڕۆخ وکەناری گۆڕەکەم دام

بنێن و، ماوەیەك لێم گەڕێن بەتەنهابم : یەکەم کەس کە نوێژم لەسەر دەکات خودای پەروەردگارە !! لەدوای ئەو حەزرەتی جبرائیل و میکائیلە، لە دوای ئەوانیش حەزرەتی عزرائیلە، دوایی کۆمەڵێك لە فریشتەکانی خودا، لەدوای ئەوانەدا ئێوە تاك، تاك و، بەکۆمەڵ لەسەر لاشەکەم نوێژێ بکەن، وە داواشتان لێدەکەم ڕێزو سلاوم بەوانە بگەیەنن کە ئامادە نەبوون و، بەوانەش کە ووشەی (لا الە الا اللە) بەڕاستی دەڵێن و بەجێی دەگەیەنن، هەزاران سەلامی خودات لەسەربێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ .بەڕاستی ژیایت و بەڕاستیش مردی : هەزاری وەك من بە فیدای ڕێبازو ژیانت بێت .

مردن و، ماڵ ئاوایی،یەك جاری ڕووی ڕۆشەنی پێغەمبەری ﷺ لەوزەمینە داپۆشی، بەڵێ: بەو شێوەیە کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ خەریکی گیان کێشان بوو . تەنها حەزرەتی فاتمەی کچی لەلابوو، کەسەیری باوکی کرد واڕە نگی گۆڕاو تێك چوو، نەك بەتەنها باوکی فاتمە ، بەڵکو باوکی هەموو دانیشتوانی سەر ڕووی جیهان .ئاوی ساردی بەدەم و چاوی خۆی دا دەکردو لەبەر خودا دەپارایەوە دەی فەرموو : ئەی پەروەردگارم پاك و بێ گەردی بۆ تۆیە، نەختێك ئازاری مردنم لەسەر سوك بکە بەڕاستی ئازاری زۆر گرانە، لەو کاتەدا حەزرەتی فاتیمە فرمێسکی چاوی بەسەر گۆنادا دەهاتە خوارو دەی ووت:ئای لەبەر ئەوخەم و ئازارە زۆرەی کە کۆبۆتەوە لەسەرم بابەگیان ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی فاتیمە خەم و پەرۆشی لەم ڕۆ بەدواوە بۆ باوکت نەکەی ؟ چونکە باوکت بۆ خزمەت خودای گەورە دەڕوات .

بەو شێوە یە پێغەمبەری خودا ﷺ ماڵ ئاوایی یەکجاری لەو دونیا بێ وەفایە کردو ڕۆیشت بۆ خزمەتی خودای تاك و پاك و بێ وێنە .

## ﴿ جودا بوونەوە ﴾

### (فراق)

دەگێڕنـەوە: ڕۆژێـك حـەزرەتی (عومـەری كـوری خـەتاب ﷺ ) دەچـێ بـۆ زیـارەتی گـۆڕی پـیرۆزی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لـەنزیكی گۆڕەكەیـەوە ڕادەوەسـتیّو دەفـەرموێ : سـەلامی خـودات لەسـەر بـێ ئـەی نێـر دراوی ڕاستەقینەی خودا بەڕاستی هیچ كاتێك لەیادت ناكەم : كە بیری ڕابردوەكانت دەكەمەوە خەریكە گیانم لە لەشم دەربچێت ! بەڕاستی پێویستە لە دووری تۆ گیانمان تێدا نەمێنێ هەر لەیادمەو لەبیر ناچێتەوە، كاتێك موسڵمانان كەم بوون و، مزگەوتە كەشمان بچوك بوو، (مینبەر) دوانگەمان نەبوو، لەلای كوڵەكەیەكی دار خورما ووتارت دەخوێندەوە، بەلاّم كە موسڵمانان زۆر بوون مزگەوتەكەمان گەورە كرد مینبەرمان دروست كرد، كوڵەكەكەت بەجێ هێشت : گوێمـان لێ بـوو كوڵەكـەی بـێ ڕووح و گیـان، هـاواری دەكـردو دەی نالاّنـد، وەك‌و دایكـی كـۆس كەوتو, هەتا نەڕویشتیە لایو دەستی پیرۆزت بەسەردا نەمێنا، لـە هـاوارو نالّـە نەكـەوت، ئینجـا بەڕاسـتی كـە كوڵەكەیـەكی بـێ ڕوحو گیـان لـە دووریـت نالّـەو هاوار بكات، دە بوو ئێمە چی بكەین, كە كۆچت كردو بەجێت هێشتین ؟

## ﴿ ڕێزدارو گە ورە ترین ئادە میزاد ﴾

### ( أكرم الناس )

دەگێڕنـەوە : ڕۆژێـك هـەژارێكی دەسـت كـورت هاتـە خزمـەت پێغەمبـەروﷺ ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) هـەژارو دامـاوم شـتێكم بـدەنێ ؟ ڕەوشـتی شیرینی پێغەمبەر (ﷺ) وە ها بووە هیچ كەسێكی بێ بەش نەكردوە لە بەخشین دا, بـەلاّم مـەخابن لـەو كاتـەدا كـە ئـەو هـەژارە داوای لێ كـرد هیـچی پـێ نـەبوو

کەهەژارەکەی پێ ڕازی و ڕاهی بکات، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی وتەی لە هەژارەکە کردو فەرمووی: ئەی برای شیرینم بەڕاستی ئێستا هیچ شك نابەم پێت ببەخشم ؟ بەلام بۆ خۆت بڕۆچی ئارەزو دەکەیت بیکڕەو، بلێ پارەکەی لەسەر ( محمدی کوری عبدالله)یە،

لەوکاتەدا یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەلی دایەو، ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆچی کارێکی وادەکەی کە توانات بەسەریدانیە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) بەو وتەیە زۆر دلّ تەنگو دلّ گران بوو، ڕەنگی سور هەلگەڕاو، تورە بوون و ماتەمی لەنێو چاوانی بەدی دەکرا، حەزرەتی ابوبکر ﷺکە چاوی بە پێغەمبەرﷺ کەوت ڕەنگی گۆڕاوە، هەر خێرا هاتە وەلام و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دلّ لەدلّ مەدە، هەرچی ئارەزوت لێیەتی بیبەخشە، لە هەژاری‌و نەبوونی مە ترسە دەسەلاتی خودا بە سەر هەموو شتێك داهەیە .

ئینجا پێغەمبەری خوداﷺ بەو فەرمایشتەی ئەبو بکرﷺ، دەم و چاوی گەش بۆوەو دە ستی کرد بە پێکەنین .

## ﴿ ڕەوشتی چاکە ﴾

## (خصال الخیر)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك لە دوای نوێژی نیوەڕۆ پێغەمبەر(ﷺ) ڕوی لە یارەکانی کردو فەرمووی: ئێستا کێتان بە ڕۆژووە ؟ حەزرەتی ابو بکرﷺ فەرمووی : من بە ڕۆژوم ئەی پێغەمبەری خوداﷺ, پێغەمبەر فەرمووی(ﷺ) ئەمرۆکێ خێری بەهەژارێك کردووە ؟ ابو بکر ﷺفەرمووی: من ئەی پێغەمبەر خوداﷺ .

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەدی ئەمرۆ کامەتان سەردانی نەخۆشێکتان کردووە ؟! ئبوبکرﷺ فەرمووی : من سەردانیم کردووە ئەی خوشەویستی خودا : پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) ئەدی ئەمرۆکێ بەدوای جەنازەیەك داڕویشتووە بۆ

گوڕستان و بەخاکیان سپاردووە ؟ ابوبکرﷺ فەرمووی: من چوم ئەی ڕەسولی خودا .

پێغەمبەر فەرمووی: ئەدی کێ ئەمرۆ دووکەسی پێك هێناوەتەوە ؟ ابوبکرﷺ فەرمووی: من ئەی ڕێ نیشاندەری ڕاستی، لەدوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر باوەڕدارێك ڕەوشتێکی لەو ڕەوشتانە بەجێ بهێنێ ئەوە خودای گەورە لەڕۆژی دوایی دا لەکاتی لێپرسینەوەو نائارامیدا, دەرگاوانی بەهەشتێ بانگی دەکەن : ئەی فلان وەرە بێرەدا بۆ بەهەشت بڕۆ ؟حەزرەتی ابوبکرﷺ فەرمووی: ئەدی ئەوەی هەموویان بکات چۆنە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوە لەئومەتی منە لە ڕۆژی دوایی دا لەسەر هەموو دەرگاکانی بەهەشتێ بانگی دەکەن کە بفەرموو: بێرەدا بڕۆ بەڕاستی تۆش یەکەم کە سی کە لەهەموو دەرگاکانی بەهەشتێ بانگت دەکەن .

## ﴿ ئاین گەریەتی و خوا پەرەستی ( عمری فاروق ﷺ )﴾

## (زهد الفاروق)

(عبداللەی کوڕی عومەر ﷺ) دەفەرموێ ڕۆژێك حەزرەتی عومەریﷺ باوکم دەچێتە ناو باخە خورمایەك کە زۆر خۆش و دڵگیر دەبێت، لەبەر فێنك و خۆشی باخەکەی زۆری پێچو هەتا گەڕایەوە, نوێژی بەکۆمەڵ (جماعە)ی (عەصر) یان کردبوو، حەزرەتی عومەریشﷺ لەبەر فەوتانی نوێژە بەجەماعەتەکەی : زۆر دڵ تەنگ و نارەحەت بوو فەرمووی : ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ البقرة /١٥٦

واتە: ئەی خودای گەورە و مەرەبان ئێمە بە فەرمانی تۆ هاتوینە جیهان, وەهەر بۆلای تۆش دەگەڕێینیەوە : بەڕاستی ژیان بۆکەس هەتا هەتایە نیەو، هەموو کەسێك هەر دەمرێ و دەچێتەوە بەردەمی خودا، وە هەرچی هەیە هەمووی

بەدەستی ئەوە، وەهەرچی دەی کات بەگوێترە نیە !! بەڵکو بەپێی دەستورو باوێکە کە لەجیهانـدا دای ناوە،بەوجۆرە حەزرەتی عومەرﷺفەوتانی نوێژەبەجەماعە تەکەی زۆر لەدڵ گران بوو لەبیری نەدەچوو هەر باسی دەکرد کە بۆچی وەچۆن ئەو نوێـژەم بەجەماعەت فەوتاند : بۆیە لەناو کۆڕێك لە موسڵمانەکان فەرمووی: موسڵمانەکان، هەمووتان بەشاهید بن من ئەو باخە خورماخۆش و ڕازاوەم کە بە هۆی خۆشی باخەکەوە نوێژە بەجەماعەتەکەی عەسرم فەوتاند! ئەوا کردم بەخێر بۆ هەژارانی باوەڕداران، بۆ ئەوەی ببێتە (کفارە) تاوان پۆشی نوێژە بەجەماعەتەکەم .

## ﴿ ڕووداوێکی پیرۆز لە بەردەم ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

## ( مشهد مبارك من امام باب الرسول عليه الصلاة والسلام)

ڕۆژێکیان حەزرەتی ابوبکر (ﷺ) لەگەڵ حەزرەتی عەلی دا (ﷺ) دەبن بە هاوڕێی یەکترو, پێکەوە بەرەو ماڵی پێغەمبەر (ﷺ)دەڕۆن بۆ دیدەنی لە بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) ڕادەوەستن و کێشەی کێیان پێشبکەوێ دەکەوێتەبە ینیانەوە، بەو شێوەی خوارەوە:

حەزرەتی ابو بکرﷺ دە فەرموێ: ئەی عەلی فەرموو: پێشکەوە، حەزرەتی عەلی دەفەرموێ: نەخێر ئەی ئەبوبکر چۆن من پێشی تۆ دەکەوم، کە پێغەمبەر دەربارەی تۆ فەرموویەتی : لە وەتی دونیا هەیەو ڕۆژ هەڵدێتو ئاوا دەبێت لە دوای پێغەمبەرانەوە،هیچ کەسێك هێندەی ئەبوبکر بەڕێزو گەورە نیە !

ئەبو بکر: فەرمووی: ئەی عەلی من چۆن پێشی تۆ دەکەوم: ئەی پێغەمبەر دەربارەی تۆ نافەرموێ :چاك ترین ئافرەتی سەر دونیا کەفاتمەیە، لە چاك ترین پیاوی سەر دونیا کە حەزرەتی عەلیە، مارەم بڕیوە ؟!

عەلی: ئەی ئەبابکر دڵ لەدڵ مەدە بەڕاستی من پێش تۆ ناکەوم چونکە پێغەمبەر

دەربارەی تۆ دەفەرموێ: ئەگەر بیرو باوەڕی هەموو ئادەمیزادەکانی سەر دوونیا بکێشرێ لەگەڵ بیرو باوەڕی ئەبوبکردا، هێشتا باوەڕی ئەبوبکر قورسترە و بەسەر هەموو یان دا سەر دەکەوێ.

ئەبو بکر: ئەی عەلی هیچکە ڕاگیرمان مەکەو پێشکەوە چونکە پێغەمبەر دەربارەی تۆ فەرمووتی: لە ڕۆژی دوایی دا کە هەموو ئادەمیزادەکان، پەرێشان و نارەحەتن لەبەر ڕاوەستانی مەیدانی مەحشەرو لێپرسینەوەو ڕۆژی دوایی و کردارییان، لەو کاتەدا حەزرەتی عەلی و، فاتمەو، حەسەن و، حسین, بەسواری دێن و ڕادەگیرێن ئادەمیزادەکان ڕوو لە حەزرەتی عەلی دەکەن و دەڵێن: ئەو پیاوە نورانیە کێیە نای ناسین چی پێغەمبەرێکە؟. وەڵامیان دەدرێتەوە ئەوە پێغەمبەر نیە عەلی کوڕی ئەبی تالبە .

عەلی : ئەی ئەبوبکر پێشکەوە من پێشی تۆ ناکەوم: ئەدی نەت بیستوە کە پێغەمبەر دەربارەی تۆ فەرموویەتی: ئەگەر من خۆشەویست و هاوەڵێکم لەدونیا بە غەیری خودا هەڵبژارد بایە ئەوا ئەبو بکرم هەڵدەبژارد .

ئەبو بکر: بەدەمی شیرینی هاتە گوفتارو هە نگوینی لێ دەباری فەرمووی :ئەی عەلی بڕۆ پێشکەوە من پێشی تۆ ناکەوم : پێغەمبەر دەربارەی تۆ فەرموویە تی: من لە دوا ڕۆژدا لەگەڵ عەلی دا دەبم : خوای گەورەش دەفەرموێ : ئەی خۆشەویستی خۆم محمد, بزانە حەزرەتی ابراهیمم بە دڵسۆزترین باوك بۆ هەڵبژاردی : وە حەزرە تی عەلیشم بە دڵسۆز ترین هاوەڵ و برا بۆ هەڵبژاردی .

عەلی :گەوهەری نایابی لەدەم دەرچوو ڕووی پیرۆزی کردە ئەبو بکرو فەرمووی: ئاخر ئەبو بکر چۆن پێشی تۆ دەکەوم کە خودای مهرەبان لەبارەی تۆوە فەرموویەتی:

﴿ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ الزمر/٣٣

واتە: ئەو کەسەی لەلایەن خوداوە ئاین و بەرنامەی ڕاستی هێناوەو باوەڕی

پێی هەیە، بەڕاستی ئەوانە پارێزگارو خۆپارێزن .

یان : وەك‌وحەزرەتی:ابوبکر کە بەبێ بیروفکرو تێ ڕوانین باوەڕی هێنا بەو قورئان‌و پێغەمبەرە پاك ڕەوشتە،ئەو ئایەتە هەموو باوەڕ دارێك لە ڕابردو، لە ئێستاو، لەمەو دواش، دەگرێتەوە کە ئەو قورئان‌و ئاینە بەڕاست بزانێ‌و بە شوێنی فەرموودە بەرزە کانیدا بڕوات، وە بەڕاستیش تەنها ئەوانەن بڕوا داری لە خوا ترس و ڕاستەقینەو، خۆیان لەو شتانە دەپارێزن کەهۆی ناڕەزایی خودان.

ئەبو بکر: مرواری ڕستراوی چین لەسەر چینی لەدەم دەر دەچو دەی فەرموو: ئەی عەلی: پێشکەوە چونکە من پێش تۆ ناکەوم خودا ڕێزی زۆری لێ ناوی, لە بارەی تۆوە فەرموویەتی :﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾البقرة/٢٠٧.

واتە: لەناو کۆمەڵانی ئادەمیزاد دا ئیوا هەیە گیانی خۆی بەخت دەکات لە ڕێگەی ڕەزامەندی خودادا : وەحەزرەتی عەلیش﷜ یەکێك بوو لەوانەی کەگیانی خۆی بەخت کرد لەپێناو خوداو پێغەمبەری خودا ﷺدا کە لە ناو جێگەکەی پێغەمبەردا نوست, کاتی کۆچ کردنی : وە بەڕاستی خوداش خاوەن مهربانە بەرامبەر بەبەندەکانی خۆیدا : وەهەر تاوە ناتاوێك ئەو ئینسانە خۆ نەویستانەیان بۆ دەنێرێ .

وەخودا یاربێت ئێمە چاوەڕوانی باوەڕداری خۆ نەوسیت دەکەین کەتەمو مژو تاریکایمان لێ برەوێنێتەوە, وە لەچڵپاوی ڕۆچون‌و, هەڵ خلیسکان بمان هێنێتەوە سەر شەقامی ڕاستی‌و بەختەوەری : بەڵێ بەو شێوەیە حەزرەتی ئەبو بەکرو، عەلی لەو کێشمان کێشمانە دابوون, حەزرەتی جبرائیل هاتە سەرزەمین، چو بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی : یارسول الله واحەزرەتی ئەبوبکرو حەزرەتی عەلی لەسەر دەرگا ڕاوەستاون تەشریف بفەرموو بۆلایان : پێغەمبەر هەر خێرا پێشوازی لێ کردن کە سەیری کرد وا کێشەیانە لەسەر چونەپێشەوە:

## دۆستی باوەڕداران

پێغەمبەر(ﷺ) حەزرەتی ئەبو بکری لەلای ڕاستی ڕاگرت و، حەزرەتی عەلیشی لەلای چەپی فەرمووی : بابڕۆینە ژورەوە بەڕاستی ڕۆژی دوایی (قیامە) بەو شێوە کۆ دەکرێینەوەو حەشرمان دەکرێت .وە بەو جۆرەش پێغەمبەرﷺ کۆ تایی بە کێشەی پێشکەوتن هێنا .

## ﴿ میهرەبانی خودات لەسەر بێ ئەی ئەبا بەکرؓ ﴾

### (یرحمك الله یا ابابکرؓ)

ئەو کاتەی کەحەزرەتی ئەبو بەکرؓ بەنەخۆشی دەتلایەوە : کە بەڕاستی نەخۆشیەکەی زۆری تینی بۆ هێنا :حەزرە تی عائیشەی کچی ووتی بابە : نەخوشیەکەت زۆر مەترسی لێ کراوەو لەدەستی بەئازاری دەچم پزیشکت بۆدێنم ؟ ئەبوبکریشؓ فەرمووی : کچم بۆ خۆم چومەلای پزیشك و چارەسەرو ڕێنمونی کردم، کچەکەی ووتی: بابە پزیشك چی پێ ووتی ؟

ئەبوبکر ؓ فەرمووی: کچم پزیشك ووتی : من کار بینم ئەوەی بمەوێ دە یکەم . بۆیە من دەزانم کە کۆتایی ژیانمە، عا ئشە فەرمووی : ئەی بابە کەمردی چیت بۆ بکەینە خەڵاتو کفنت، ئەبوبکرؓ فەرمووی : ئەو پۆشا ك و بەرگانەی کە لەدوای پێغەمبەرەوە نوێژم پێوە دەکرد : عائشە فەرمووی : بابە ئەو بەرگانە ڕزیون و هیچ سودیان نەماوە : بۆچی بەرگێکی نوێت بۆ نەکڕین و بیکەین کفنت ؟ ئەبوبکر ؓ فەرمووی: کچم ئادەمیزادی زیند و زیاتر پێویستی بە بەرگی نوێ هەیە نەك مردوو .!!!

## ﴿ جیٚ نشینی موسلمان ﴾

### (خلا فة إسلا مية)

سەرکردەی پاڵەوانی اسلام حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) خەلیفەی نیشتمانی موسڵمانان, شەوێکی ساردوو سەهەند، تاریك و ئە نگو ستەچاو، لە گەڵ هاوڕیٚ بەڕێزو خۆشەویستەکەی (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف)(رضي الله عنه) بۆ ئاگاداری و پارێزگاری دانیشتوانی، بۆ هەواڵ پرسینی کۆمەڵانی خەڵك لە کۆڵاَن و شەقامەکاندا دەگەڕا : لەدوورەوە لەناو تاریکایی شەودا، تروسکە ئاگرێکیان بەدی کرد : بەرەو ئاگرەکە کەوتنە ڕیٚ کە نزیك بوونەوە، سەیریان کرد لە چوار دەورەی ئاگرەکە ئافرەتێك و سیٚ منداڵ کڕوژەیان کردووەو هەر یەکەی لەلا یەکەوە گریان و هاواریەتی، یەکیان دەی ووت : توخودا دایە بەزەییت بەمن دابێتەوە، تاکەی فرمێسکم هەڵڕێژم، یەکی تریان دەی ووت : ئەی هاوار دایە خەریکە لەبرسان گیانم دەردەچیٚ ؟ ئەوی تر دەی ووت: ئەی دایە کەس نیە خواردنێکمان بۆ بهێنیٚ لە پێشی ئەوەی لە برسان گیانمان دەرچیٚ ؟! حەزرەتی عومەر رضي الله عنه کە چاوی بەو ڕووداوە کەوت ڕۆیشتە پێشەوە لە نزیکی ئاگرەکە دانیشت :ڕووی لە ئافرتەکە کردوو فەرمووی : ئەی دایە هاوارو سکالاٌ بۆکیٚ دەکەن : ئافرەتەکە دوو سیٚ جار لە داخ و خەفەت هەناسەی ساردی هەڵکێشاو, بە سینگی خۆی کێشاو ووتی، ڕۆڵە هاوارمان لەدەستی عومەرە، حەزرەتی عومەریش رضي الله عنه هاتە وەلاّم و فەرمووی : ئەی دایە دەبینی عومەر ئاگای لەئێوە نیەو، نازانیٚ ئێوە هەژارن، ئافرەتەکە ووتی : ئاڕۆڵە چۆن شتی وادەبێت !! عومەر سەرکردەمانەو فەرمانمان لەوەوە بۆ دێت چۆن دەبیٚ سەر کردەیەکی وا ئاگای لە ژیانمان نەبیٚ ؟. شتی وەها هەرگیز نابێت !. حەزرەتی عومەر رضي الله عنهگوێی لە وتەی ئافرتەکە بوو : خەریك بوو گیانی دەرچێت، فرمێسکی بەسەر ڕوخساری دا دەهاتە خوار : عومەری خاوەن ڕێز،

خێـرا هەسـتا هەربـەو شـەوە تاریـكو سـاردە ڕۆیـشتە گەنجینـەی (بـانق) موسـڵمانان، لێپرسـراوی گەنجینـە ئاگـادار کـردەوەو دەرگـای گەنجینـەیان کردەوە، زۆر بەخێرایی لێپرسراو ووتی : ئەی سەرکردەی موسڵمانان چی ڕوی داوە بەو شـەوە تاریـكو سـاردە هاتویـە گەنجینـە، حـەزرەتی عومـەرﷺ لەبـەر نارەحـەت و پـەژارەی خـۆی وەڵامـی لێپرسـراوی نەدایـەوە هـەر خێـرا کیسەیەك ئاردی پڕکردو، قاپێك ڕۆن و، قاپێك هەنگوینی پڕ کرد، لێپرسراوی گەنجینەش واقـی وڕمـا بـوو هـەر سـەیری حـەزرەتی عومـەری دەکـردو دەی ووت : بۆچـی واپەشۆکاوی، چی ڕووی داوە، حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی : وەرە خێـرا بە کوڵم دابـدە لێپرسـراو ووتـی : ئـەی سـەرکردەی موسـڵمانان مـن هـەڵی دەگـرم : نابێ تۆ هەڵی بگری, هەر چەندە کردی : حەزرەتی عومەرﷺ ڕازی نەبوو ووتی : هەی دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، وەرە بە کوڵم دابدە، ئەو تاوانە ئی خۆمە، چـونکە تـۆ نـاتوانی لـە ڕۆژی دوایـی دا تاوانـەکانم هـەڵگری، بـەو شـێوەیە حەزرەتی عومەر ﷺ شتەکانی لە کوڵی خۆی ناو، بەو تاریك و سـەرمایە بـەرەو مـاڵی ئافرەتەکە کەوتـە ڕێگا, لـە نزیکـی ئاگرەکـە دانیـشت و، دەسـتی کـرد بـە ئامادە کردنی خواردن بۆ منداڵەکان، بە دەستی پیرۆزی خواردنی ئامادە کردوو دەیـدا بـە منداڵـەکان، هـەتا هـەموویانی تێـر کـرد، دایکـە کەشـیان سـەری سوڕمابوو، سـەیری سـۆزو مهرەبـانی ئـەو کابرایـەی دەکـرد کەچـۆن بـەو شـەوە تاریك و ساردە ڕۆیشتو خواردنی هێنـاو، بۆی ئامـادە کـردن و منداڵـەکانی تێـر کرد . ئافرەتەکە هاتە گوفتارو ووتـی : سوێند بەخودای مهرەبان ئەی براکەم تـۆ جێگەی شانازی کە ببیە سەرکردەی موسڵمانان ؟! نـەك عومـەری کـوڕی خـەتاب : ئافرەتەکە نەی دەزانی ئەو پیاوە بۆ خۆی حەزرەتی عومەرە .

حـەزرەتی عومـەر ﷺ فـەرمووی : ئـەی خوشـکم بـەیانی وەرە بـۆلای بارەگـای عومەر بەشکم منیش لەوێ ئامادەبم‌و لـەبارەی تـۆوە قـسەیەکی لـە گەڵدا بکـەم ! بـەو شـێوەیە حـەزرەتی عومـەر ﷺمـاڵ ئـاوایی لـە ئـافرەت و منداڵـەکان کـردو

گەڕایەوە دواوە لەپەناو حەشارگەیەکی ماڵەکەدا خۆی شاردەوە سەیری منداڵەکانی دەکرد، (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﷺ) فەرمووی : ئەی سەرکردەی موسڵمانان بەڕاستی شەوەکەی زۆر ساردو سەرمایە ناتوانم زیاتر خۆم ڕابگرم با بڕۆین ! حەزرەتی عومەریش (ﷺ) فەرمووی : ئەی عبدالرحمن کە ئێمە هاتین ئەو منداڵانە دەگریان و هاواریان دەکرد : سوێند بەو خودایەی کە گیانی هەموومانی بەدەستە لێرە ناڕۆم هەتا بەچاوی خۆم نەبینم ئەو منداڵانە پێ دەکەنن !!! ئینجا بۆ بەیانی ئافرتەکە ڕۆیشتە بارەگای حەزرەتی عومەرﷺ، ڕۆیشتە ژورەوە سە یری کرد ئەو پیاوەی کە شەو هاتۆتە لایان و خواردنی بۆ ئامادە کردون و، سکالای هەژاری و ناڕەزایی لە دە ستی عومەر کردووە بۆ خۆیەتی و لەبەینی حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالب ﷺ) و (عبد الله کوڕی مەسعودﷺ) دانیشتووە : هەر دووکیان بەڕێزەوە قسەی لەگەڵ دەکەن و پێی دەڵێن: سەرکردەی موسڵمانان : ئافرەتەکە چاوی بەو دیمەنە کەوت زۆر خەجاڵەت بوو زۆریش ترسا، حەزرەتی عومەریشﷺ چاوی بە ئافرەتەکە کەوت ڕەنگی هەڵبزرکاو خەجاڵەت بوو، فەرمووی : ئەی خوشکم هیچ شەرم نەت گرێ و خەجاڵەت مەبە ؟. ئەوستەمو تاوانەی کە لە ئێوەم کردووە پێم بفرۆشە، بەڕاستی من زۆر شەرمەزارم لەلای خودا، ئافرتەکە ووتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان بم بورن، من پەشیمانم لەو سکالایەی شەو کەلای تۆم کرد ئافرەتەکە ڕوی وەرگێرا و نیازی بوو بڕوات، حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی : سوێند بەخودا لێرە ناڕۆی هەتا ئەو ستەمو زۆرداریەی کەلێم کردوی پێم نە فرۆشی؟. بەهەر شێوەیەك بوو ئافرە تەکەیان ڕازی کرد،

بە (٦٠٠) شەش سەد درهەم ستەمەکەیان لێ کڕی و، داوای لێبوردن و ئازادیان لێ کرد : حەزرەتی عومەرﷺ لە ماڵی خۆی پارەکەی دا نەك لەماڵی خەزێنە : وە بە حەزرەتی عەلیﷺ فەرموو : بنوسە ئێمە کە عەلی و، عبدالله ی کوڕی مسعود : شاهیدین کە فلانە ئافرەتە، تاوان و ستەمەکەی خۆی بە

خەلیفـەی موسـڵمانان عومـەری کـوڕی خـەتاب ﷺ فرۆشـت،لە دوای ئـەوە حـەزرەتی عومـەرﷺ فـەرمووی : بەشـاهیدبن ئەگـەر مـردم ئـەو نوسـراوە لـەناو خەڵاتەکەم بهاون هەتا بەخزمـەت خودای گـەورە دەگـەم, باخەجاڵـەت و نائومێد نەبم .

## ﴿ خەلیفە عومەرﷺ کلیلی مزگەوتی ئەقسا وەر دەگرێ ﴾

## (عمرﷺیتسلم مفاتح المسجد الأ قصى)

لـە سـاڵی (١٥) پـانزەی کۆچـی سـەرۆکی موسـڵمانان( عومـەری کـوڕی خەتابﷺ) چەند سەرکردەی سوپای موسڵمانانی نارد بولای، (بتریـارك سـەقەر یـوس) پادشـای شـاری قـدس, بـۆ ئـەوەی کلیلـی ئـەو شـارە بداتـە دەسـت موسڵمانەکان، بەڵام بە تریارك کەسەیری ئەو سەرکردانەی وەك‌و (عەمری کوڕی عاسﷺ) و (شـەرحەبیلی کوڕی حەسـەنەﷺ)و( ئـەبا عوبەیـدەی کوڕی جەڕاح ﷺ)و چـەندانی دیکەشـی کـرد ووتـی : مـن کلیلـی شـار نادەمـە دەسـت ئێـوە! چـونکە ئێمـە لـە کتێبـی پـیرۆزی خۆمانـدا خوێندومانەتـەوە کـە شـاری قـدس ئـازاددەکرێ‌و کلیلـی شـار دەدرێتـە سـەرکردەی موسـڵمانان, کـە چـەند نیشانەیەکی پێوەیە, بەڵام وەکو سەیر دەکەم ئێوە هیچتان ئەو نیشانانەتان پێوە نیە؟. بۆیە ناتوانن کلیلی ئەو شارەمان لێ وەر بگرن .

لـە دوای ئـەوەی کـە ئـەو سـەرکردانە بۆیـان دەرکـەوت کـە پادشـای قـدس وا بەسانەیی‌و ئاسانی کلیلی شاریان نا داتێ بە ناچاری نامەیەکیان بۆ حەزرەتی عومەرﷺ نوسی : ئەی خەلیفەی موسڵمانان لەبەر ئەوەی کە فەرمانی تۆمان پـێ نـەبوو بـۆ ئـەوەی جـەنگ و شـەڕ بـەرپا بکـەین، پادشـای شـاری قودسـیش کلیلی شاری نەداینێ . هیوا دارین, بە گەیشتنی ئەو نامەیە فەرمانی جەنگمان پـێ بـدەی, بۆئـەوەی بـە جـەنگ شـاری قـدس وەر بگـرین، یـان تەشـریفت

بفـەرمووی : بۆلامـان بنێـت, کاتێـك نامـە گەیـشت و خوێندرایـەوە حـەزرەتی عومەرﷺ: خوی ئامادەی سەفر کردو لەگەڵ غولامێکی دا، تـەنها حوشترێکیان پـێ بـوو کەوتنـە ڕێ سـەرۆکی موسـڵمانان و, خزمـەتکار بەنۆبـە سـواری حوشترەکە دەبوون و، نۆ بەیەکی پشو دا نیشیان دەدایە حوشترەکە، بەبەتاڵی رایـان دەکێـشا کـە نزیکـی سـنوری شـام بوونـەوە ( ئـەبا عوبەیـدەﷺ)و چـەند موسـڵمانێك بەپێـشوازیان هـا تـن ،لـەدوای ماوەیـەك ڕۆیـشتن کەوتنـە نـاو قـوڕو زەلگاوێکەوە، لەو کاتەش دا نۆبە سواری غولامە کەبوو حەزرەتی عومەریشﷺ ڕێـشمەی حوشـترەکەی ڕادەکێـشاو پێڵاوەکـانی لـەبن هـەنگڵی دانـا بـوو، بـە پێخواسـی بـە ناوئاوەکـە کـەوت و، بەدەسـتێکیش ڕێـشمەی حوشـترەکەی ڕادە کێـشا ( ئـەبو عوبەیـدەی عـامری کـوڕی جـەڕاح)(ﷺ) ووتـی: ئـەی خەلیفـەی موسلمانان چۆن تۆ لێپرسراوی ئەو میللەتـەی دەبێ بە پێخواسـی بە نـاو ئەو قوڕوئـاوەدا بـڕۆی, بـە ڕاسـتی مـن بـە جـوانی نـازانم، حـەزرەتی عومـەر ﷺ فـەرمووی :خـودای گـەورە ئێمـەی بـەهۆی دینـی سـەربەرزی ئیـسلامەوە بـەرز کردوتەوە، لە چەوسانەوەو دەست بەسەری ڕزگاری کردوین،چونکە ئێمە پێش ئیسلام نەوەیـەکی چەوساوەو دەست بەسـەر بوین، ئێـستاش هـەرکاتێك داوای گەورایـەتی بکـەین بـەبێ پـەیڕەوی کردنـی دینـی سـەربەرزی ئیـسلام خـودا سـەر شـۆڕو دەسـت بەسـەرمان دەکاتـەوە ، وە ئێـستا نۆبـەی سـواری غولامەکەیـە، نـەوەك ئـەمن ئەگـەر ئـەوی دا بـەزێنمو خـۆم سـواری ولاغەکـە ببم ئەوەبەڕاسـتی ستەمم لێ کردوە ئەوەش بۆ موسڵمانان نابێ و کارێکی ناڕێك‌و نەگونجاوە .

بـەڵێ هـەر بـەو شـێوەیە بەنۆبـە سـواری حوشـترەکە دەبـوون، سـەر کردەکـانی موسـڵمانان زۆر لـەوە دەترسـان کەلەوکاتـەی دەگەنـە لای (بتریـارك ): پادشـای قودس نۆبە سواری غولامەکە بێت .!!

بەڵام :خودای گەورە وای هێنا کە خەلیفە عومەرﷺ گەیشتە لای پادشای قـودس نۆبـە سـواری غولامەکـە بـوو خەلیفـە عومـەرﷺ بـەپێیان دەڕۆیـشت و

## دۆستی باوەڕداران

ڕێشمەی حوشترەکەی ڕادەکێشا (بەتریارک) ماوەیەک سەیری حەزرەتی عومەری کردو لێی وورد بۆوە، ئەو ڕەوشتانەی کە لەکتێبی پیرۆزی خۆیاندا چاوی پێ کەوتبوو لە خەلیفە عومەردا ﷺ بەدی دەکرا، بۆیە بەبێ ووتە: خێرا کلیلی شاری قودسی بە حەزرەتی عومەر ﷺ بەخشی، ئنجا ووتی : بەڕاستی ئەو نیشانانەی کە لە کتێبی پیرۆزمان دا هەبوو کە ئادەمیزادێك کلیلی ئەوشارە وەردەگرێت خەلیفەی موسڵمانانەو بەپێیان دێتە ناو شارو,غولامەکەی بەسوارییەو پۆشاکەکەی بەری حەڤدە پینەی پێوەیە ئەوەی کەمنیش سەیری دەکەم ئەتۆی وئەوکلیلەش شایانی تۆیە .

ئینجا خەلیفە عومەر ﷺ لەدوای وەرگرتنی کلیلەکە کڕنۆشی بۆ خودا بردوو ماوەیەک لەکڕنۆش دا مایەوە، وە ئەو شەوە زۆر گریا فرمێسکی چاوی وشك نەدەبۆوە پرسیاریان لێ کرد ئەی خەلیفەی موسڵمانان دەبوو کەیف خۆشی دەربڕی، بەلام هەر دەگریەی هۆی چیە ؟ ئەویش لەوە لامدا فەرمووی : ئەمن لەوە دەترسێم ؟ خودای گەورە بە دەستی ئێوە جیهان ئازاد دەکاو لە ژێر باری زۆرداری ڕزگارتان دەبێ ! بەلام هێندێکتان مل ملانەی یەکتر دەکەن و لە بەرامبەر یەکترا دەوەستن و ئاژاوە دروست دەکەن، ئەوکاتەش خودای گەورە فریشتەکانی ئاسمانمان بەسەردا زاڵ دەکات و دوژمنایەتی و بەرهەڵستیمان دەکەن وبە ناخۆشی وئاژاوە ژیان دەبەینە سەر, بەڕاستی من تەنها بۆیە دەگریەم

## ﴿خەلیفە عومەر ﷺ و کارێکی هەڵکەوت﴾

## (عمر والکرامة)

ڕۆژێکی هەینی حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتاب) (ﷺ) بۆ ووتاری هەینی چووە سەرمنبەر دەستی کرد بە وتار خوێندنەوە لە ناوە ڕاستی وتارە کەیدا ڕاوەستاو هاواری کرد, ئەی سارییە کێوەکە، کێوەکە، وە لەوکاتو وەختەدا, خەلیفە عومەر ﷺ سوپایەکی گەورەی باوەڕدارەکانی بەسەر کردەی سوپا (ساری یەی کوڕی حەسین ﷺ) ناردبوو بۆ نیشتمانی فارس بۆ جەنگ، لە دوایی دا کە نوێژی هەینیان تەواو کرد حەزرەتی عەلی (ﷺ) فەرمووی : ئەی خەلیفەی موسڵمانان بۆچی هاواری ساریەت کرد؟ ئەدی سارییەت ڕەوانەی وڵاتی فارس نەکردووە بۆ جەنگ لەگەڵ فارسە بێ باوەڕەکاندا ؟.

خەلیفە عومەر ﷺ فەرمووی : ئەی عەلی بەڵێ دەم زانی و لەبیرم بوو؟، بەڵام لە کاتی وتارەکەم دا چاوم بەبێ باوەڕەکان کەوت، خەریك بوون لای سەرەوەی کێوەکە دەگرن و گەمارۆی موسڵمانەکان دەدەن و لای پشتەوەیان لێ دەگرن .!! منیش هاواری سەرکردەی سوپای موسڵمانان،( ساری یەم) کرد کە لای کێوە کە بگرن بۆ ئەوەی خودای مهرەبان بیان پارێزێ و ڕزگاریان بکات لە دوژمن و سەرکەوتوبن، ئینجا لەو کاتەی موسڵمانەکان لە جەنگی فارس گەڕانەوە بۆ مەدینەی مننەوەرە، ئەو پرسیارە لەمێشکی هێندێك لە موسڵمانەکاندا پەنگاوی خوارد بۆوە،ئایا بۆ دەبێ عومەر ئەوها دەنگی بگاتە ئەو دوورە وڵاتە، بەبێ جیهازی بێتەل،بۆئەومەبەستە پرسیاریان لە ساری یە کرد لە بارەی جەنگ و ڕوداوی جەنگ بەڵام فەرموو دەکەی حەزرەتی عومەریان پێ نەگوت بوو کە لە نوێژی هەینی دا هاواری لەساری یە کرد !.

ساری یە بەبێ ئاگاداری و هیچ پرسیارێك فەرمووی : ئێمە لە مەیدانی جەنگ دا بووین، دووژمن دەیویست گەمارۆمان بداو چوار دەورەمان بگرێت، ئێمە بێ

ئاگا بووین لە کێوێک کە لەپشتمانەوە بوو موسڵمانەکان هاتبوونە خواریَ و خەریك بوو بێباوەڕەکان کێوەکە بگرن .! لەوکاتی جەنگ و هەراوتێك هەڵچونە دا گوێم لێ بوو لە دەنگی سەرکردەی موسڵمانان حەزرەتی عومەر ﷺ بانگی کردم ئەی ساریە کێوەکە، کێوەکە !!. ئێمەش ئاگادار بووینەوەو خێرا کێوەکەمان گرت و، خودای گەورە ڕزگاری کردین و بەسەر دوژمندا سەرکەوتین

## ﴿بەوشێوەیەڕەفتارتان لەگەڵ دەکەین ئەی خاوەن پەڕاوی ئاسمانی﴾

(هكذاعاملناكم ياأهـل الكتاب)

ڕۆژێکیان خەلیفەی دڵسۆزو تێکۆشەری موسڵمانان حەزرەتی( عومەرﷺ) بەیەکێك لەشەقامەکانی شاری مەدینەدا دەگەڕا، چاوی بە کابرایەکی پیری کوێری چەماوە کەوت دەرگاو دەرك دەگەڕا بۆسواڵ ودەرۆزە کردن, حەزرەتی عومەرﷺ زۆر نارەحەت بوو, ڕووی لە کابرا کردو فەرمووی : ئەی برا بۆچی لە خەڵك دەپاڕێیەوە ؟ داوای ڕۆزی تەنها هەر لە خودا بکە، کاتێك کابرا بۆی دەرکەوت کە ئەوە حەزرەتی عومەرەو سەرکردەی موسڵمانانە ووتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان من کابرایەکی گاورم و لەسەر ئاینی مەسیح تەمەنم بردۆتە سەر ئێستاش پیرو پەك کەوتەو بە ساڵاَ چوم و لە سەروەتی دونیا هیچ شك نابەم بۆیە وا خەریکی سواڵودەرۆزە کردنم حەزرەتی عومەرﷺ زۆری بەزەیی پێدا هاتەوەو دە ستی کابرای گاوری گرت و بەرەو ماڵی خۆیانی بردەوە بەخێزانەکەی ووت : (ئوم کەلسوم) چیمان هەیە خواردن بۆ ئەو میوانە خۆشەویستە ئامادە بکە؟. لەدوای تێر خواردن هەستا بەرەو خەزێنەی موسڵمانان ڕۆیشتن :

حەزرەتی عومەر ﷺبەلێپرسراوی خەزێنەی ووت : چاو دێری ئەو پیاوەو وێنەی ئەوەش بکەو بەشێك لە خەزێنەی بۆ تەرخان بکە . چونکە بەڕاستی

ئێمە هیچ چاکەیەکمان دەست ناکەوێ کەبەتەمەنی پیری واز لەوانە بهێنین، ئەدی بۆچی هەتا لاو بوون سەرانەمان لێ وەر دەکرتن!. ئێستاش کە پیر بوون وازیان لێ بێنین ؟ بەو شێوەیە لە خەزێنەی موسڵمانان خانە نیشنی بۆ بڕایەوە.

## ﴿پیاوی میرنیشن وسەرکردایەتی﴾

### (رجال الأمارة)

پادشای هەرێمی (ئازەربایجان) نێرراوێکی نارد بۆ مەدینەی ( مننەوەرە) بۆ لای خەلیفەی موسڵمانان حەزرەتی (عومەرﷺ )کابرا شەو گەیشتە مەدینە نەیویست بەو شەوە بڕواتە ماڵی خەلیفە ووتی : دەترسێم بچمە ماڵیان بەو شەوە نارەحەت بن و لەخەویان بکەم؟! بۆیە وای بەچاك زانی بڕواتە مزگەوت، بۆ بەیانی حەزرەتی عومەرﷺ لە مزگەوت بدینێ بەڵام : کابرا لەنیوەی شەودا لەسوچێکی مزگەوتەوە گوێی لە ناڵەو هاوارێك بوو دەی ووت : ئەی خودای گەورەو مهرەبان لە دەرگای قاپی مهرەبانیت ڕاوستاوم چاوم بڕیوەتە خوانی مهرەبانیت بۆ ئەوەی بزانم پەشیمانیم لێوەر گیراوە هەتا پیرۆز بایی لەنە فسو گیانم بکەم، یان پە شیمانیم لێ وەر نەگیراوە هەتا پرسەو دڵ نەوازی نەفسەکەم بکەم، کابراکە بەو نیوە شەوە بەرەولای دەنگەکە دەڕواودەڵێ تۆکێی خودا ڕەحمت پێ بکات ؟

کابراش وەڵامی دەداتەوە و دە فەرموێ : من عومەری کوڕی خە تابم کابرا بە سەر سوڕمانێکەوە ووتی : من ئەو شەو نەهاتمە ماڵتان تاك و پشودانی شەوتان تێك نەدەم !. کەچی وا بەو نیوە شەوە لە سوچێکی مزگەوت لەخودا دەپاڕێیتەوە، خەلیفەی موسڵمانان فەرمووی : ئەی برام خودا مهرەبانیت لەگەڵ دا بکات ئەی نازانی کەشەو بنوم هەتا بەیانی خۆم بە هیلاك دەچم لە بەردەستی قودرەتی خودا دا، وە ئەگەر بە ڕۆژ یش بە تەواوی بنووم ئەوا

کۆمەڵ و ژێر دەستەکانم لە دەست دەدەم !.ئینجا دوای ئەوەی کەڕۆژ بۆوە نوێژی بەیانیان کرد گەڕانەوە بۆ ماڵی حەزرەتی عومەرﷺ.

که گەیشتنەوە سەرکردەی موسڵمانان فەرمووی : ئەی ئوم کەلسوم چیمان هە یە بۆمان بهێنە، ئوم کەلسوم ووتی: تەنها نان‌وخوێمان هەیە، لە دوای نان خواردن حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: ئەی برام چۆنی، بوو هاتی بۆ لامان؟ نێرراوە کە ووتی: پادشامان ئەو دیارییەی بۆ ناردوی، حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی : چیت هێناوە با سەیری بکەین، کەسەریان هەڵدایەوە قاپێك حەلوای شیرینی نایابی تێدا بوو, کابرا ووتی: ئەی خەلیفە پادشاکەمان ئەو حەلوا شیرینەی بۆ ناردوی :حەزرە تی عومەرﷺ فەرمووی: بەشی هەموو بڕوا دارەکانی کەشت داوە، کابرا سەرسام بوو ووتی: ئەی خەلیفەی موسڵمانان ئەو حەلوایە تایبەتیەو بۆ هەموو کەسێك دە ست ناکەویٚ تەنها بۆ پیاوە گەورەکانە، حەزرەتی عومەر ﷺڕەنگی سور هەڵگەڕاو تووڕە بوو فەرمووی: بڕۆ بۆلای هاوەڵەکەت و پێی بڵیٚ: جارێکی تر ئەو کردەوە نارە وایە دووبارە نەکاتەوە دەنا خەراپی بەسەر دێنم و پشتی دەشکێنم، ئێستاش بڕۆ مزگەوت و ئەو حەلوایە بەسەر هەژارەکاندا ببەخشەوە، بەڕاستی شتێکی نارەوایە, عومەر ئەو حەلوا خۆشە بخوات و موسڵمانانیش بیٚ بەش بن‌و نەی خۆن .!!

## ﴿ سەرکردەی موسڵمانان﴾

### (قادة مسلمون)

دەگێڕنـەوە شـەوێکیان حـەزرەتی( عومـەری کـوڕی خـەتاب)(ﷺ)لـەکوڵانی مەدینەدا دەگەڕا بۆ ئەوەی ئاگاداری بە سەرهاتی دانیشتوانی بێت, لە نیوەی شەودا گوێی لەدەنگی ئافرەتێك بوو دەی ووت :

لقد طال هذا الليل واسود جا نبه　　وارقنی ان لا حبیبا أداعـبه
فوالله لـولا الله تخشی عواقبه　　لحرق من هذا السریر جوانبه

واتـە: بەڕاسـتی ئـەم شـەوە زۆر درێـژەی کێـشاو لـە هـەموو لایەکـەوە تاریـك هەڵگەڕاوە لەبەر نەبوونی خۆشەویستێ : یاری لەگەڵ دابکەم و، دەست لە ملانم بـێ، خـەوم لێ زڕاوەو، خـەوم لێ ناکـەوێ، سـوێند بەخودای گـەورە ئەگـەر لەبـەر خودای نەبایە و, لە دوا ڕۆژی خـۆم نـە ترسـامایە بۆ تۆڵەو سزا، ئاگرم لەهـەر چوار لای جێگاو بانەکەم بەردەدا . منیش بەو شێوەیە کردمە هەڵبەست:

ئەم شەو شەو گار درێژ بوو, شەوێکی تاریك و شوم
خەوم لەچاو زڕاوە کەس نییە لە کەڵیا بنوم
سوێند بێ بەزاتی خودا ، گەرلەبەرخوداش نەبا
ئەو جێگەو ڕێگەی هەمە، ئاگرم تێبەر دە دا

حـەزرەتی (عومـەرﷺ) کـە گـوێی لـە گفتـو گـۆی ئـەو ئافرەتـە بـوو, بـەزیرەك و زانیاری خۆی زانی کە ئەو ئافرەتە مێردەکەی لەماڵ نیەو ماوەیەکی زۆرە لێ ی دوورە وا سـکالای حـاڵی خـۆی دەکـات، بۆیـە حـەزرەتی (عومـەرﷺ) ڕۆیـشت بۆلای (حەفسەی) کچی،کە دایکی موسڵمانانە و, خێزانـی پێغەمبـەری خودایە، فەرمووی: ئەی کچم هاتوم پرسیارێکت لێ بکەم شەرم مەکە و، بەتـەواوی وەڵامـم

بـدەوە ؟ ئایـا ئـافرەت بەچـەند مـانگ دەتـوانێ لەمێردەکـەی دوور کەوێتـەوە (حەفسە) خـاتوون لەشـەرمان هـیچ وەڵامـی پێنەدرایـەوەو. سـەری دانەوانـد، حەزرەتی( عومـەرﷺ) فەرمووی: کچم شەرمی ناوێ تۆ دایکی موسڵمانان و، خێزانـی پێغەمبـەری خـودایﷺ، وەڵامـم بـدەوە ؟ دووبـارە ( حەفـسە ) خـاتون شەرمی کرد وەڵامی بداتەوە، بۆیە بەچوار پەنجە ئیشارەی بۆحەزرەتی عومەر کردو. لـە دوایـی دا فـەرمووی : ئەدی بابـە ئەو ئایەتـەت نـە دیتـووە کـە خـودا دەفەرموێ :

﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾ البقرة/٢٢٦

وا تـە: بۆ ئەو کەسانە هەیە کە سوێند دەخۆن نەچنەلای خێزانەکانیان بۆ مـاوەی زیـاتر لـە چـوار مـانگ، یـان هـەر بەیـەکجاری نەچـن ؟! ئـەوە خێـزان و هاوسەرەکانیان هەتا چوار مانگ چاوە ڕوانیان لێ دەکەن، لەدوای چوار مانگ ئافرەتەکـە دە تـوانێ، یـان داوای سـەرجێی لەمێردوهاوسـەرەکەی بکـات. یـان داوای جودا بوونەوە (تەڵاق) ی لێ بکات .

(حەفسە) خاتوون هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە : وە یەکەم کەسیش بووە کە قورئانی پیرۆزی نوسیووە تەوە، لە دوایی دا حەزرەتی (عومەرﷺ ) ڕۆیشت پرسـیاری کـرد، مێـردی ئـەو ئافرەتـە لەکوێیـە ؟ ووتیـان : ئـەی خلیفـەی موسـڵمانان مێردەکـەی سـەربازی جـەنگاوەرە لەگـەڵ بێباوەڕەکـان دا، دوایـی حـەزرەتی (عومـەرﷺ ) فـەرمانێکی دیـوانی(رسمـی) دەرکـرد بـۆ سـوپای موسڵمانان، کە پێویستە لەسەر هەموو جەنگاوەری موسڵمان لە چوار مانگ زیاتر لە ماڵەوە دوور نەکەوێتەوە، حەزرەتی عومەرﷺ) یەکەم کەس بووە کە مۆڵەت و پەیوەندی ڕە بتی گرد کردنەوەو. بەسەرکردنەوەی لە جەنگەی شەڕدا کردووە !.

# ﴿ لەخۆپرسینەوە﴾

## (محاسبة النفس)

دەگێڕنـەوە جارێـك خەلیفـەی موسـڵمانان حـەزرەتی( عومـەر)(ﷺ) لـەنیوە شـەودا لـەناو شـاری مەدینـەدا دەگـەڕا وەك‌و ئێـشك چـی بۆئـەوەی ئاگـاداری هـەواڵ‌و ڕوداوی نـاو شـارو ئادەمیزادەكـان بزانێ ، لـەكاتێك دا گـوێی لـەدەنگی منـداڵێك بـوو زۆر بەسـۆز دەگریـا ، ئـەو گریانـە زۆر تینـی تـێ كـردو هەسـتی مهرەبانی خەلیفە (عومەرﷺ)ی بزواند بۆیە ڕۆیشت لـەدەرگای ئەو ماڵـەی داو، بەدایكەكـەی ووت : خوشـكم ئـەو منداڵـە بێـدەنگ بكـە بانـەگریا؟ حـەزرەتی( عومـەرﷺ) بـە ئافرەتەكـەی ووت و: گەڕایـەوە : لـەدوای ماوەیـەك هەربەهـەمان شـوێن دا ڕۆیـشت منداڵەكـە بێـدەنگ نـەبوو هـەردەگریا، بۆیـە دووبـارە بـە دایكەكەی ووت، منداڵەكەت بێدەنگ بكە، بەڵام بێ سود بوو، لە دوای سێهەم: جار كەماوەیەك ڕۆیشت و گەڕایـەوە منداڵەكە هەردەگریا، حـەزرەتی عومـەرﷺ خێرا ڕۆیشتە ژورەوەو بەتوڕەییەوە فەرمووی: بەڕاسـتی دایكێكـی خـەراپ‌و بێ بەزەیی، بۆ منداڵەكەت بێ دەنگ ناكەی ؟! ئافرەتەكە نـەی زانـی كەئـەوە خەلیفە (عومەرﷺ)ە بۆیە هاتە قسەو ووتـی: بەڕاسـتی برای بەڕێزو موسـڵمانم تۆ ئەم شـەو بێـزارت كـردم : ئـەدی بـۆ ئـەتۆ نـازانی سـەركردەی موسـڵمانان خەلیفـە (عومەرﷺ ) موچە (راتب) ناداتە ئەو منداڵانەی كە شیرە خۆرەن، ئەو منداڵـەش برسـیەتی و بـۆ شـیر وادەكـا، منـیش دەمـەوێ لـە شـیری ببڕمـەوە بـۆ ئـەوەی لـە خەزێنەی موسڵمانان موچەی بدرێتی؟!

حەزرەتی (عومەرﷺ) كە گوێی لەو ووتەیە بوو, دەم و چاوی تاریك هەڵگەڕاو بەرەو مزگەوت گەڕایەوە, كاتی بەیانی بوو نوێژیان بە جەماعەت دابەست، بەڵام (عبدالرحمن ی كوڕی عـەوفﷺ ) دە فـەرموێ : سـوێند بـەخودای گـەورە لەبەر شین وگریانی خەلیفە(عومـەر ﷺ) لەناو نوێژە كە یدا لەقورئان خوێنـدنی تـێ

نەدەگەیشتم .

لە دوای نوێژەکە خەلیفە( عومەرﷺ) دەستی پیرۆزی بە هەڵەو گەڕاوی بەرز کردەوەو زۆر بە شەرمەزاری وەل کەچییەوە هاواری دە کردو دەی ووت : ئەی بەد بەخت (عومەر) خودا چیت لێ بکات، دەبێ تاك و ئێستا چەند منداڵی شیرەخۆرەت کوشتبێ ؟ هێشتاخۆر دەرنەکەوتبوو فەرمانێکی دەرکرد، هەر منداڵێك کە لە دایك بوو لەوکاتەوە موچەی لە گەنجینەی موسڵمانان پێ بدرێت

## ﴿چاوپۆش و لێبوردەیی کۆمەڵگای ئیسلامی﴾

## ( سماحة المجتمع الأسلامی )

لە سەردەمی جێنیشینی خەلیفە حەزرەتی( ابو بکر)دا(ﷺ) حەزرەتی( عومەرﷺ) کرایە داد پرس و فەرمان ڕەوای ئاینی، ماوەیەکی زۆر بەداد پرسی مایەوە، کەس کێشەی نەبوو بڕواتە لای حەزرەتی (عومەرﷺ) داوای لە حەزرەتی( ئەبوبکرﷺ) کرد ئەی خەلیفە دەمەوێ لەسەر ئەوکارو پیشەم لابدەی و ئیشێکی ترم پێ بسپێری ؟ حەزرەتی (ئەبوبکرﷺ) فەرمووی: بۆچی ئەوکارو پیشەت زۆر گران و قورسە، توانات نیە بەڕێوەی بەری ؟

حەزرەتی (عومەرﷺ) یش فەرمووی: نەخێر ئەی جێ نیشی پێغەمبەری خوداﷺ من کە داد پرسم لە ناو کۆمەڵی موسڵماناندا هیچ ئیشێکم نابێت لەبەر ئەوەی موسڵمانی ڕاستەقینە دەزانن لەو دونیایەدا چی بەشێکیان هەیەو زیادە ڕۆیی ناکەن و، پێوستی سەرشانیان بەتەواوی بەڕێوە دەبەن و درێخی لێ ناکەن، وە ئە وەی کە بۆ خۆیان حەزی لێ بکەن بۆ برای موسڵمانیشیان پێ خۆشە و حەزی پێ دەکەن، وەکاتێ یەکێکیان دیار نەبوو بەدوای دا دەگەڕێن و هەواڵی دەپرسن و کە نەخۆشیان هەبوو بۆی دڵتەنگ دەبن و زیارەتی دەکەن و، کە هەژارو دەست کورتیان هەبوو یارمەتی دەدەن .

بەو شێوەیە بەتەنها ئاینەکەیان ئاگادارییانەو ئامۆژگارییان دەکات، وەڕەوشتیان فەرمان بە چاکەو دوور کەوتنەوە لە خەراپەیە : ئینجا بەڕاستی گەلێك کە ئەوە ڕەوشتیان بێت کێشەو ناخۆشی لەناویاندا ڕوو نادات .

## ﴿ شۆخ و شه نگی دۆستایەتی ﴾

### (حسن المعاشرة)

جارێك کابرایەك هات بۆ لای سەرکردەی موسڵمانان حەزرەتی( عومەری کوڕی خەتاب) (ﷺ) بۆ سکاڵا کردن لە دەستی خەراپی هاوسەرەکەی، ڕۆیشت ماوە یەك لە ماڵی خەلیفە دانیشت سەیری کرد حەزرەتی (عومەرﷺ) لەگەڵ خێزان و هاوسەرەکەی توڕەیە !، لە دڵی خۆیدا ووتی : خەلیفە لەگەڵ خێزانەکەی خۆی توڕەیە من باسی چی لەگەڵ دا بکەم ؟. واچاکە بڕۆم، کابرا هەستاو خواحافیزی کرد, سەرکردەی موسڵمانان فەرمووی : برای بەڕێزم وەرە چۆنی بوو هاتی و ئیشت چی بوو ؟کابراش بەبێ پێچ و پەنا ووتی : چیت لێ بشارمەوە ئەی خەلیفە ئەمن هاتم سکاڵای ڕەوشتی خەراپی هاوسەرەکەمت لەلا بکەم، بەڵام وەك و سەیر دەکەم ئەوبارو دۆخ و دەردەی کەمنی تێدام، تۆ خەراپ تری و ئە تۆش ناڕازی لە هاوسەرەکەت و توڕەی، بۆیە منیش نەم ویست هیچ بڵێم و، دەمەوێ بگەڕێمەوە ! حەزرەتی (عومەرﷺ) فەرمووی: ئەی برای شیرینم وەرە بابۆت ڕوون بکە مەوەو تێت بگە یەنم : هاوسەرەکانمان مافیان بەسەرمانەوە زۆرە ؟ هاوسەرەکانمان خواردنمان بۆ ئامادە دەکەن و, پۆشاکمان بۆ دەشۆن و, پێویستی و ئارەزومان بەجێ دینن و, منداڵمان بۆ بەخێو دەکەن و،وەچەندین کاری جوان و باشمان بۆ ئەنجام دەدەن, کە جارێکیش نارەوایەکیان کرد دەبێ چاو پۆشیان لێ بکەین، نابی هەرباسی خەراپەکەیان بکەین و, چاکەکانیش لەبیر بەرینەوە : ئەی برای بەڕێزم, بزانە لەنێوانی ئێمەو

ئەوان دا دوو ڕۆژ هەیە، یان ئەوان دەمرن و ئێمە لەدەستیان ڕزگارمان دەبێ و پشوو دەدەین، یان ئێمە دەمرین و، ئەوان لەدەستی ئێمە ڕزگاریان دەبێ و پشوو دەدەن، کابراکە بەو فەرمایشتەی حەزرەتی (عومەرﷺ) زۆر خۆشحاڵ بوو بەدڵێکی خۆش گەڕایەوە بۆ ماڵ، لە کاتێك دا کەڕۆیشت بۆلای حەزرەتی(عومەرﷺ) خەریك بوو لە بەر نائارامی و ناخۆشیدا دڵی دە پچڕاو دەتوایەوە .

## ﴿خۆ پارێزی ولەخوداترسانی سەرکردە﴾

## ( ورع الأمراء)

جارێکیان خەلیفەی موسڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب) (ﷺ) چاوی بە پارچەیەکی بچوکی ( بڕۆنزی زەرد) کەوت بەدەستی کوڕە بچوکەکەی، لەبەر بچوکی پارچەکە هیچ نرخێکی نەبوو، بانگی کوڕەکەی کردو ووتی: ئەو بڕۆنزەت لەکوێ بوو، کێ دایە ؟ کوڕەکەی ووتی: بابە لێپرسراوی خەزێنە دایمێ حەزرەتی (عومەرﷺ) هەر خێرا دەستی کوڕەکەی گرت و بەرەو لای لێپرسراوی خەزێنەی برد، زۆر بەتووڕەییەوە بە لێپرسراوی ووت : کێ پێی ووتی : ئەو پارچە بڕۆنزە بدەیتە کوڕی (عومەر) لێپرسراو بە خەلیفەی ووت : بەڕێز کۆگا(مەخزەن) م پاك دەکردەوە زێڕو, زیوو، گەوهەری زۆرم تێدا دۆزی یەوە، تەنها ئەو پاچە بچوکە بڕۆنزەم دۆزی یەوە کەڵکی هیچی پێوە نەبوو منیش دامە دەستی کوڕەکەت حەزرەتی (عومەرﷺ) کە گوێی لە وتەی لێپرسراو بوو بە تەواوی ڕەنگی تێك چوو تورە بوو، زۆر بە تووڕەییەوە ووتی: هەی دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات هەموو موسڵمانانت بەتاڵی کردوتەوە : کەست نەدیتەوە شتی نارەوای دەرخوارد بدەی بیخوات تەنها ماڵی( عومەر)ی نەبێت, هانێ‌خێرا بیگرەو لە جێگەی خۆی دابنێوە .

## ﴿ بۆگە نجینەی موسلمانان ﴾

(إلى بيت مال المسلمين )

ڕۆژێـك سـەرکردەی موسـڵمانان( عومـەری کـوڕی خـەتاب ) جەولەیـەکی گەڕانی بەناو حوشتری خێریْ داکرد، لەناو حوشترەکاندا حوشترێکی زۆر قەڵەو جوانی بەرچاوکەوت، پرسـیاری کـرد ئـەو حوشـترە ئیکـیْ یـە ؟ ووتیـان: ئـەی خەلیفـە( عومـەر) ئـەوەئی عبـدالله ی کوڕتـە، حـەزرەتی( عومـەر) بـانگی( عبـدالله) ی کـردو ووتـی: ئـەو حوشـترەت بەچـەندی کڕیـوە ؟ عبـدالله ووتـی: بەوەنـدە (مبلـغ) پـارەم کڕیوە،حـەزرەتی (عومـەر) فـەرمووی: ئـەوە پـارەی حوشترەکەت دەبیْ ئەو حوشترە بۆ خەزێنـەی موسـڵمانان بیْ ؟(عبدالله) ش ووتی: لەبەرچی ئەی بابە چۆن وادەبیْ ؟ حـەزرەتی( عومـەر) فـەرمووی : لـە بەر ئەوەی ئەو حوشترە ئی تۆیـەو کومـەڵانی خـەڵکیش دەڵێن ئەو حوشـترە ئـی کوڕی سەرۆکی موسـڵمانانە باشـی بلـە وەرێنن وخۆراکیباش‌و, ئاوی بدەن و ماندوی مەکەن، بەوشێوە زۆر بە جیاوازی سەیری دەکەن, بۆیە منیش دەمـەویْ لێتی بکڕمەوە بائەوجیاوازیە لەگەڵ ئەوانی تردا دروست نەبێت, ئەوە پارەکـەت حوشترەکە بۆخەزێنەی موسڵمانان بێت.

## ﴿ پێشەوای هوشیارو ڕێنیشان دەر﴾

(إمامة راشدة)

دەگێڕنـەوە ڕۆژێکیـان حـەزرەتی(عومـەر) کـە سـەلامی نوێـژی عەسـری دایەوە، سەیری کرد یەکێك لە هاوەڵەکانی ئامادەی نوێژ نـەبوو، لـە هاوەڵەکانی پرسـی هـۆی چیە فلانـە کـەس ئامـادەی نوێـژی بەکۆمـەڵ (جماعـە) نـەبووە ؟ هاوەڵـەکان ووتیـان : ئـەی سـەرکردەی موسـڵمانان، نەخۆشـە ؟ حـەزرەتی

(عومەرﷺ) بەرەومالّی هاوەڵەکەیان ڕۆیشت بۆ دیدەنی و هەوالّ پرسینی، لە دەرگـای دا ؟ کـابرا ووتـی : کـێ یـە لـەدەرگا دەدا ؟،حـەزرەتی ( عومـەرﷺ) فەرمووی: منم عومەری کوڕی خەتاب، کابراش خێرا بەپەلە ڕۆیشت و دەرگـای کردەوە :حەزرەتی عومەر چاوی بە کابرا کەوت، فەرمووی: هابرام چۆنی بوو لە نوێـژی بەکۆمـەڵ دوا کـەوتی و نـەهاتی بۆنوێـژ ؟ بۆچـی وەلاّمـی ئـەو خودایـە گەورەیـەت نەدایەوە کە لە سەروی حەوت ئاسمانـەوە بـەدەنگی بەرز بانگی لێ کردی ؟، بە ووشەی (حی على الصلاة)، یانی بەگورجی وەرە بۆ گەورەیی نوێژ بـەلاّم بەداخـەوە : وەلاّمـی بـانگی خـوات نەدایـەوە، بـەو هـەموو گـەورەیی و مهرەبانیـەی بانگی لێ کردی : کەچی وەلاّمـی (عومـەر) دەدەیـەوەو پێشوازی لێ دەکەی ؟!! .

## ﴿ کۆشش وخەبات و ئارەزوو﴾

## (عمل ونية)

جارێکیـان ژن و مێردێك دووهاوسەری یـەکتری کێشەیەکی ناڕێك و جیاوازی دەکەوێتـە نێوانیان،خەبـەر دەدەنـە حـەزرەتی( عومـەرﷺ) بـۆ چارەسـەری ئـەو کێشەیە : حـەزرەتی ( عومـەرﷺ) یـش خێرا دووکەسـی بـانگ کـرد, یـەکێك لـە خزمی پیاوەکەو, ئەوی تریش لەخزمی ژنەکـەی، بـۆ ئـاشتی و ڕێك خستنەوەی بـەینی ئەودووهاوسـەرە ژن و مێـردە، لـە دوای ماوەیـەك هـەردوو کەسـەکە گەڕانەوە بـۆ لای حـەزرەتی (عومەر ﷺ) ووتیـان: ئـەی سـەرکردەی موسڵمانان زۆرمـان هـەوڵ دا بـەلاّم بـێ سـوودبوو،حەزرەتی( عومـەرﷺ) داردە سـت و گۆپـاڵ(عـصا)ێکـی هـەبوو بـەناوی ( دوررە ) بـەرزی کـردەوەو دەسـتی کـرد بەلێدانی ئەو دوو پیاوە ووتیان : ئەی سەرکردەی موسڵمانان بۆ لێمان دەدەی تاوانمـان چیە ؟ حـەزرەتی ( عومـەرﷺ) فـەرمووی: ئەگـەر ئێـوە دڵ و دەروونتـان

پاك بوایەو, نیازو نییەتی ئاشتیتان ببوایە، خودا ئاشتی دەخسستە نیوانی ئەودووهاوسەرە هەروەك و خودا دەفەرموێ:

﴿ إِن يُرِيدَا إِصْلَاحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً﴾ النساء/٣٥

واتە: ئەگەرناخۆشی کەوتە نێوان هاوسەران ژن ومێردەوە پێویستە لەسەر فەرمان ڕەوایانی وڵات : یان لەسەر ئەوانەی کە دە توانن ئیش بەڕێوە بەرن،خێرا فەرمان ڕەوایەك لەخزمی ژنەکەو فەرمان ڕەوایەك لەخزمی پیاوەکە بنێرن بۆ نێوان کردنو، ئاشت بوونەوەی ئەو ژنو پیاوە، بۆیە دەبێ خزمی ژن و پیاوەکە بنێرن، چونکە ئەوان چاکتر دەزانن چۆن چارەسەری نێوانی ئەو دوو هاوسەرە دەکرێو, کێشەکەیان چییەو, خەراپو تاوانی کامەیانە، وە ئەگەر ئە و دوو فەرمان ڕەوایانە ئارەزویان لەڕێك خستنی نێوانو بەینی ئەو ژن و مێردە بێ : ئەوا خودا بەئاسانی ڕێکیان دەخات .

## ﴿خۆشەویستی یارانی پێغەمبەر ﷺ ﴾

## ( محبة الصحابة )

دەگێڕنەوە جارێك حەزرەتی( عومەرؓ) دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ شکایەت لە حەزرەتی عەلی ؓ دەکات و دەفەرموێ: ئەی نێردراوی ڕاستە قینەی مرۆڤایەتی نازانم هۆی چیە ؟ هەر چەند جاری دەگەمە عەلی ئەمن سەلامی لێدەکەم : جارێك ئەو سەلام لەمن ناکا ؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەدوای حەزرە تی( عەلی) دا نارد، حەزرەتی( عەلیؓ) خێرا بەدوای بانگەکەی پێغەمبەرداﷺ گەیشتەجێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی : ئەی عەلی هۆی چیە هەر دەبێ حەزرەتی (عومەرؓ )سەلامت لێ بکا،جارێك نییە تۆ سەلام لە ئەو بکەی ؟ حەزرەتی (عەلی)ش فەرمووی : گیانم بە فیدات بێت ئەی ڕەسولی خودا بۆ خۆت فەرمووتە: هەر کەسێك لە پێشەوە سەلام لەکەسێکی تر بکات

خـودای گـەورە خانوبـەرەی خۆشـی بـۆ دادەمـەزرێنی لـە بەهەشـت دا، منـیش دەمـەوێ ئـەو خـانو قەسـرەو باڵخانـە خۆشـانە ببێتـە بەش‌و نـسیبی حـەزرەتی عومەرﷺ، بۆیە من سەلامی لێ ناکەم لەپێشەوە .

## ﴿ سەردانێك لەماڵی حەزرەتی عومەر ﷺ﴾

## (زيارة لبيت عمرﷺ)

دەگێڕنـەوە (حوزەیفـەی کـوڕی یـەمانﷺ) دە فـەرموێ : کۆمـەڵێك لـەلای سـەرکردەی موسـڵمانان ( عومـەری کـوڕی خـەتاب ﷺ) دانیـشتبوین حـەزرەتی (عومـەرﷺ) فـەرمووی : کـێ لـە پێغەمبـەری بیـستوە کـە باسـی ئـەو هـەراو ناخۆشـیەی کـردووە کـەوەك‌و شـەپۆلی دەریـا شـەپۆل دەهاوێـت، (حوزەیفـەی کوڕی یەمانﷺ) لە دە وری پێغەمبـەردا ڕاز شێرەوەی نهێنـی پێغەمبـەر بـوو ( امـين الـسر ) فـەرمووی : ئـەی سـەرکردەی موسـڵمانان مـن لـە پێغەمبـەرمﷺ بیستووە دەی فەرموو:

( تعـرض الفتن عـلى ا لقـلوب كما تعـرض الحصير عـودا فأيما قلـب انكرهـا نكـت فيـه نكتة بيضاء، وأيما قلب أشربها نكت فيه نكتة سوداء حتى تكون على قلبين عـلى ابـيض مثل الصفا لا تضره فـتنة مادامت السموات والارض وعـلى اسود مرباد مثل الكـوز مجنيـا لا يعرف معروفا ولا ينكر منكرا ا ما اشرب من هـواه ) مسلم : ٢-٨

واتە: ئاژاوەو فیتنە دادەبارێتە سەر دڵان، هەروەك‌و چۆن حە سیر قـەف قـەف دەکەوێتە سەریەك، ئینجا هەردڵێك ئەو بەڵاو ئاژاوەیـەی لـەلا نـاخۆش بـێ ئـە وا نوقتەیـەکی سـپی درەوشـاوە لەسـەر دڵـی تۆمـار دەبـێ، وە هـەردڵێکیش ئەوئاژاوەی خۆش بوێ و ئارەزوی بکات ئـەوا نوقتەیەکی ڕەشـی تاریك لەسـەر دڵێ تۆمار دەبێ، لـە ئـەنجام دا وەك‌و دوو دڵـی لێدێت، ئـەو دڵـەی نوقتـەی سپی لەسەر تۆمار دەبێ ئەوە زۆر جوان و درەوشاوەیە وەك بەردێکی سـاف و سپیو

لوس وەهایە هیچ شتی پێوە نە نوسابێ، وە هیچ کاتێ هەرگیزاو هەرگیز هەتا ئەرزو ئاسمان بمێنی توشی ئاژاوەو ناڕەحەتی نابێت، وەئەو دڵەی کە نوقتەی ڕەشی لەسەر تۆمار دەبێ دزێوو دێزو بۆزو ناشرینە وەك و گۆزەی خوار کراوە یە بەهیچ جۆرێ خێری تێدانامێنێ تەنها هەوایەکی بۆشی بێکەڵك و بێسود, چونکە نەچاکە دەزانێ بیکا, وە نە ناڕەواش دەزانێ خۆی لێ بپارێزێ .

وە هەر بەوجۆرە پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکی تردا کە مانای ئەو حەدسیەی پێش و دەگەیەنێ دە فەرموێ :

( بادروا بالاعمال الصالحة فلتكونن فتن كقطع الليل المظلم يصبح الرجل مؤمنا ويمسى كافرا او يمسى مؤمنا ويصبح كافرا يبيع دينه بعرض من الدنيا )مسلم -١-٤٩٧.

واتە: تاڵوکە بکەن بۆ کردەوەی چاکە، زۆر نزیکە کە توشی بەڵاو ئاژاوەیەك بین وەك و بەشێکی تاریکە شەو : بەیانی ئینسانێکی موسڵمان و باوەڕدارە بەڵام ئێوارە کافرو بێ باوەڕە وەیان ئێوارە بڕوادارە و, بەیانی بێ باوەڕە ئینسان دین و ئاینی دەفرۆشێ بەکەل و پەلێکی کەمی ژیانی دونیا .

لەدوایی دا (حوزەیفەرضي الله عنه) فەرمووی: داوام لە کۆمەڵوگەلی موسڵمانان ئەوەیە بەتێکرایی لە فەرمان و گوێ ڕایەڵی دابن و هەست و هۆشیان بە مێشکێکی پاراو پڕ حیکمەتی ئیمان ئاگاداربێ لەدوژمنان و ناحەزانی ئیسلام, ئەمجار ڕوی کردە حەزرەتی( عومەررضي الله عنه) وفەرمووی:

ئەی سەرکردەی موسڵمانان لە پێغەمبەرم بیستووە لە نیوانی تۆو ئەو ئاژاوە گەورەیەدا یەك دەرگا هەیە ئەویش نزیکە بشکێ ئەو دەرگایەش حەزرەتی(عومەررضي الله عنه)ە کە دەرگایەکە شکابەڵاو ئاژاوە دا دەباری حەزرەتی( عومەررضي الله عنه) فەرمووی: ئەی حوزەیفە ئەو دەرگایە دەشکێ یان دەکرێتەوە ؟ ئەگەر بکرێتەوە چاری هەیە دە توانرێ پێوە بدرێتەوە، بەڵام حوزەیفە ووتی : نەخێر ئەو دەرگایە ناکرێتەوە بەڵکو دەشکێنرێ، ئینجاپێویستی کۆمەڵانی

## دۆستی باوەڕداران

خەڵكی موسڵمانە هەر لەدوورو بەرزیانەوە هەتا نزیك ونزمیان زۆر چاك بزانن كە ووتمان : دەرگاكە حەزرە تی( عومەرﷺ ) بووئەویش شهید كرا لە جەماعەتی نوێژی بەیانیدا، وە لەو كاتەشەوە بەڵاو ئاژاوە داباری ئەوەی كەشەهیدیشی كرد ئاگر پەرستێك بوو .

ئەو كۆمەڵەی كە هەستان بۆ پیلان گێڕان،بۆ شەهید كردنی خەلیفە( عومەرﷺ) كۆمەڵێكی نهێنی بوون بە سەرۆكایەتی كابرایەكی گاور كە بە ئاشكراو لەبەر چاوان موسڵمان بوو: بەڵام لەدڵدا بێباوەڕ بوو ئەویش:( عبدالله ی كوڕی سەبەء) دوو ڕوو (منافق) بوو .چەند كۆمەڵێكی لە ئاگر پەرست و، گاورو، جولەكە و، بێ بڕواكانی كەدا بەنهێنی كۆ كردەوە، بە هەموویان پیلانێكیان ڕێك خست یەكێكیان دیاری كرد بۆ هەستان بەو پیلانو تاوانە گەورەیە، بەناوی ( ئە با لوء لوئە ) ی ئاگر پەرست بۆ كوشتنی خەلیفە عومەرﷺ كە لە جەماعەتی نوێژی بەیانیدا شەهیدی كرد .

حەزرە تی عومەرﷺ پێشی لێدانی بەچەند ڕۆژێك خەوێك دەبینێ لەخەوەكەیدا پێغەمبەر (ﷺ)بەحەزرەتی عومەر دەفەرموێ:

(سیبكی الإسلام علی موتك یاعمر وانت سراج الإسلام یاعمر)

واتە: لەمەو دوا كۆمەڵی موسڵمانان بۆ مردن و جودا بونەوەی تۆ دەگریەن ئەی عومەر بەڕاستی ئەتۆ چراو ڕووناكی دینی اسلام بووی ڕۆژێكی هەینی حەزرەتی عومەرﷺ ڕۆیشتە سەر منبەرو بەیارەكانی فەرموو: برا موسڵمانەكانم لە خەوم دا كە لەشێرێك سێ دەندوكی لێ گرتم،بزانن كەئەوە نیشانەی كۆتایی تەمەنمە : كەڵەشێریش لە خەودا بەندەیەكە عەرەب نەبێت، ئینجا هەر نەتەوەیەك بێت، وە دەندوك لێدانی كەڵەشێریش لەخەودا مانای لێدانی خەنجەرە . دوایی حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی : برا موسڵمانەكان ئەگەر ئەمن مردم بزانن خودای گەورە ئەو دینە پاكە نافەوتێنی و، ئەو سپاردە گەورەیە كەخودای گەورە پێغەمبەریﷺ بۆ ڕەوانە كردووە بۆ ڕاگەیاندن بە

## دۆستی باوەڕداران

بەرەی ئادەمیزاد هەر دەمێنیٚ و نافەوتیٚ، لەدوای خوێندنەوەی ئەو ووتارە کە ڕۆژی هەینی بوو :

لەدوای پێنج ڕۆژ لەبەرە بەیانی ڕۆژی چوارشەمەدا لە ناو نوێژی بەیانیدا سیٚ خەنجەری لەژێر ناوکیەوە لیٚ درا : حەزرەتی عومەرﷺ ویستی بە برینداریش نوێژەکەی تەواو بکات, بەڵام توانای ڕاوەستانی نە مابوو: بۆیە بانگی (عبدالرحمن ی کوری عەوفیﷺ) کرد نوێژەکەی بۆ تەواو کردن،

لە دوای نوێژ حەزرەتی عومەریان هەڵگرت و بەرە و ماڵەوە بردیانەوە خوێنی بەتاواوی لە لەشەی دا نەمابوو هێزوتوانای کەمببوو هۆشی لەخۆی نەما بوو، بەڵام باموسڵمانان زۆر چاك بزانن کە لێدانی حەزرەتی عومەرﷺ تەنها عومەر نەبوو بەس، بە ڵکو لێدانی دینی سەربەرزی ئیسلام بوو : وە خوێن ڕژانی عومەرﷺ ڕژانی خوێنی اسلام بوو .

وە دوژمنانی اسلام هیچ کاتێك نا یانەویٚ دینی اسلام پەرە بستێنیٚ و گەشە بکات چونکە لەگەڵ بەرژەوەندیە پوچەکەیان دانا گونجیٚ : دەیانەویٚ دینی اسلام بکەنە چەکی چەوسانەوەی نەتەوە هەژارەکان : بۆیە هەردەم هەوڵی نەمانی دەدەن لە هەموو لایەکەوە،

وە پێوستی سەرشانی هەموو موسڵمانانە کە هەست بە دووژمنانی اسلاموئینسانیەت بکەنوخۆیان بکەن بە دڵوپێك خوێن بۆ پاراستنی و : فراوانی ئەو دینە پاکو ڕاستە کەبەخەم مرۆڤایەتیەوەیەو ئابڕو پارێزو ڕێزدانەری ئادەمیزادە . ئینجا دوای ئەوەی کە خەلیفە عومەرﷺ هۆشی هاتەوە بەر فەرمووی : کیٚ منی کوشت ؟ هاوەڵەکانی فەرموویان : ( نە بو لۆلۆە ی ) ئاگر پەرست، حەزرەتی (عو مەرﷺ) کە گوێی لەو وتەیە بوو خێرا سەری خستە سەر خاك و کڕنۆشی شوکری بۆ خودا برد و فەرمووی : سوپاس بۆ خودای گەورە کە بەدەستی موسڵمانان نەبوو . وە داوای لە خودای کرد کە خودا پاداشتی بداتەوە لە ڕۆژی دوایی دا .

هەر لەوکاتەدا کەخوێنی بەردەوام لەبەر دەهات و دەڕۆیشت و نەدەوەستا بە ( عبدالله ی کوڕیﷺ) ووت: سەرم لە سەر ئەو سەرینە دابگرە بم خەرە سەرزەوی : بەڵکو خودا چاوێکی بەبەزەی و مهرەبانیم لێ بکات و گیانم دەرچێت !!. بەو شێوەیە حەزرەتی عومەرﷺ گیانی شیرینی بەخاك سپارد هەزاران جار ڕەزای خودای لەسەر بێ، وە ماوەی خەلافەت و جێنشینی حەزرە تی عومەرﷺ: دە ساڵ و شەش مانگ و چوار ڕۆژ بوو .

## ﴿ ئێمە بەو شێوەیە بووین ﴾

## (هكذا كنا)

برای خوێنەری موسڵمان ئەو نامەیە بخوێنەوە و بیر بکەوە،کەچۆن دووژمنانی اسلام لە هەموو کات و سەردەمێك دا هەر چۆنێك بۆیان ڕێك بکەوێ و دەرفەتیان بۆبرەخسێ بەفیڕۆی نادەن و هەوڵ دەدەن بۆ پێشکەوتنی وڵاتەکەیان،بەهەر نرخ و جۆرێك بێت، لە (جۆرجی) دووەمەوە سەرۆکی ئینگلتەرەو،گاڵو، سویدو، نەرویجەوە، بۆلای خەلیفەی موسڵمانان :خاوەنی ڕێزو شکۆ:( هوشامی سێهەم)، لە ئەندەلوس دا، لە دوای پێشکەش کردنی سوپاس وڕێزمان، بۆمان دەرکەوت و زانیمان ئەوهەموو پیشە سازی و زانیارییەی کە وڵاتەکەتانی ڕازاندوتەوەو، لەژێر سێبەری زانیاری دا دەژیەن، ئێمەش ویستمان کە ئەندازەیەك لەو ڕووناك و ڕۆشنایەی ئێوە بەهرەیەکمان بەربکەوێ، وە ببێتە یەکەم ڕێگە بۆ ڕازاندنەوەی وڵاتەکەمان لەلایەن بەڕێزتانەوە کە بەڕاستی لە هەر چوارلامانەوە نەزانی و تاریکی و دوا کەوتوویی وڵاتەکەمانی داگرتووە : ئەوا هێندێك لەلاوەکانمان دەنێرینە خزمەتی بەڕێزتان :یەکێ لەو کەسانە کچی براکەم خات و( دۆبات )ە سەرپەرشتی کەری ئەو کۆمەڵە ئافرەتانەیە کە لەگەڵیاندایە؟! وە بەڕاستی ئەو ئافرەتانە کەدێنە لاتان لە

بنە ماڵەیەکی بەشەرەفی ( ئینگلتەرەن ) هیومان بەبارەگای بەڕێزتانە کە ئێوەش ڕێزیان لێ بنێن و پارێزگاریان بکەن :وە دیارییەکی کە میشمان لە گەڵ خات و ( دۆبانت) دا بۆ بەڕێزتان ڕەوانە کرد : هیوامان وایە کە لەگەڵ ڕێزو سوپاسیشماندا وەری بگرن .

کار گوزارو فەرمان ڕەواتان جۆرجی دووەم

پادشای ئینگلتەرەو گال و سویدو نەرویجەوە

## ﴿ ڕوداوێك لە ئوحد ﴾

### (مشهد من احود)

یەکێك لەو موسڵمانانەی کەلە کێوی ئوحد شەهید کرا بوو ( عبدالله کوڕی عومەر ﷺ)ی باوکی جابر بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی جابر مزگێنیەکت بدەمێ ؟، جابر ووتی: ئەی نێردراوی خودا مزگێنی تۆ هەر خێرو چاکەیە : پێغەمبەرﷺ فەرمووی :ئەی جابر:خودای گەورە فەرمایشتی لەگەڵ کەسدا نە کردووە بەبێ پەردە،بەڵام لەگەڵ باوکتدا بەبێ پەردە فەرمایشتی لەگەڵ کردووە !!.

خودای گەورە پێی فەرمووە : ئەی عبدالله چیت دەوێ داوام لێ بکە پێت دەبەخشم ؟ عبدالله ش فەرمویەتی ئەی خودایە بمگەڕێنەوە بۆ دونیایە بۆ ئەوەی بەهاوە ڵەکانم ڕابگەیەنم بۆ ئەو هەموو پاداشت و چاکەیەی پێت بەخشیوم، وە بۆ ئەوەش کەجارێکی تر لەڕێگەی بەرزی دینی پیرۆزی ا سلام دا بجەنگم و شەهید بکرێمەوە، خودای گەورە فەرموویەتی: ئەی عبدالله من لە پێشدا پەیمانم داوە هەر کە سێك لەو دونیایەدا کۆچی کرد جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ دونیا؟!. وە منیش نابێ پێچەوانەی پەیمانم بجوڵێمەوە، عبدالله فەرمووی: ئەدی خودایە کێ هەوا ڵیان پێ ڕا دەگەیەنێ کەلەناو پاداشت و

بەخشیشی تۆدا دە سوورێمەوە،؟ خودای گەورە ئەو ئایەتەی بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ نارد کە دە فەرموێ : ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ{١٦٩} فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ{١٧٠}﴾ ال عمران:١٦٩/١٧٠

واتە : ئێوە گومان وا مەبەن کە ئەو کە سانەی لەڕێگەی خودا دا کوژراون وشەهید کراون مردون، نا وانیە نەمردون بە ڵکو ئەوانە زیندون و خۆراكو خواردنیان لە لایەن خوای گەورەوە بۆڕەوانە دەکرێ وەشادمانو کەیف خۆشن بەوەی کەلەلای خوداوە بە گەورەیی خۆی پـێی بەخشیون وە مزگێنی بەوانە دە دەن کە لەدوای ئەوانەوە ماون و نەگەیشتونە ئەوجێگەی ئەوان، ئەو مژدە یان پێ دەدرێ کە هیچ ترس و بیمێکیان لەسەر نیەو دڵ تەنگو ناڕەحەتیش نابن .

## ﴿ یەك چاکە بەدەیە﴾

## (الحسنة بعشرة)

لەسەردەمێك کەنەهاتی و گرانی بوو کۆمەڵانی خەڵك پێویستیان بە خواردەمەنی هەبوو، لەوکاتی نەبوونی و قڕیو نەهاتیەدا، ڕۆژێك لە ڕۆژان کاروان و بارگەیەکی زۆری خواردەمەنی حەزرەتی( عوسمان ﷺ) لە شامەوە گەیشتە مەدینە کە زۆربەی خورماو ڕۆن و، زەیت و، مێوژ، بوو خێرا بازرگانو بەکۆمەڵ (جملە) فرۆشەکانی شار لەو بارگەو بارخانە کۆ بوو نەوەو ووتیان : ئەی (عوسمان ﷺ ) ئەو شتانەمان پێ بفرۆشە لەباتی هەر درهەمێك دوو درهەمت دە دەینێ یانی نیواو نیو خێرو قازانج، حەزرەتی( عوسمان ﷺ) فەرمووی :ئەوە ئێوە دەڵێن چی زۆر لەوەی ئێوە زیاتریان داومێ، بازرگانەکان ووتیان :باشە لەباتی هەر درهەمێك پێنج درهەمت دەدەینێ ؟! یانی پێنج هێندی سەرمایەکەی خۆی، حەزرەتی (عوسمان ﷺ) فەرمووی :ئاخر لەوەش

زیاتریـان داوامـی:؟ لـەباتی هـەر درهـەمێك دە (١٠) درهـەمیان داوامـیَ ؟!یـانی دەهێندەی سەرمایەکەی خۆی .بازرگانو توجارەکان ووتیان: باشە یاعوسمان هەرچی بازرگانو توجارو کۆمەڵ فرۆشی شارە هەمووی لێرە کۆ بووینەوە کێیە ئەو ئەندازە خێرو قازانجەی داویی یە ؟ حەزرەتی عوسمانیش‌ﷺ فەرمووی : برایـان ئـەو ماڵـەم بـەخودا فرۆشـتوە؟ پێغەمبـەری خـوداﷺ فەرموویـەتی: چاکەیەك بە دەچاکەیە .

## ﴿ لەو کەسانە مەبن ﴾

## (لاتکن منهم)

حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالب ﷺ)دە فەرمویَ: لەو جۆرە کەسانە مەبن، کەوتـەو گوفتاریـان وتـەی خۆ پارێزانـەو، کـردەوە کانیـشیان کـردەوەی ئـارەزو مەندانـە، پیـاو چـاکیان خـۆش دەویَ و ڕەفتـارە کانیـان بـەجیَ نـاهێنن، تـاوان باریان ڕق لێدەبێتەوە،بەلاّم بۆ خۆشیان تاوان بارن و تاوان دەکەن، لە خۆشی و ئارامیدا فیزو هـەوا لێدە دەن و، لـەکاتی ئاژاوەو تـوش بوونی بـەلاَ نائومێـد و سەر گەردان دەبن،

لەکاتی تـوش بـوونی ناخۆشـی بـەمل کەچیەوە لـە خـودا داوا دەکـەن وە لـەکاتی خۆشـیش خـودا لـە بـیرو فـەرامۆش دەکـەن : ئـەوەی کـەمێك توانـاو دەسـەلاّتی بەسەر کەسێکدا بوو, خۆی بەسەردا زالَ دەکات و, بەژێردەستی خۆی دەزانـیَ: ئـەوەی بـەبیرو بـاوەڕی ڕاسـتی وەری گرتـووە کـەڕێبازی ڕاسـتە, وازی لیَ دێنـیَ, باسـی پەنـدو بەسـەرهاتو بـەئاگا هاتنـەوە دەکـات، بـەلاّم پەنـد وەرنـا گرێـت ئامۆژگاری خەڵك دەکات و بۆخۆی ئامۆژگاری وەرناگریَ، بە ووتە هەموو شتێك دەکات،بـەلاّم بـە کـردەوە نایکـات، تـاوانی بـچوکی خـەڵکی لـەلا گەورەیـە، بـەلاّم تـاوانی گـەورەی خـۆی لـەلا زۆر بـچوکە، کـردەوەو خوداپەرسـتی زۆری خـەڵکی

بەکەم سەیر دەکاو، کردەوەی کەمی خۆی بەزۆر دەژمێری، بۆکردەوەی چاکی خەڵکی توانج و پلاری زۆرە، بەلام لە کردەوەیخەراپی خۆی ڕازیو بێ باکە: ڕابواردن و گاڵتەو گەپی پیاوی گەورەی دونیایی زۆر پێخۆشترە لە زیکرو یادی خوای گەورە, لەگەڵ هەژاراندا، فەرمانی ناڕەوا بەسەر خەڵکدا دەدا : بەلام فەرمانی ڕاستی خەڵکی بەرامبەر بەخۆی گوێ ی پێ نادات، ڕێگەی بۆ خۆی دەست نیشان دەکات، بەلام خەڵکی هەڵدە فریوێنێ، گوێی بۆ ووتەی بێ کەڵکی خەڵك دەگرێ بەلام گوێ لە ووتەی فەرمانی ڕاستی خودا ناگرێ و،خۆی کەڕ و لاڵ دەکات، مافی خۆی لە خەڵك وەردەگرێ بەلام، مافی خەڵکی لەسەر خۆی گوێی پێنادا، لە کردەوەی خەراپی خۆی بەرامبەربە خودا ناپارێزێ، بەلام لە خەڵك خۆی دەپارێزێ، وەلە خودا ناترسێ بەهۆی کردەوەی خەراپیەوە، بەلام لەخەڵك دەترسێ .

## ﴿ دادپرسی موسڵمانان فەرمان بەسەر سەرکردەکانیان دا دەکەن ﴾

## ( قاضي المسلمين يقضي علـى أميرهم)

جارێکیان سەرکردەی موسڵمانان حەزرە تی (عەلیﷺ) لەناو بازاڕدا چاوی بەگاورێك کەوت زرێیەکەی خەلیفە عەلی پێ بوو ؟ حەزرەتی عەلیش ﷺخۆی لێ ئاشکرا کردو داوای زرێیەکەی کردەوە و ووتی : برام ئەو زرێیە ئی منەو بمدە وە بەلام : گاورەکە ووتی: ئی تۆنیەو نات دەمەوە، حەزرەتی عەلیﷺ چەندی لەگەڵ گاورەکە کرد زرێیەکەی نەدایەوە بەناچاری کێشەکەیان گەورە بوو بردیانە لای داد پرسی موسڵمانان کە ناوی (شوڕە یح ) بوو، دادپرسی سەرکردەی موسڵمانان فەرمووی : چیتان هەیە پێم بڵێن: حەزرەتی عەلیﷺ هاتە وەلام ووتی: ئەی دادپرس ئەو زرێیەی بەدەستی ئەو گاورەوەیە ئیمنە داوای دەکەمەوە ؟ گاورەکەش ووتی : زرێی خۆمەو ئی ئەو نیە، (شوڕەیح ) ی

دادپرسیش فەرمووی : ئەی سەرکردەی موسڵمانان سوێند بەخودا تۆ ڕاست دەکەی ئەو زرێیە ئی تۆیەو منیش دەی ناسمەوە، بەڵام دەبێ بچی دوو شاهید ئامادە بکەی کەبێن و شاهیدی بدەن کە ئەو زرێیە ئی تۆیە, حەزرەتی(( عەلیشﷺ ) ڕۆیشت دوو شاهیدی ئامادە کرد حەزرەتی (حەسەنی کوڕی) و بەندەیەکی بەناوی ( قەمبەر) هەردووکیان شاهیدیان دا کە ئەو زرێیەی بەدەستی ئەو گاورەوەیە ئی حەزرەتی عەلیە ﷺ، داد پرسی موسڵمانان هاتە وەڵام و فەرمووی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان ئەوا شاهیدی بەندەکەت قەمبەر وەر دە گرین بەڵام شاهیدی حەسەنی کوڕت وەر ناگیرێ، حەزرەتی عەلیﷺ فەرمووی: ئەی داد پرس چۆن وەرناگیرێ ؟، ئەی دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، ئەدی نەت بیستووە لە حەزرەتی عومەرەوەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: حەسەن و حوسێن گەورەو لاوی دانیشتوی بەهەشتن!! داد پرس فەرمووی : بەڵێ دەزانم بەڵام چونکە کوڕتە بەشاهیدی وەرناگرم، ئەمجار داد پرس بە گاورەکەی ووت: ها ئەوە زرێیەکەت و بڕۆ، گاورەکە زرێیەکەی هەڵ گرت و ڕۆیشت، لە ژێرەوە بەخێسە سەیری حەزرەتی عەلی و (شوڕەیح)ی داد پرسی دەکرد دەی ووت: بەڕاستی زۆر چاکم کردن بە دوژمنی یەکتری بەڵام ئادەمیزادی موسڵمان لە هیچ کاتێك ناگۆڕێ‌و دڵ تەنك نابێت, بۆیە لەدوای تەواوبوونی دادگاکە هەردووکیان دەستیان لەملی یەکتر کردو یەکتریان بەخۆوە کوشی، کە گاورە کە ئەوەی دیت گەڕایەوەو چووە پێشەوە بۆلایان‌و ووتی: سوێند بەخودا ئەو زرێیە ئی تۆیە ئەی سەردام عەلی ئەمن لە دواتەوە دەڕۆیشتم لێت کەوت و منیش هەڵم گرتەوە ئاگات لێ ی نەبوو، بەڵام بۆیە نەم دایەوە ووتم با بزانم ڕەوشتی موسڵمان چۆنە ؟!، بەڕاستی ئێستا بۆم دە رکەوت کە ڕێبازی اسلام جوانترین ڕێبازە و هەرکەس بەو ڕێبازەدا بڕوا هیچ کات سەری لێ تێك ناچێت، بەڕاستی اسلام بە دادو مهرەبانە، چۆن سەرکردەی موسڵمانان لەگەڵ بێ باوەڕێکی وەك مندا لەبەر دەستی داد پرس ڕادەوەستێ و کاتێك

کەشــتەکەش ئیخــۆی بێــت بــەڵام کەبەڵگــەی تــەواوی نــەبوو دە دۆڕیۆ و بــە فەرمانەکەشی ڕازی یە، شوکر بۆ خودا ڕێگەی ڕاستم دۆزیەوە .

(ا شهد ان لاإله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله)

لــەدوایی حــەزرەتی عــەلیﷺ فــەرمووی : مــادام تــۆش موســڵمان بــووی : لەخــەڵاتی ئــەوە دا زریێ و وڵاخەکەشــم پێــشکەشت بێــت، وە موچــەیەکی باشیشیان لــە گەنجینــەی موسڵمانان بۆ بڕیــەوە : بەڕاستی دینــی ســەر بەرزی اسلامی وەرگـرت و لەگـەڵ هـەموو کـۆڕو کۆمـەڵێکی موسـڵمانان ئامـادە دە بـوو هەتا لەجەنگی سەفین شهید کرا .

## ﴿ گاڵتە لەگەڵ خۆگرتن لەڕاستی ﴾

### (المزاح مع التزام الحق)

زیادی پادشای موسڵمانان نەخۆشیەکی پڕ مەترسی توش هـات (شـوره یـح) ی داد پـرس بـۆ هـەواڵ پرسـینی ڕۆیـشت بـۆلای وەختێـك لـەلای هاتـەدەرەوە پرسیاریان لێ کرد ئەی (شورەیح) چۆن پادشات بەجێ هێشت ؟ ئەویش ووتی: کـە بـەجێم هێـشت فـەرمانی بەچاکە دەکـردو سەرپێـچی لەخەراپـە دەکـرد، ( مەسروق ی کوڕی ئەجد ەع ﷺ) ووتی: بەڕاستی ( شوره یح) خاوەنی ڕێزێکی گەورەیە, پرسیاری لێ بکەن، پرسیاری لێ بکـەن، فـەرمووی: کە بـەجێم هێـشت فەرمانی بەوەسیەت دەکردو سەرپێچی لە گریان دەکرد .

## ﴿ شێوەیەکی شارەزاو جوان بۆ دونیا ﴾

### ( تصوير بارع للدنيا )

ڕۆژێك کابرایەك ڕۆیشت بۆلای سەرکردەی موسڵمانان حەزرە تی (عەلی کوڕی ئەبی تالب ﷺ) ووتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان خانو یەکم کڕیوە، دە مەویٚ بەدە ستی بەڕێزت عەقدی کڕینی خانوەکەم بۆ بنوسی؟، سەرکردەی موسڵمانان سە یری دەم و چاوی کابرای کرد، جیهان چواردە ورەی دڵی داگرتب و,یانی دونیا پەرست بوو، سەرۆکی موسڵمانان ویستی دەرسێکی بدات کە پەندی لیٚ وەر بگریٚ و بەناوی خوداشەوە دەست پیٚ بکات، دەستی دایە قەڵەمێك و نوسی:

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان : لە دوای ناوی خودا، وا مردویەك خانویەکی لە مردویەك کڕی کە خانوەکە دەکەوێتە شاری تاوان باران و گەڕەکی بیٚ ئاگایان وە چوار سنوری هەیە،

سنوری یەکەم : بە مردن کۆتایی دێت .

سنوری دووەم : لە گۆڕدا کۆتایی دێت .

سنوری سێهەم: لە لیٚ پرسین و موحاسەبە کۆتایی دێت .

سنوری چوارەم : یان بۆ بەهەشتێیە, یان بۆ دۆزەخە .

## ﴿ لە گەڵ سەرکردەی موسڵمانان حەزرەتی عەلی ﷺ ﴾

### (مع اميرنا علي ﷺ)

ئەو کاتەی کە حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالب ﷺ) پلەی جێ نیشنایەتی وەرگرت،( عوقەیل) ی برای بەفرسەتی زانی هات بۆلای و ووتی: برام پیرۆزبایت لێ دەکەم بەو پلەیەی وەرت گرتووە جێگەی رێزو سەر بەرزیە کە بوویە سەرکردەی موسڵمانان : منیش لەدوای پیرۆزبایت دەمەوێ بەو بۆنەیەوە هێندێك سەروەت و سامانم لەخەزێنە پێ ببەخشی، حەزرەتی عەلیش ﷺ فەرمووی: برام ئێستا زۆر هیلاکم ئێوارە وەرەوە بەسەر چاو، حەزرەتی عەلیش ﷺ کاتی لای ئێوارە بەماوەیەکی کەم پێشی هاتنی ( عوقەیل)ی برای پریاسکە هەمبانەیەکی هێناو داینا ئاسنێکی زۆر سورەوە کراوی گەرمی تێ وەر پێچا کاتی ڕۆژ ئاوا (عوقەیل) هاتەوە بۆلای حەزرە تی عەلی ﷺ ووتی: کاکە چیت بۆ داناوم، حەزرەتی عەلیش ﷺ فەرمووی : کاکە ئەو هەمبانە هەڵگرەو بیبەوە ماڵێ (عوقەیل)یش زۆردڵ خۆش و شادمان بوو بەو هەدیەو بەخشیشە بەڵام کە عوقەیل دەستی گەیشتە هەمبانەکە دە ستی سوتاو بێ هۆش کەوت، کاتێك بەهۆش هاتەوە ووتی: ئەوە چی کارێك بوو لەگەڵت کردم، حەزرەتی عەلی ﷺ فەرمووی: ئەی دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکا (عوقەیل) ئەگەر نەت زانی بۆ تۆزێك ئاگری دونیا خۆت ڕاناگری و ئەوە حاڵتە، دەبێ حاڵی من و تۆ چۆن بێت لە ڕۆژی دوایی کە لەناو زنجیری سورەوە کراویان پێچاین و، بۆ ناو ئاگری دۆزەخیان بردین، ئەی (عوقەیل) هەر کەسێك خیانەت لە ماڵێ موسڵمانان بکات لەیەك درهەمەوە هەتا دینارێك خودا پردێکی ئاگرینی لە ڕۆژی دوایی بۆ ڕادەکێشێ لە سەر ئاگری دۆزەخ و لەسەرەوەی پردەکە ڕای دەگرن،لەبەرتین و گەرمایی دا پردەکە دە ڕوخێ و دەکەوێتە خوارێ حەفتا پایز لەناو عەزاب و ئازاردا دەمێنێتەوە بەبێ ئەوەی گیانیان دەربچێ .

## ﴿ ئەوەیە حەزرەتی عەلی﵁ بیناسن ﴾

(هذا هو علي﵁)

پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە حەزرە تی (عەلی کوڕی ئەبی تالب ﵁)ی فەرموو: ئەی عەلی خودای گەورە سێ شتی زۆر گەورەو بەڕێزی پێ بەخشیوی,
یەکەم : حەزرە تی فاتمەی پێبەخشیوی کە گەورەترین ئافرەتانی بەهەشتە،
دووەم: خودا حەزرە تی حەسەن و حوسەینی پێ بەخشیوی کە گەورەترین گەنجی بە هەشتێن .
سێیەم: خودا ئەتۆی کردووە بەزاوای پێغەمبەری کەسەرومرو گە ورەی هەردووك دونیایە، بەبێ لەخۆبایی بوون، کە وا دەڵێم هیچ لەخۆم بایی نیم و سەرکەش نابم .

## ﴿ ڕەوشتی هاوە ڵەکان ﴾

(أحوال الصحابة)

حەزرەتی( عەلی کوڕی ئەبی تالب ﵁)لە سەردەمی جێنشینی دووەم حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتاب ﵁) دەی فەرموو: خەوێکم دیت لە خەوم دا نوێژی بەیانیم لە دوای پێغەمبەری خوداﷺ دەکرد, لە دوای لێ بوونەوەو تەواو کردنی نوێژ، لە مزگەوت ڕۆیشتمە دەرێ، ئافرە تێك لە بەر دەرگای مزگەوت ڕاوەستابوو قاپێکی پڕ لە خورمای بەدەستەوە بوو، ئافرەتەکە ووتی: یاعەلی ئەو قاپە خورمایەم لێ وەر بگرە بیدە بە پێغەمبەری اسلام ﷺ، دەفەرموێ: منیش لێم وەرگرت و بردم بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، لە خەوەکەم دا پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بردە ناو قاپەکە, تەنها دەنکێکی خورما دەرهێناو لە ناو دەممی هاویشت، بەڕاستی ئەو دەنکە خورمایەم ئەوەندە پێ خۆش بوو، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ دەنکێکی تریشم بدەیە، پێش ئەوەی دەنکێکی

ترم بدا تێ لەوکاتەدا لەخەوەکەم بەخەبەر هاتم، گوێم لە بانگی (الله اکبر)ی بەیانی بوو هەستام و ڕۆیشتم بۆ مزگەوت لە دوای حەزرەتی عومەر﵁ نوێژمان دا بەست لە دوای لێ بونەوە لە نوێژ، لە مزگەوت ڕۆیشتمە دەر سەیرم کرد ئافرەتێك لەبەر دەرگا ڕاوە ستاوە قاپێك خورمای بەدەستەوە بوو ، ووتی: یاعەلی ئەو قاپە خورمایە بەرە بۆ حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب﵁، منیش وەرم گرت و بۆ حەزرەتی عومەرم برد ئەویش دەنكێك خورمای هەڵگرت و لەناو دەممی هاویشت بەڵام بەڕاستی زۆرم لەلا خۆش بوو, ووتم: ئەی سەرکردەی موسلمانان دەنكێکی تریشم بدەیە ! حەزرەتی عومەریش ﵁فەرمووی : ئەگەر ئەم شەو پێغەمبەر (ﷺ) زیاتری بەش بدابای ئەمنیش زیاترم بەش دەدای ؟! حەزرەتی عەلی بەو فەرموودەی عومەر زۆر سەرسام بوو ووتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان بەخەو چاوت پێکەوت یان بە نهێنی ئاگادار بووی حەزرەتی عومەریش ﵁فەرمووی: یاعەلی نەبەخەون دیتومە وە نە بەنهێنیش بەڵام ئینسانی موسڵمان ئەگەر نیەتی دڵی پاك بوو بۆ خودای ئەوا بەنوور ڕوناکی خودا شت دەبینێ .

## ﴿ خۆ پارێزی جێ نشین﴾

## (ورع الخلفاء)

دەگێڕنەوە حەزرەتی( عەلی کوڕی ئەبی تالب ﵁) شەوێکی ڕۆیشت بۆلای خەلیفەی موسڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب ﵁) کەسەیری کرد وا حەزرەتی عومەر لەبەر چرایەك، (فتیلە) کە بەڕۆن زەیت هەڵگیر ساندرا بوو، دانیشتوە و شتی فەرمان بەرانی لەبەر دەنوسیەوە، کە گەیشتمە لای دە ستی لە نوسین هەڵگرت و فەرمووی: ئەی عەلی بۆ ئیشی خۆت هاتوی، یان بۆ ئیشی موسڵما نان ؟ حەزرەتی عەلی﵁ فەرمووی : ئەی خەلیفەی موسڵمانان بۆچی ئەو پرسیارەم لێ دەکەی ؟ . حەزرەتی عومەر﵁ لە وەڵامدا فەرمووی : ئەی عەلی

ئەو فتیلە و ڕۆنە زەیتە ئی گەنجینەی موسڵمانانە بەشی هەموویانی پێوەیە ئەگەر ئەتۆش بەئیشی موسڵمانانەوە هاتووی ئەوا چرایەکە ناکو ژێنمەوە : بەڵام ئەگەر بۆ ئیشێك هاتوی کە تایبەتە بەخۆتەوە ئەوا چراکە دەکوژێنمەوە بۆ ئەوەی ماڵی موسڵمانان لە شتێك بەکار نەهێنین کە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانانی تێدا نەبێ .

## ﴿ فێڵی ئافرە تان ﴾

## (مكر النساء)

جارێك ئافرەتێکی دووڕوی مەکرباز هاتە لای سەرکردەی موسڵمانان ((عومەری کوڕی خەتاب )(ﷺ) ووتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان فلأنە کەس زۆری لێ کردوم بۆ ئەوەی داوێن پیسیم لەگەڵدا بکات منیش سەر پێچیم کرد و نەم هێشت بەلأم زۆر بەهێزو قوەت بوو توانام پێی نەشکا بەزۆری خۆی ئازاری دام و تۆو، ئاو، (منی) یەکەی هاتەوەو بەجلەکانمی داکردو پیسی کردم، ئافرەتە مەکر بازەکەش چوو بوو ئاوی سپێنەی هێلکەی بەجلەکانیدا کرد بوو زۆر بەمەنی دەچوو . حەزرەتی عومەریش ﷺکە سەیری کرد سپێنەی هێلکەیەو زۆریش بە ئاوی پیاو دەچوو ! بەلأم دوو دڵیش بوو بۆیە پرسیاری لە حەزرەتی عەلی کرد ئەی عەلی بیری تۆ چۆنە لەو بارەوە ؟.

حەزرە تی عەلیش ﷺ سەیری حەزرەتی عومەری کردو ووتی: ئەی عومەر هێندێك ئاوی گەرم بەجلەکانی دا بکەن، ئەگەر ئەو ئافرەتە ڕاستی کرد تۆوی پیاو بوو ئەوە لێ ی دەبێتە وە، ئەوکاتە قسەی ئافرە تەکە ڕاستە : وە ئەگەر توند بوو لێی نەبۆوە ئەوە ئاوی هێلکەیەو ئافرەتەکە درۆ دەکات، لەدوایی ئاوی کوڵاوی گەرمیان هێنا پێیان داکرد : ئەو ئاوو تۆوەی کەئافرەتەکە دەی ووت: پیاوەکە پێی دا کردوم بەئاوی هێلکە دەرچوو، دوای بەئافرە تە کەیان ووت: لە خودا بترسێ و شەرم بکە .بەڕاستی بیرو تۆمەتەکەت بەپوچ دەرچوو .

## ﴿ میراتی گران بە ها﴾

### (میراث ثمین)

دەگێڕنــەوە جارێکیــان ئــەبو هــورەیرە (ﷺ) بــەبازاڕی مەدینــەدا دەڕۆیــشت لەکومــەڵانی خــەڵکی دەڕوانــی و لێیــان وورد دە بۆوە زۆربــەی زۆری بــێ ئاگــان و زۆر بەکەمی یادی خودا دەکەن لەبەر هــیلاك و ســەر قاڵبوونیــان بە پەیدا کردنــی بــژێوی ڕۆژانــەی ژیانیــان بۆیــە بــەدەنگێکی بــەرز بــانگی ڕاهێــشت و فــەرمووی : ئــەی ئــادەمیزادو کۆمــەڵانی بــازاڕ بۆچــی وا دامــاون و بێهیــوا ڕاوە ســتاون، ئەوانیش خڕبونەوە ووتیان: چی ڕووی داوە ئەی ئەبوهوڕە یرە ؟

ئەبوهوڕەیرەش فەرمووی :بۆنەتان زانیوە ئەوا ئێستامیراتی حەزرە تی محمد (ﷺ) وا لەمزگــەوت دابــەش دەکــرێ ؟. بۆچــی ئێــوەش نــاڕۆن بەشــی خۆتــان وەربگرن ؟!

زۆربــەی خەڵکــە کــەگوێیان لــەو وتــەی ئــەبوهوڕەیرە بــوو زۆر بــەخێراو بەهەڵەداوان ڕۆیشتن بۆ مزگەوت لە دوای ماوەیەك بەدڵ ساردی و توڕەیی یەوە گەڕانەوە ئەبوهوڕەیرەش هەر لەجێگەی خۆی ڕاوە ستابوو, پرسیاری لێکردن چیتان کــرد، هێنــدێك وەڵامیــان دایــەوە ووتیــان : چــووینە مزگــەوت کــەسمان چاوپێنە کەوت و هیچ شتمان نەدیت دابەش بکرێ .؟

ئەبوهوڕەیرە ووتی: کەستان لە مزگەوت نەدیت .؟ ووتیان: هێندێکمان دیت نوێژیان دەکرد ،وەهێنــدێك قورئانیــان دەخوێنــدو کۆمــەڵێکیش زیکرو دوعایان دەکردو باسی چاکەو خراپەیان دەکرد, ئەبوهوڕەیرەش فەرمووی : ئەی هاوار بــۆ ئێــوە لــەکردەوەی چــاکە تــێ ناگــەن، ئــاخر ئــەوە دابــەش کردنــی میراتــی پێغەمبەرە (ﷺ) بڕۆن بەشی خۆتان وەرگرن . ( تەبەڕانی ڕیوایەتی کردووە )

## ﴿ خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾
## ( محبة الرسول صلى الله عـليه وسلم)

دەگێڕنـەوە ڕۆژێك پێغەمبـەری ئیـسلام (ﷺ) دەچێتە بـازاڕ، گـوێی لـەدەنگی بەندە یەك دەبێ خاوەنەکەی دەی فرۆشێ ئەویش بەدەنگێکی زۆر بەرز هـاواری دە کردو دەی ووت: توخودا هەرکەسێك دەیەوێ من بکڕێ بابەرگریم لێ نەکا لە نوێژی بەکۆمەڵ (جماعە) لەدوای پێغەمبەری خوداوە ﷺ.؟

کابرایەك ڕۆیشتە پێشەوە لەخاوەنەکەی کڕی و پەیمانەکەی بردە سەر ئەو بەندەیەش لەهەموو نوێژێك دا جەماعەتی لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ دەکرد .

ڕۆژێکیـان لـەدوای نوێـژ کـردن، پێغەمبـەر (ﷺ) سـەیری کـرد ئـەو بەندەیـە ئامادە ی نوێژی جەماعەت نەبوو، هەواڵی پرسی فەرمووی: بۆچی هاوەڵەکەمان دیـار نیـە ؟ یارەکـانی فـەرموویان: نەخۆشـەو بۆیـە دیـار نیـە، پێغەمبـەر (ﷺ) ڕۆیشت بـۆ مـاڵی بەندەکـە بـۆ دیـدەنی، لـە دەرگـای دا ووتیـان : کێیـە لـەدەرگا دەدا، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی : مـنم محمـد پێغەمبـەری خـودا، ئـەوەش لـە بەختەوەری بەندەکە بوو کە لەو کاتەدا خەریکی گیان دەرچون بوو پێغەمبەری خودا ﷺ لەلای دانیشت و نزای بەخێری بۆ کردو شەهادەی پێ هێنا لەوکاتەدا بەندەکـە گیـانی پـیرۆزی بەخۆشـی بەهەشـت شـاد بـوو, لـە دوای مـردنیش پێغەمبەر (ﷺ) بۆخۆی بەندەکەی شوشت و، کفنی کردو نوێژی لەسەر کردو شاردیانەوە .

## ﴿ داوێن پاکی باوەڕدار ﴾

### (عفة المؤمن)

دەگێڕنەوە کابرایەکی هەژاری موسڵمان زۆر پارێزگاری نوێژەکانی بەکۆمەڵ (جماعە ) ی دەکرد لە دوای پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆ پێویستیەکانی (واجب) ئیسلامی زۆر دڵسۆزو ڕاست گۆ بوو، بەڵام هەتا بڵێی هەژار بوو، هیچی نەبوو تەنها کراسێك .؟ بەڵام چۆن کراسێك ئەوەندە کۆنەو ڕزیو بوو بەچا کی کەڵکی لەبەر کردنیشی نەبو, بەس لەبەر ئەوەی هیچی کەی نەبوو زۆر پارێزگاری لەو کراسە دەکرد بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو کراسەوە بێ شەرمی خۆی پێ دابپۆشێ و لەنوێژی بەکۆمەڵی (جماعە)ی دوای پێغەمبەر (ﷺ) دوا نەکەوێ . ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای نوێژ کردن پرسیاری لەبارو دۆخی ئەو موسڵمانە هەژارە کرد، ئەویش زۆر بەڕو خۆشیەوە سوپاسی خودای کردو ووتی: ئەی ڕەسولی خودا زۆر باشین .؟ بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : بە یەکێك برۆ بۆ ماڵی ئێمەو دوو کراسی لێیە یەکیانم بۆ بهێنە، لە دوای ئە وەی کە کراسەکەیان هێنا پێغەمبەر(ﷺ) لە بەر ئەو موسڵمانە هەژارەی کرد، پاشی ماوەیەك کابرای موسڵمان گەڕایەوە بۆماڵێ خێزانەکەی کەچاوی پێ کەوت وا کراسی پێغەمبەری (ﷺ) لەبەردایە ڕەنگی هەڵبزرکاو ووتی : ئەوە چیە .؟ دەترسێم سکاڵای خودای گەورەت لەلای پێغەمبەرﷺ کردبێ، هاوار بۆ تۆ کە شکایەتت لەخودای کردبێ لەلای پێغەمبەر، مێردە هەژارەکەش ووتی : ئا فرەت سوێندبە خودا، سکاڵام نەکردووە لەلای پێغەمبەر ئافرەتەکە ووتی: ئەدی چۆن بوو پێغەمبەرﷺ ئەو کراسەی پێبەخشی، کابرا ووتی: ئافرەت سوێند بەخودا من ئەو کراسەم بۆیە وەر نەگرتووە لە پێغەمبەرﷺ لەبەر هەژاری ونەداری، تەنها لەبەر ئەوە وەرم گرت هەتاكو لە دوای مردنم بۆم بکەن بەکفنی ناو گۆڕەکەم !!.

## ﴿ مانەوەی هەتا هەتایە تەنها هەر بۆ خودایە ﴾

(الخـلـود لله )

دەگێڕنـەوە کابرایـەك لەسـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) دایـك و بـاوكێكی پـیری بەساڵاچوی دەبیٚ، هەموو ڕۆژێك بۆ نوێـژی بە كۆمەڵ (جماعە) بەكۆڵی هـەڵی دەگرتن و دەی بردن بۆ مزگەوت كەلە دوای پێغەمبەر (ﷺ) نوێـژیٚ بكـەن، بەڵام ڕۆژ ێكیان پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) كەسـەلامی نوێـژی دایـەوە چاوی بەو پیاو ژنە پیرە نەكەوت ؟! پرسیاری كرد ئەوە لە كوێن ؟. بۆچی دیـار نـەبوون لـە نوێـژ ؟ یارەكانی پێغەمبەر فـەرموویان : ئـەی پێغەمبـەر خـودا ﷺ كوڕەكـەیان مـردووە !، پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی : بەڕاستی ئەگـەر كەسێك لەبـەر یـەكێك نـە مردبایە دەبـوو ئـەو كـوڕە سـەبارەت بـەو دایـكو باوكـەی نـە مردبایـە، بـەڵام : بەڕاسـتی مانـەوەی یـەكجاری لـەو دونیایـەدا بۆ هـەتا هـەتایـە بۆ كـەس نیـە تـەنها خـودای گەورە نەبێت .

## ﴿ كار گوزار و خزمەت كاری مزگەوت ﴾

(خد مة المساجد)

دەگێڕنەوە ئافرەتێكی ڕەش پێست بەناوی دایكی مەحجەن ئیش و كـاری پـا ك ڕاگـرتن و خزمـەت كـاری مزگـەوت بـوو، ڕۆژێـك پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) كەڕۆیشت بۆ گۆڕستان بۆ زیارەتی مردوەكان لەناو گۆڕەكاندا دەگەڕا چاوی بە گۆڕێكی نویٚ كەوت، فەرمووی : بە موسڵمانە هاوەڵـەكانی ئـەو گـۆڕە نوێیـە ئـی كێیـە ؟ هاوەڵـەكانی وتیـان: یارسـول الله ﷺ ئـەوە گـۆڕی دایكـی مەحجەنـە، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی كرد بەگریان و فرمێسكی گەشی وە ك مرواری بەچاوان دا ها تە خوار، لە دوایی دا ووتی : كە گیانی دەرچوو بۆ پێتان نـە ووتم : هـەتا

بها تبامایەو نوێـژم لەسـەر بکردبایە یارەکـان وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) کاتێـك کۆچـی دوایـی کـرد ڕۆژگـار زۆر گـەرما بـوو نـەمان ویـست کـاتی پشودانی بەڕێزت تێك بدەین بۆیـە ئاگادارمـان نەکردیـەوە، پێغەمبـەر هـەر خێرا ڕاسـت بـۆوەو دە سـتی کـرد بـە نوێـژ لەسـەر گـۆڕی دایکـی مەحجـەن، دوایـی فەرمووی: بە یارەکانی هەر کاتێك یەکێك لە یارەکان کۆچی دوایی کرد ئاگادارم بکەن بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەم چونکە هەرکەسێك من نوێژی لەسەر بکەم لە دونیـا دا ئـەو نوێـژەم دەبێتـە تکاکـاری لـە ڕۆژی دوایـی، ئینجـا لـە دوای ئـەوە پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی کردە گۆڕەکەو فەرمووی : سەلامی خودات لەسەربێ ئەی دایکـی مەحجـەن، پێمـان بڵـێ ئایـا چـی کردەوەیـەکت لەهـەموو کردەوەکـان بـە باشـتر دەرچـو، وە پاداشـتی چـاك و گـەورەت پـێ وەر گرتـووە، ماوەیـەك پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگ بوو بۆ ئەوەی وەڵامەکەی گوێ لێ بێ ؟

دوایی بەیارەکانی ووت : دایکی مەحجەن ووتی: هیچ کردەوەیەکم باشتر نـەبوو بـۆ پاداشـت وەرگـرتن لـەلای خـودا لـە خزمـەت و پـاك کردنـەوەی مزگـەوت .لـە کوتـایی دا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: خـودای گـەورەو میهرەبـان قەسـرێکی بـۆ دایکی محجەن دروست کردوە لە بەهەشت دا ئێستا بەچاو قە سرەکە دەبینم دایکی محجەن لێی دانیشتووە .

## ﴿ پیاوێکی ئەهلی بە هەشتیّ ﴾

(رجل من اهل الجنة)

پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) پیشەی وە هابوو هەموو ڕۆژێك لە دوای نوێژی (عەصر) ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، ڕۆژێك لە کاتی ووتاردا ماوەیەك ڕاوە ستا دوایی فەرمووی: ئێستا لەوسوچەوە یەکێك دێتە ژوری مزگەوت لە ئەهلو دانیشتوی بەهەشتێە، یارەکانی پێغەمبەرﷺ کە گوێیان لەو فەرموو دە بوو: هەموو بە جارێك چاویان بڕیە سوچەکە، وەختێك پیاوێك هاتە ژورەوە سەلامی کردو نوێژی عەسری کردو گەڕایەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ڕۆژی دوایی لە ووتارەکەی دا هەمان مزگێنی دا ئێمەش کە سەیرمان کرد هەر ئەو پیاوەی دوێنیّ بوو کە پێغەمبەر ﷺمزگێنی بەهەشتی پێدا, بەو شێوەیە ڕۆژی سێهەمیش هەروا پێغەمبەر (ﷺ) بەڵێنی بەهەشتی دا هەرهەمان کابرا دەرچو, بۆ یە ڕۆژی سێهەم : یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەرﷺ ووتی: دەبیّ بە دوای ئەو کابرایەدا بڕۆم بزانم چی کردەوەیەکی باشی هەیە وا پێغەمبەر(ﷺ) سیّ ڕۆژە بەڵێنی بەهەشتی پیّ دە دات ووردو نزیك لە دوای ڕۆیشتم هەتا گەیشتە گوندی (سەنح) لەوێشەوە وردە ووردە بەدوای دا ڕۆیشتم هەتا کابرا گە یشتە ماڵیّ : لە دەرگام داو فەرموویان لیّ کردم بۆ ژورەوە ڕۆیشتمە ژورو سەلامم کرد داوای میوان داریم لیّ کردن زۆر بەخێر هاتنیان لێکردم سیّ ڕۆژ لەماڵیان دامامە وە بەلاّم وەکو سەیری کردەوەکانیم دە کرد نەم دەزانی پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆی چیەوە بەڵێنی بەهەشتی پێداوە نەتەقواو نوێژی زۆر دەکات، نەڕۆژو گرتن و، نەخێرو چاکەشی زۆرە بۆیە خۆم پێنە گیراو پێم ووت: ئەی برام تێم بگەیەنە چی کردەوەیەکی باشت کردووە ؟. چونکە بەڕاستی من گوێم لە فەموەدەی پێغەمبەرﷺ بووە کەسیّ جار بەڵێنی بەهەشتی پیّ داوی کابراش ووتی: من هەر ئەوەم وە ك و دەمبینی, بەلاّم هەرچی فێلّ و خیانەت و خەراپە هەیە لەدڵم

دانیەو حەسادەت‌وئێرەیشم نیە بەرامبەر هیچ کەسێك کە خودا بەخشیشی بەسەردا ڕشتبێ, ئەمجار هاوەڵەکەی پێغەمبەرﷺ فەرمووی : وابوٚم دەرکەوت کە بەهوٚی ئەو دڵ پاکیو ئێرەی‌و حەسادەت نەکردنەتە کە گە یشتویە ئەو پلەیە کەپێغەمبەر (ﷺ) ئاوات پێ بفەرموێ : ئەهلی بەهەشتێیە .

## ﴿ سکاڵای ناڕە زایی و دڵ تەنگی ﴾

## (شکوی وحزن)

وەختێك خودای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە، دە فەرموێ : ﴿وَمَن كَانَ فِي هَـذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾ الإسراء/٧٢.

واتە: هەرکەسێك لەو ژیانی دونیایەدا ڕێگەی ڕاست کەڕێگەی دینی سەربەرزی ئیسلامە نەگرێ و بەو ڕێگەیەدا نەڕوات ئەوە مانای وایە چاوی لە ڕێگەی ڕاست کوێرو نابینایە، وەلە ڕوٚژی دوایشدا بەڕاستی کوێرو نابینا دەبێت و بەد بەخت و گومڕا دەبێ، ئینجا ( عبداللەی کوڕی ئوم مەکتوم ﷺ)کە چاوی کوێر بوو زوٚر دڵ تەنگ و ناڕەحەت بوو، هاتە لای پێغەمبەرو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، بەڕاستی ئەو ئایەتە کە بوٚلات هاتوٚتەخوار زوٚر دڵ تەنگی کردوم و بیرو هوٚشی لێ بردوم، من لەو دونیایەدا ڕازیم بە نابینایی سوپاس بوٚ خودا, بەلاٚم بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ڕازی نیم و ناتوانم لەڕوٚژی دوایی بەکوێری. کات بەرمە سەر:! پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) وەلاٚم بداتەوە خوای گەورە بەهوٚی حەزرەتی جبرائیل ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کەدەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ الحج/٤٦.

واتە: چاوی ڕوون و ئاشکرا کوێر نابێت بەلاٚم چاوی دڵیان کوێر دەبێت هیچ شتیك هەست پێ ناکەن . لەدوایدا پێغەمبەر(ﷺ) بە عبداللەی ووت: ئەی عبدالله توٚ بەوە ڕازی نابی کە یەکەم کەسی سەیری زاتی بنەڕە تی خودا بکەی لەڕوٚژی دوایی ئاخرەت دا .

## ﴿ خودا چاو دێرە ﴾

## (مراقبة اللّٰه)

ڕۆژێک ئەبوهورەیرە ( ﷺ ) بەجێگەیەکدا دەڕۆیشت چاوی بە کابرایەکی شیر فرۆش کەوت ئاوی لە شیرەکە دە کرد ئەبوهورەیرە ﷺ فەرمووی : ئەی کابرا چی دەکەی لە ڕۆژی دوایی دا کە پێیان وتی: ئەو ئاوە لەو شیرە جیا بکەوە ؟؟

## ﴿ پرسیار لە چوارشت ﴾

## ( سؤا ل عـن أربع )

دەگێڕنەوە (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﷺ) دەوڵەمەن ترین هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، کاتێک پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆیشتە خزمەت خوداو: گەڕایەوە جێگەی خۆی، کۆمەڵێک لە یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتن پیرۆزبایی لە پێغەمبەرﷺ بکەن، سەیریان کرد (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﷺ) لەلای پێغەمبەرﷺ دانیشتوە، بۆیە یارەکانی پێغەمبەر وتیان: ئەی عبدالرحمن ئێمە لەتۆ دەترساین بەهۆی دەوڵەمەندی و هیلاکیتەوە هۆشت لە پێغەمبەری خودا ﷺ نەبێت، بەڵام شوکر بۆ خودا دەوڵەمەندیت باوەڕی لاواز نەکردوی وڕەوشتی نە گۆڕیوی :

دوای عبدالرحمن وتی: بۆ چی سەروەت و سامان ڕێگەم لێدەگرێ و بەدوام دەخات لەکرداری چاکە, هەموو یارەکان بە تێکرا وتیان: ئەدی ئەو فەرموودەی : پێغەمبەرت نەبیستوە کەدە فەرموێ :

(لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتى يسأل عن اربع عن شبابه فيم ابلاه وعن عمره فيم افناه، وعن ماله من اين اكتسبه وفيم انفقه وعن علمه ماذا صنع فيه). رواه الترمذي في السنن/٩/٢٥٣، وقال الالباني/اسناده حسن:في صحيح

الجامع /١٤٨/٦.

واتە:قاچی بەندەی خودا ناڕواتە پێشەوە تاك وچوار پرسیاری لێ نەكرێ،

یەكەم:پرسیاری لێ دەكرێ تەمەنی لاویت لە چیدا بەكار هێناوە؟

دووەم: پرسیاری لێ دەكرێ تەمەن وژیانت لەچی سەرف كردووە.

سێهەم:پرسیاری سەروەت و سامانت لێ دەكرێ چۆن بە دەستت هێناوە و لە چیشت سەرف كردووە؟.

چوارەم: پرساری زانیاریت لێ دەكرێ چۆنت بەكار هێنا وە وەچیت كردەووە ؟.

یارەكان فەرمویان: تەمەنی لاوی یەك پرسیاری لێ دەكرێ وەژیانی تەواو تەنها یەك پرسیاری لێ دەكرێ وە هەروەها زانستیش تەنها یەك پرسیاری لێ دەكرێ بەلاّم سەروەت و سامان دوو پرسیاری لێ دەكرێ

یەكەم : ئەو ماڵەت چۆن پەیدا كردووە و كۆت كردۆتەوە بەكاری ناڕەوا لەڕێگەی خراپدا كۆت كردۆتەوە یان بەڕێگەی ڕەوادا ؟

دووەم: پرسیاری سەرف كردنەكەشت لێ دەكرێ لەكاری ڕەوادا بەكارت هێناوە یان لەڕێگەی ناڕەوادا .؟.

عبدالرحمن فەرمووی: بە یارەكان باشە من تاوانی چیم هەیە كە دەوڵەمەندم وەچی بكەم ؟ بەڕاستی هەبوونی ئەوماڵە لەدەسالاّتی من دانییە چونكە من بەڕۆژ لە بەیانییەكەی دا (١٠٠) سەد دینار دەكەم بەخێر، خودای گەورە لەڕێگەیەكی نادیاری شەودا (١٠٠٠) هەزار دینارم دە داتەوە .

# ﴿ داوێن پا کی و هەژاری ﴾

## ( عـفة و فقر)

ڕۆژێك کابرایەك لە دوایی نوێژی شێوان(مغرب) هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) قاپێك گۆشتی سورەوە کراوی پێ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو قاپە گۆشتە بدە بەهەژارێکی موسڵمان .

وە ئەو هەژارانەی کە لەلای پێغەمبەر ﷺ بوون هەموویان خواردنی ئێوارەیان خوارد بوو پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێ کردن فەرمووی : کێتان پێویستی بە خواردنی گۆشت هەیە ؟. ئەوانیش وتیان: ئەی ڕەسولی خودا ئێمە خواردنمان خواردووەو تێرین، ئەگەر ئەو خواردنە بخۆین دەبێتە زیادە ڕەوی (إسراف) بۆیە پێویستمان پێی نیە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە ئەبوهورەیرەﷺ هەستە ئەو گۆشتە بەرە بۆ (ئوم ایتام) کە ئافرەتێك بوو مێردەکەی مردبوو چەند منداڵێکی بچوکی هەبوو زۆریش هەژارو نەداربوو، ئەبوهورەیرەﷺ گۆشتەکەی هەڵگرت و بەرەو ماڵی (ئوم ایتام) ی کەوتەڕێ بۆ ئەوەی گۆشتەکەی بداتێ و دەرخواردی منداڵەکانی بدات، لە دەرگای دا ئافرەتەکە وتی:کێیە ؟

ئەبوهورەیرەﷺ وتی : منم دەرگام لێ بکەوە لە دوای چونە ژورەوە ئافرەتەکە وتی: ئەباهورەیرەﷺ خێرە لەو کاتەدا هاتووی ئێشت چیە ؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوداﷺ ئەو گۆشتەی پێدا ناردووم بۆ تۆو, بۆ منداڵەکانت .

ئافرەتەکە وتی: بڕۆ بگەڕێوە بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺسەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ خودا پاداشتی چاکەی بداتەوە ئێستا پێویستمان بە گۆشتەکە نیە, چونکە ئێوارە منداڵەکانم تێریان خواردووەو هەموویان بەتێری نوستون: ئەبوهورەیرەﷺ وتی: ئەی (ئوم ا یتام) دەمێکە منداڵەکانت

خواردنی وایان نەخواردوە هەڵی بگرە بۆ بەیانی کە لەخەو هەستان بیان دەیە .
ئەو ئافرەتە موسڵمانە ووتی: بڕۆ بەپێغەمبەری خودا ﷺ بڵێ ئایا دەبێتە بارمتەوکە فالەتی منداڵەکانم هەتا بەیانی دەژیەن‌و نامرن، بڕۆ ئەو خواردنە بەرەوە با بیدەن بە کەسێك کە لەمنیش هەژار تربێ‌و ئەو ئێوارەش تێریان نەخواردبێ،ئێستا بەزگی برسی هاوار دەکەن . بەڕاستی کەسەیری ئەوباوەڕ دارانەی پێشو دەکەین کەچۆن تەوەکول‌و پشت‌و پەنایان بەخودا بەهێزو پتەوبووە، ئێمە دەبو ئارەقەی شەرمەزاری لەڕوخساری خۆمان بسڕین.

## ﴿بەشێکی پیرۆز﴾

### (قسمة مباركة)

یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەناوی: (ئەبوقەلابە) دەفەرموێ: ڕۆژێك بەڕێگەدا دەڕۆیشتم پەڵە هەورێکم لە ئاسمان بەرچاو کەوت، گوێم لە دەنگێك بوو بە هەورەکەی دەگوت بڕۆ باران‌و ئاوەکەت لە کێڵگەی فلانەکەس هەڵڕێژە منیش وورده وورده بەدوای هەورەکەدا ڕۆیشتم تاگەیشتە کێڵگەی ئەو فلانەکەسەو بارانێکی زۆر بە بەرەکەت لەو کێڵگەیە باری‌و تێرئاوی کرد.
لە دوای بارانەکە ڕۆیشتم بۆلای خاوەنی کێڵگەکەو پرسیارم لە خاوەنی کێڵگەکە کرد، ئەی برام تۆ ئیشت چیەوچی دەکەی ؟
لە وەڵامدا ووتی: برای شیرینم کاتێ خودای گەورە بەرو بوومم بۆ پێدە گەیەنێ، هەموو دەست کەوت‌و داهاتەکەم دەکەمە سێ بەشەوە، بەشێك بۆ هەژارەکان دەی کەمە خێر : بەشێکیش بۆ خۆم و خانەوادەکەم، بە شێکیش هەڵدەگرم بۆ تۆو کردنەوەی ساڵێکی تر .

# ﴿ پاڵەوانی بیروباوەڕو جەنگاوەر﴾

## (ا بطا ل عـقید ة وجها د)

دەگێڕنەوە لە چەرخی جێ نشینی سەرکردەی موسڵمانان( عومەری کوڕی خەتاب ﷺ) لە ساڵی نۆزدەهەمی کۆچی دا هێزێکی ئیسلامی گەورەی پێك هێنا بۆ بڵاوکردنەوەی دینی سەربەرزی ئیسلامو بۆ لەناو بردنی ئاینە دەست کاری کراوەکان بۆ لێدان و ڕماندنی قەڵای زۆردارانی ڕۆم، کە دەوڵەتی ئیسلامی هێنا بووە لەرزە, لە دوای ئامادە بوون و ڕۆیشتن و گەیشتنە مەیدانی جەنگ و,جەنگ دەستی پێکرد (هەرقەل) پادشای ڕۆم ئازایی و چاو نەترسی موسڵمانەکانی بیست بوو کەچەندە باوەڕیان ڕاست و دامەزراوە سەرو ماڵی خۆیان لە پێناوی خواو پێغەمبەرو ئاینەکەیان بەخت دەکەن، فەرمانی دەرکرد هەر کاتێك دیلێکی موسڵمانانتان کەوتە بەر دەست مەی کوژن و بۆمنی بهێنن !! خودای گەورە ویستی وابوو( عبداللە ی کوڕی حوزافە ﷺ) و کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی موسڵمانان بەدیل گیران و کەوتنە بەردەستی ڕۆمە ستەم کارەکان, بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا بۆ ئەوەی لەسەر ئاینی ئیسلام پاش گەزیان بکەنەوەو بێ باوەڕیان بکەن (هەرقەل) پادشای ڕۆم کەسەیری کرد عبداللە پیاوێکی زیرەك ولێها تووە ووتی: عبداللە ببە بەگاور نیوەی سەروەت و دەسەڵاتی خۆمت دەدەمێ و پێت دەبەخشم.؟

عبداللە : فەرمووی سوێند بەخودای گەورە هەرچی دوونیا هەیە بمدەیە بۆ ئەوەی ئاینی ڕاستی محمد واز لێ بهێنم وازی لێ ناهێنم .

(هەرقەل) ووتی: عبداللە ئەگەر گاور نەبی و واز لەئاینەکەت نەهێنی بەڵایەکی زۆر گەورەت بەسەر دێنم!! .

عبداللە فەرمووی: چی دەکەی بێ باکم،وە هەرچی بیکەی تەنها دەتوانی ئازاری لەش و ئەندامەکانم بدەی کە ئەویش دەڕزێ و نامێنێ، چونکە ناتوانی

ئازاری گیانم بدەی تەنها خودا خاوەنیەتی .

هەرقەل : فەرمانی دا چوار مێخەی بکێشن و زۆر بە توندی بیبەستنەوە, لە دوای بەجێ هێنانی فەرمانی هەرقەل بەنهێنی بەتیرهاوێژەکانی ووت: تیربارانی بکەن بەلأم لە شوێنێ وای مەدەن گیانی دەرچێت یان زامداری بکەن تەنها بیترسێنن بۆ ئەوەی لە بەرترس و ئازاری ببێ بەگاور, بەلأم هەر چەندە کەتیری بەر دەکەوت بە دەنگی بەرز دەی فەرموو (لاإلەإلاالله) لە دوای ئازارێکی زۆر هەرقەل زانی بەوەش چاری ناکات ووتی: دای گرن بیهێننە خوار خێرا بە فەرمانی هەرقەل گاور عبدالله یان داگرت هەرقەل ئەو جا پیلانێکی کەی بەکار هێنا بۆ گاور بوونی عبدالله. هەرقەل: ووتی مەنجەڵێکی گەورە بهێنن پڕیکەن لە ئاو بەتەواوی بی کوڵێنن . فەرمانی هەرقەلیان بەجێ گەیاند ئاوەکە ئەوەندە کولأ خەریك دەبوو مەنجەڵیش بفڕێ .ئەوجا هەرقەل ووتی: ئەی عبدالله یان دەبی بەگاور, یان دەبێ بچیە ناو ئەو مەنجەڵەوە،عبدالله ی دیلی بێچارە موسڵمانی چاونەترس : هەستاو بۆلای مەنجەڵەکە ڕۆیی خۆی تێ بهاوێ کە نزیك بۆوە لە مەنجەڵی کولأو, کە لە دورەوە پڕیشکی دەپرژاند, عبدالله گریاو فرمێسکی بە چاوان دا هاتە خوار، پیاوەکانی پادشا ووتیان: گەورەم واعبدالله دەگریا وادیارە لە ئاینەکەی پەشیمان بۆتەوە!. هەرقەل ووتی: ئەی عبدالله بۆدەگریەی لە ئاوی کولأوی ناومەنجەڵەکە ترسای . ؟

عبدالله : هاتە گوفتارو فەرمووی: سوێند بەخودای گەورە لە ترسان ناگریەم چونکە زۆر چاك دەزانم لە دوای چونە ناو مەنجەڵەکەوە گیانم بۆ خزمەت خوداو بۆ بەهەشتی بەرین دەڕوات . تەنها بۆیە گریام, من یەك گیانم هەیە کە لەڕێی خودادا بەختی دەکەم ئاواتە خواز بووم کە (١٠٠) سەد گیانم هەبایەو یەك لەدوای یەك لە ڕێگەی خودا ئازار درابا و بەختم بکرد بایە.

هەرقەل: کەزانی بەوەش چارەی ناکات ووتی: بیگێڕنەوە دواوە بڕۆن جوانترین ئافرەتی ولأتی ڕۆمم بۆ بهێنن !کاتێك ئافرەتیان هێنا هەرقەل ووتی:

لەگەڵ عبدالله دا بیان کەنە ژوورێکەوە دەرگاو پەنجەرەی دابخەن بۆ ئەوەی عبدالله هەڵ خلیسکێ و کردەوەی داوێن پیسی لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بکات هەرقەل کافر بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەوە موسڵمانی بەڕاستی یەو ئەو پیلان و فێڵ و د وژمن کاریەیانەی کافر کاری تێ ناکەن . بەڵێ عبدالله لەگەڵ ئافرەتەکەدا کردیانە ژوورە وە بەڵام چی ئافرەتێك لە جوانی ڕواڵەتی دا بێوێنە بوو. باوك و برا شەیدایجوانی دەبوون, ئەو ئافرەتە بەڕوتی و خۆبادان و لەنجەو لارەوە بەدەورەی عبدالله دا هەڵدە سوڕاو،هەستە بزوێنەکانی سێکسی بەکار دەهێنا, بۆلە خشتە بردنی عبدالله .

ماوەیەکی زۆر لەوژورە تەنهایەدا دووبە دوو مانەوە تەنها بیروباوەڕو ئیمانی بەهێزە بتوانێ ئادەمیزاد ڕابگرێ و توشی ئەو کارە ئابڕووبەرە نەبێتەوەو: لەپشتی پاریزگاری نەکردنی ئەوتاوانەش بەتەنها خودای بەتواناو بەدەسەڵاتە، کە ئاگاداری عبدالله یەو هیچی تر . هەرقەل ووتی: ئێستا کار لەکار ترازاوەو بەسەر عبدالله دا سەرکەوتوین بڕۆن ئافرەتەکە بهێنن بەسەرهاتەکەمان بۆ بگێرێتەوە . کاتێك ئافرەتەکە ئامادە بوو هەرقەل:پرسیاری لێکرد بۆمان باس بکەچی ڕوویداوە ؟!!

ئافرەتە بێ باوەڕەکە هاتە ووتەو ووتی: گەورەم من نازانم بۆلای کێتان ڕەوانە کردووم : منتان بۆلای ئادەمیزاد ناردووە یان بۆلای بەردی بێ گیان، بەڕاستی زۆرم هەوڵ دا بۆ دەست بازی کردن زۆر بە دەوریدا سوڕامەوە هیچم لێ نەبیست تەنها دەی ووت: (لاإلە إلا الله ) کاتێ هەرقەل کە لەوەش دڵنیابوو هیچی بۆ لەگەڵ نەکرا پیلانێکی کەی ڕێك خست کە ئەوەیە ووتی : بڕۆن بیخەنە ژوورێکەوە هیچ خواردنێکی مەدەنێ تەنها مەشروبی نەفرین لێ کراو لەگەڵ گۆشتی بەراز بەو جۆرە سێ ڕۆژ لە مەشڕوب و گۆشتی بەراز زیاتر هیچیان نەدایە لە دوای سێ ڕۆژە کە دەرگایان کردەوەو چونەلای عبدالله کە سەیریان کرد خەریکی نوێژ کردن و یادی خودایە .مەشڕوب و گۆشتە بەرازەکەش

هەروەك و خۆی ماوەتەوە ووتیان: ئەی عبداللە بۆچی ئەوانەت نەخواردووە خۆ بۆتۆ دروست بوو چونکە تۆ زەرور بووی بە خواردنی ئەوشتانە!. وە برسیایەتی تینی بۆ هێنابووی .

عبداللە لە وەلأمدا فەرمووی: دەم زانی بۆم دروستە بەلأم لەوە ترسام دوژمنانی خودا پێم خۆش بن و تانە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بدەن،کاتێك (هەرقەل) دلنیا بوو لەوەی کەعبداللە گاور نابێ و لەئاینی ئیسلام لانادات،وە هەروەها ئینسانێکی چاونەترس و هەلکەوتووە زۆری پێ خۆش بوو بی بەخشێ بۆیە ووتی: عبداللە سەرم ماچ بکە بەرت دەدەم:

عبداللە ووتی: ئەگەر تەنها بەردانی خۆم بێ ماچی ناکەم بەلأم ئەگەر بەردانی هەموو هاوەلەکانم بێت ماچی دەکەم لەسەر ئەو بڕیارە ڕێك کەوتن عبداللە هەستا سەری ماچ بکات لەدلی خۆیدا ووتی: ئەی خودای گەورەو میهربان بەڕاستی تۆ ئاگاداری کە (هەرقەل) هاوەلێ پەیدا کەرەو پیسە, من ماچی ناکەم و, تفی لێ دەکەم کە پرسیارت لێ کردم لە ڕۆژی دوایی دەلێم بە گەورە یی و مهرەبانی تۆ ئەوەشم تەنها لەبەر خۆم نەکردوە بەلکو لە پێناوی هاوەلەکانمدا کردومە عبداللە هەستاو بە نهێنی تفێکی لەسەری هەرقەل کرد لەباتی ماچ کردنی ئینجا (هەرقەل) فەرمانێکی دەرکرد کە عبداللە و هاوەلەکانی بەربدەن, لە دوای بەردانیان عبداللە و هاوەلەکانیان بەرەو مەدینە کەوتنەڕێ لەگەلێ گەیشتنەوەیان چونەلای حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتابﷺ) بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە حەزرە تی عومەر زۆر کە یف خۆش بوو هەستایە پێ و ووتی: پێویستە لەسەر هەموو موسلمانەکان کە سەری (عبداللە ی کوڕی حوزافەﷺ) ماچ بکەن وەمن لە پێشەوە یەکەم کەسم کە ماچی دەکەم,حەزرەتی عومەر سەری عبداللە ی ماچ کرد لەبەر ڕێزوپایەی عبداللە و بیرو باوەڕە پتەوو ڕاستەکەی لەدوای حەزرەتی عومەریش ئەو موسلمانانەی لەوێ ئامادە بوون یەکە یەکە سەری عبداللە یان ماچ کرد.

# ﴿ لە دوای ناخۆشیان خۆشی یە﴾

( إ ن بعد العسر يسرا )

فەڕو پیرۆزی بەسەر ئەو کەسەدا بڕژێ کەگوتوویەتی :

يا صاحبَ الهمِ إنَّ الهَمَّ مُنْفرِجٌ أبْشِرْ بِـخَيرٍ فـإنَ الفا رجَ الله

اليَأ سُ يَقطعُ أحيانا بِصـا حِبِهِ لا تَيأ سَنَّ فـإنَ الكــافِيَ الله

اللهُ يُحْدِثُ بَعْدَ العُسْرِ مَيْـسَرَةً لا تَجْزَعن فـانَّ الصـّانِعَ الله

إذا إبتُلِيتَ فَثِقْ باللهِ وأرْضىَ بهِ إنَّ الذي يَكْشفُ البَلْوى هُوَ الله

وَاللهِ مالَـكَ غَيْرَ اللهِ مِنْ أحَـدٍ فَحَسبُكَ اللهُ في كُـلٍ لَـك الله

واتـە: ئـەی ئەوکەسـەی کەخـەم و ماتـەمی دای گرتـووی بزانـە خـەم و ماتـەمی کۆتـایی دێـت, بـەڵێن بەچاکەبدە چـونکە بەڕاسـتی دەرگـای خۆشـی خودایـە، بێـزاری زۆر جار ئینسان لـە ژیـان بێبـەش دەکات, نەکەن ئێـوە بێـزارو نائومێـد مـەبن, چـونکە خـودا لەسـەروی هـەموو شتێکەوەیە, وە خـودای گـەورە لـە دوای ناخۆشیان خۆشی دەهێنێ، نەکەن لەکاتی ناخۆشیدا بێ زاری دەربڕن چونکە هەموو شتێك هەر خودا بەسەرمان دێنێ،هەرکاتێك توشی ئازارو بەڵایـەك بووی هیـوات بـە خـودای گـەورە بێـت, کەئەو بەڵایـەی هاتۆتـە سـەرت, بەڕاسـتی هـەر خودایە بەتوانایە کە بەڵاو ئازارت لەسەر لابدات .

وە بەڕاسـتی خـوداش خـاوەنی هـەموو شـتێکە, کـەس هیـچی پـێ نـاکرێ تـەنها خـودا نـەبێت, دەتـۆش هیـوات لـە هـەموو شـتێکدا, تـەنها هـەر هیـوات بـەخودا هەبێت, چونکە لەهەموو کاتێك خوات لەگەڵدایە.

منیش بەو شێوەیە کردمەوە بەهـەڵبەسـت :

ئەی ئەو کەسەی خەفەت بارو،خەفەت دەرو دڵ کەسەری
وا مەزانە هەموو کاتێ، بە دڵ تەنگی بەسەر بەری
کە یەف خۆش و دڵ ڕەوێنبە, بەڕاستی خوامان الله یە
خەمو خەفەت پاڵ پێومنێ، ژیانی ئێمە بەدەست خوایە
نائومێدی لەڕەحمی خودا, دەردو غەم زۆر دەبارێنێ
مەئیوس مەبن لە کردارتان،خۆشیو شادیخوا دەی هێنێ
خودا لە قورئان فەرموویە، لەدوای ناخۆشیان خۆشی یە
خۆی دەزانێ بەچی دەڕۆین، هاوارو ڕۆ ڕۆی بۆ چیە
هەرکات توشی بەڵایەك بوون, دەست بڵندکەن لەبەر خودا
هەر خودایە کە بەڕاستی، دەردوو خەممان لێ لابدا
خوا خاوەنی گشت جیهانە، بێ خاوەن و بەبێ کە سە
هەرچی بڕوای بەو خوایەبێ, لەو دوو دونیا ئەوەی بە سە

## ﴿ لە خودا ترسان ﴾

### (مخافة الله)

دەگێڕنەوە هەڵگری ئاڵای ئیسلام( عوقبەی کوڕی نافعﷺ) لە کاتێك دا کە بەڕێکەوت بۆ جیهاد بۆ باکوری ئەفریقیا، فەرمانی دەرکرد بۆدەستە لە شکرێك لەناو سوپاکەدا بۆ دروست کردنی شاری ( قە یرەوان ) لە وڵاتی تونس دا:
ئەو کۆمەڵە سوپایەی بەوکارەوە هەستان ڕۆیشتن بۆئەو شوێنەی کە تەرخا ن کرابوو, شارەکەی لێ دروست بکرێ کە سەیریان کرد ئەو جێگەیە، جێگەیەکی ناخۆش و بێشەڵانێکە تەنها جێگەی دڕندانە، شێرو، گورگ و، مار، تێیدا دەژیاو هیچی تر . ئەو کۆمەڵە سوپایە گەڕانەوە بۆلای (عوقبە)و سکاڵای جێگەکەیان کرد کە پڕیەتی لە دڕندەو ئیشی تێدا ناکرێت, (عوقبەی کوڕی

نافع) خۆی ئامادە کردو بەرەو شوێنی دیاری کراو بۆ دروست کردنی شار کەوتە ڕێ، چووە سەر شوێنێکی بەرز هاواری کردو فەرمووی: ئەی شێرو, گورگ و, مار، بزانن ئێمە ها وەڵی پێغەمبەری خوداین، وەرنە دەرەوەولێرە بڕۆن, پەیمان بێ هیچتان لێ ناکەین ئێرەمان بۆ چۆڵ بکەن بەلام کەنەڕۆن وچۆڵی نەکەن هەرچییەکمان لێکردن, بە کوشتن و نەمانتان لۆمەمان مەکەن و, ئۆباڵی خۆتان لەئەستۆی خۆتان :

سوپای ئیسلام سەریان لە هاوارەکەی عوقبە سوڕما ؟. ووتیان: چۆن هاواری چی لە شێرو، گورگ و، مارو، مۆر دەکات.!! بەلأم زۆری نەخایاند لە دوای هاوارەکە مارو, شێرو, گورگ و, دڕندەی ئەو بێشەلأنە, هەمووی بەتێکڕا تەنانەت ئەوەی بەچکەی هەبوو بەدەم هەڵی دەگرتوو دەیان گواستەوە بۆ شوێنێکی تر .

یەکێك لە جەنگاوەران ووتی: ئەی سەرۆکی سوپا نەیان کوژین سەرکردەی سوپا کەش (عوقبە) فەرمووی: نەخێر نایان کوژین،ئەگەر ئێمە بیان کوژین مانای وایە خیانەت مان لە پەیمانەکەمان داکردووە لەگەڵ خودای تاك و میهرەبان .

ئێمە ڕێگەی ڕۆیشتنمان پیشان دان بە پەیمانی ئەمانەتەوە .؟ چۆن دەبێ پەیمانیان لەگەڵ بشکێنین.

# ﴿گە ورەی ڕاستی﴾

## (عـظمة الحق)

لە چەرخی( خەلیفە موعتەسەمﷺ) دا جەنگێکی خوێناوی ڕووی دا لەگەڵ ڕۆمە ستەمکارەکاندا, ئافرەتێکی موسڵمان بەدیل کەوتە دەستی ڕۆمەکان، ئافرەتەکە هاواری کرد, هاوارێك کە هەموو دڵێکی بەپەرۆشی خەمخواردووی دەخستە دڵە کوتەوە ووتی: ئەی موسڵمانانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هاوارە ؟ ئەی پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری خوداﷺ هاوارە .؟ ئەی خەلیفە موعتەسەم هاوارە، خەلیفە هاواری ئەو ئافرەتە موسڵمانەی بیست،نامەیەکی بۆ پادشای ئیمپراتۆریەتی ڕۆم نوسی, بەو شێوەیە لەبەندەی خواوە، موعتەسەم سەرکردەی موسڵمانان بۆ نێن(نهێنی) گری سەگی ڕۆم هەرکاتێك ئەو نامەی منت گەیشتە دەست خێرا ئەو ئافرەتە موسڵمانە بەردەدەی دەنا سوێند بەو خوایەی کە موحەمەدی بەڕاست ناردووە سوپایەکت بۆ ئامادە دەکەم سەرەتایەکەی لەلای تۆبێ و کۆتایی یەکەی لەلای خۆم بێت .

کاتێك ئەو نامە بەڕێ کراو گەیشتە دەستی پادشای ئیمپرا تۆری ڕۆم کە خوێندرایەوە هەموو گیانی هاتبووە لەرزە لەبەر قینو توڕەیی دەمارەکانی گرژو ئەستور ببون بەڵام لەبەر ترسی سوپای ئیسلام بەبێ چاری فەرمانی دا بەڕەڵایان کرد .

## ﴿گەورەو داد پەروەری ڕاستی ﴾

## (عـزة الحق)

سەرکردەی سوپای ئیسلام شێری بریسکەداری موسڵمانان (خالیـد ی کوڕی وەلیدﷺ) نامەیەکی بۆ کیسرای پادشـای ستەمکاری فـارس نـارد لەنامەکەیدا نوسی ئەی کیسرا موسڵمان ببـە ؟ لەدەوری نەزانی و ئاگرپەرستی دوور بکەوە دەنـا سوێندبە خـودای گـەورە سـوپایەکت بـۆ سـەر دەنێرم کـە ئامـادەی گیـان نەویستی و خۆبەخت کردن بـن : هـەروەك و ئێـوەش ئامـادەی ژیـانی نـەبڕاوەو ستەم و ناڕەوان : کاتێك نامـەی سـەرکردەی سـوپای ئیسلام گە یشتە دەستی کیسرای ستەم کاری فارس .خێرا کیسرا نامەیەکی بۆ پادشـای ئیمپراتۆریـەتی سین نوسی لە نامەکەدا داوای یارمـەتی و بەهاوار گە یشتنی لێ کرد :پادشـای سین لە وەڵامی نامەکەیدا ووتی: ئـەی کیسرا تـۆ دەتـەوێ بەگژنەتەوەیـەکمان دا بکەی ئەگەر بیانەوێ کێوی گەورە لەبن دەربێنن دەری دەهێنن, بۆیـە ئامادەنیم فەرمانەکەت بەجێ بێنم .

## ﴿ ئەو ئادەمیزادەی گەورە ترین پاداشتی هەیە﴾

## (أ عـظم الناس أ جرا )

ڕۆژێـك پێغەمبـەری پێـشەوای مرۆڤایـەتی(ﷺ) ڕۆیـشتە نـاو کۆڕێـك لـە یارەکانی دا پێی ووتن: ئایا ئێوە باوەڕی چ کەسێکتان بەلاوە زۆر گەورەیە .؟ ئەوانیش ووتیـان : فریـشتەکانی خـودا پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: بۆئەوان نییە باوەڕ نەهێنن چونکە ئەوان لەبەر دەستی قودرەتی خودان،خودا لەسەر ئەو بیرو بـاوەڕەوە ڕامـی کـردون بەدەسـتی خۆیـان نیـە، هـەردەبێباوەڕداربن, ئـەمجارە یارەکان فەرموویان: باوەڕی پێغەمبەران(ﷺ) لە هەموو باوەڕێك گەورەترن .؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ ئەوانیش نیە باوەڕ نەهێنن و, باوەڕی ئەوانیش زۆر گەورەنی یە، چونکە ئەوانیش پەیام ( وحی ) دادە بارێتە سەریان، یارەکان ئەوجار فەرموویان: بیروباوەڕی ئێمە لەهەموو باوەڕێك گەورەترە .؟پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بیروباوەڕی ئێوەش گەورەنییە چونکە چۆن باوەڕ ناهێنن کە پێغەمبەر(ﷺ) لەناوتان دایەو لەگەڵتان دەژیا .

یارەکان ووتیان: ئەدی باوەڕی کێ لە هەموو باوەڕێك گەورەترە ئەی نێردراوی خودا .؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەتەوەیەك لەدوای من دێن قورئان وبەرنامەی ئاین دەبینن لەبەینی دووشتی زۆر گەورە دایە بەزەحمەتەوە بەدەست دەکەوێ!. بەلأم ئەو نەتەوەوکۆمەڵەیە باوەڕی پێ دێنن و ڕەفتاری پێ دەکەن, بەڕاستی ئەوانە نەرەو دەرەجەیان زۆر گەورەیە .

## ﴿چەند نمونەیەك لە ئارام گرتن﴾

### (أ مثا ل في الصبر)

دەگێڕنەوە جارێك پێشەوا ( عبدالله ی کوڕی عەباس ﷺ) خۆی ئامادە دەکات و سواری ولأغەکەی دەبێت بەسەفەر دەڕوات, کابرایەکیش زۆر بەهەڵەداوان وخێرا بە دوای دا دەڕوات دەی گاتێ و پێی دەڵێ ئەی (عەبداللە ی کوڕی عەباس ﷺ) خودا جەزات بداتەوە, هەرکە لەماڵ دەرچووی کوڕەکەت کۆچی دوایی کرد منیش بەو هەواڵە ناخۆشە دڵ تەزێنەوە هاتوم ئاگادارت بکەم !.

(عبداللە ی کوڕی عەباس ﷺ) کە خەبەرەکەی پێ گەیشت لە سواری ولأغەکەی دابەزی و دوورکات نوێژی دابەست زۆر بەکڕنۆش و(خشوع) موە لە دوای سەلام دانەوە کابرا ووتی: ئەی عەبدوالله بەڕاستی من لە باوەڕی تۆ سەر سام بووم من خەبەرم پێدای کە کوڕەکەت کۆچی دوایی کردوە کارەساتێکی دڵ

تەزێنە تۆش هیچ دڵ تەنگیت دەرنەبڕی و پێشوازی هەواڵەکەت بە نوێژ دامەوە؟ .

(عبدالله ی کوڕی عەباس ﷺ)فەرمووی:ئەی برام ئەوئایەتەت نەخوێندۆتە وە کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَيَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾البقرە/١٥٣.

واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەبڕواتان هێناوە یارمەتی داوا بکەن لە سەر ئەو ناخۆشیانەی کەلەو ڕێگایەدا توشتان دەبێ بەخۆڕاگرتن و نوێژ کردن، بەڕاستی خودا هەموو کاتێك لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کەدان بەخۆیاندا دەگرن و, لەبەر باری ڕۆژگاردا ڕادەوەستن و بەئارام و لەسەرە خۆدەبن.

## ﴿پاڕانەوەی دار﴾

## ( دعاء شجرة)

ڕۆژێکیان (ئەبو سعیدی خودری ﷺ) بۆ لێکدانەوەی خەونێك کەدیویەتی دەچێتە لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: یارسول الله ﷺ لەخەوم دا لەبن دارێك دانیشتبووم گوێم لە دارەکە بوو سورەتی (ص)ی دەخوێند کە گەیشتە ئایەتی (سجد ە) کڕنۆشی بۆ خودا برد،وەگوێم لێ بوو لە کڕنۆشەکە یدا دەی ووت .

(اللهم اكتب لى بها عند ك اجراً، وحط عنى بها وزراً, واجعلها لى عند ك ذخراً، وتقبلها منى كما تقبلتها من عبد ك داود،)

واتە: خودای گەورەو میهرەبان بەهۆی ئەو کڕنۆشەوە چاکە یەکم بۆ بنوسەو تاوانێکم لەسەر ڕەش بکەوەو بۆم بکەیە تێشوی دوا ڕۆژم و لێم وەربگری،هەروەك و لەبەندەی خۆت حەزرەتی داودت وەرگرت. کاتێك ئەبو سعید خەونەکەی گێڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر چاك گوێی بۆ ڕاگرت، دوایی

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو سعید تۆ کڕنۆشت نەبرد ! ئەبو سعید وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کڕنۆشم نەبرد: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەتۆ زۆر پێویست تر بووی لەدارەکە ! کڕنۆش بەری. ئەبو سعید دەڵێ هەر لەوکاتەدا چاوم بە پێغەمبەرﷺکەوت کڕنۆشی برد لە کڕنۆشەکەی پێغەمبەردا گوێم لێبوو ئەو دوعایەی دەخوێند کە گوێم لەدارەکە بوو دەی ووت

## ﴿ پێنج نیشانەو ئایاتی قورئان ﴾

## (ألآيات الخمس)

دەگێڕنەوە لە( عبدالله ی کوڕی مەسعودﷺ) فەرموویەتی: پێنج ئایات لە قورئان دا زۆر کەیف خۆشیان کردوم : هەموو دونیاو ئەوەی لە دنیاش دا هەیە بەو شێوەیە کە یف خۆشم ناکات،خودا دەفەرمویَ:

١- ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً﴾ نساء/٣١.واتە: ئەگەر خۆتان بپارێزن و دور بکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی کەلێتان یاساغ کراوە, ئەوا ئێمە کۆمەڵە تاوانە بچوکەکانتان لەسەر دادەپۆشین بە بەخشندەو میهرەبانی خۆمان .

٢- ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْراً عَظِيماً﴾ نساء/٤٠.

واتە: بەڕاستی خوای بەخشندەو میهرەبان کردەوەی ئادەمیزاد کەم ناکاتەوەو, ستەمی لێناکات, بەئەندازەی گەردیلەیەکیش بچوکتر ئینجا ئەگەر ئەو ووردیلە بچوکە کردەوەی چاکەبوو ئەوە خودای میهرەبان پاداشتەکەی زۆر دەکات بەو شێوەیە کە خۆی ئارەزوی لێیە وەبەخاوەنی کردەوە باشەکە زۆر بەخشیشی دەداتێ .

٣- ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّاباً رَّحِيماً﴾ نساء/٦٤.

واتە:ئێمە هیچ نێردراوێکمان نەناردوە تەنها بۆئەوەی بەفەرمانەکانی خودا ڕەفتاربکات ئەو بێ باوەڕانە لەو کاتەی ستەمیان لەخۆیان دەکرد بەهۆی نارەوایی ئەگەر بهاتبانایە لای تۆو داوای پەشیمانیان لەخودا بکردایە بە بیروباوەڕێکی ڕاستەوە : وە پێغەمبەری خوداش داوای لێ خۆش بونی لە خودا بکردبایە ئەوە بەڕاستی خودای گەورە زۆر میهرەبانە پەشیمانی لێ وەردەگرتن .

٤- ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْماً عَظِيماً﴾نساء/٤٨.

واتە: بەڕاستی خودای گەورە چاوپۆشی لەو کەسانە ناکات کە هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن بەڵام . چاو پۆشی لەهەموو تاوانێکی کە دەکات, گەورەبێت, یان بچوك،بۆ ئەوانەی کە خواستی خودای لەسەربێت،وە هەرکەسێك شەریك بۆ خودا بڕیار بدا ئەوە بەڕاستی تاوانێکی زۆر گەورەی کردووە, وە درۆیەکی گەورەشی بە خواوە هەڵبەستووە .

٥- ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾ نساء/١١٠.

واتە: هەر کەسێك کردەوەیەکی ناڕەوا بکات, ستەم بەخەڵك بکەیەنێ, یان ستەم بە گیانی خۆی بکەیەنێ, وە لەدوایی دا پەشیمان بێتەوە داوای لێ خۆش بوون لە خودای بکات بە دڵێکی پاك و باوەڕێکی ڕاست، ئەوە بەبێ دوودڵی خودا لێی خۆش دەبێت، بەڕاستی خودا تاوان بەخش و میهرەبانە .

## ﴿ماڵ ئاوا ئەی کوڕی مەسعود رضي الله عنه﴾

## (وداعا يا إبن مسعود رضي الله عنه)

دەگێڕنەوە جارێك: (عوسمانی کوڕی عەفان رضي الله عنه) دەچێتە لای (عبدالله ی کوڕی مەسعود رضي الله عنه) کە لەنەخۆشی ترسناکی مردن دا دەبێت ،حەزرەتی عوسمان دەفەرموێ: ئەی کوڕی مەسعود سکاڵای چیتە.؟ ئەویش دەفەرموێ :

بەخودا تەنها هاوارو سکاڵای تاوانە زۆرە کانمە .
حەزرەتی عوسمان دەفەرموێ : ئەدی هیوای چیت هەیە .؟
عبدالله دەفەرموێ : هیوای میهرەبانی خودا .
حەزرەتی عوسمان دەفەرموێ : ئەدی ترست لەچی شتێکە .؟
عبدالله فەرمووی : تەنها لە عەزابی خودا دە ترسم .
حەزرەتی عوسمان دەفەرموێ: بچم پزیشکت بۆ بهێنم بۆچارە سەری .؟
عبدالله فەرمووی: پزیشکی چم بۆ لادێنی . ئەدی پزیشك نەخۆشی نەکردووم ؟.

لە دوایی دا ئەو ئایەتەی خوێندەوە دە فەرموێ ( کل من عند الله).
واتە: هەرچی بەسەرمان د ێت لە خێرو خۆشی و سزاو نەخۆشی هەمووی لەلای خوداوەیە .

وە لەدوای ئەو ئایەتە ئەوەشی خوێندەوە:دەفەرموێ:﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّهُ لَنَا هُوَ مَوْلاَنَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾التوبه/٥١.
واتە: ئەی پێشەوای مرۆڤایەتی بەکۆمەڵانی خەڵك ڕابگەیەنە بە هیچ شێوەیەك توشی سزاو ئازار نابن تەنها ئەو سزایانە نەبێ کە خودای گەورە بۆمانی نوسیبێ . وە ئەو بەڵایانەش کە خودا بۆمانی نوسیوە زۆر بەدڵ خۆشیەوە پێشوازی لێ دەکەین . حەزرەتی (عوثمان) یش دەفەرموێ: وەسیەت بۆچوار کچەکەت و دوو کوڕەکەت بکە لەسەروەت و ماڵ . کوڕی مەسعود فەرمووی: چۆن داوای ماڵ دەکەم بۆیان کە سوڕەتی واقعەم لە قورئانی پیرۆز بۆ بەجێ هێشتوون هەرچی کەسێك لەسەرەتای بەیانیدا بیخوێنێ خودای گەورە ئەو ڕۆژە لە هەژاری دەی پارێزێ .

## ﴿باس کردنی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ لەتەورات دا﴾

## (ا وصاف ا لرسول عـليه الصلاة والسلام فی التوراة )

جارێك پرسیار لە (عبد الله ی كوڕی عومەری كوڕی عاس ﷺ ) كرا ووتیان : ئەی عبدالله نەختێك ڕەوشتی پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆ باس بكە كە لەتەوڕات دا باس كراوە .؟

عبدالله فەرمووی: ئەو ڕەوشتە بەرزانەی كە لە قورئان دا باس كراوە هێندێك لەوڕەوشتانە لە تەوڕات دا باس كراوە، كە خودای گەورە لە باسی ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) لە تەوڕات دا فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی تۆمان ڕەوانە كرد بۆ ناو كۆمەلأنی خەلك،بەڕاست بێژو مزگێنی دەر بەرامبەر ئەوانەی ڕێگەی ڕاستی دەگرنەبەر : وەڕەوانمان كردی بە ترسێنەر بەرامبەر بەوانەی كەدان بەحەق و ڕاستی دا ناهێنن, وە پزگار كەرو,پارێزگاری بۆ میللەتان بۆ هاندانیان بۆ ڕێگای ڕاست، وە ئەتۆ بەندەی منیو نێردراوی ڕاستە قینەی منی پشت ئەستور و بەباوەڕی بۆ فەرمانەكانی من ناوم ناوی هیوای بەرز، وە غەرەزو قینت نیە و. توندو تیژو توڕەنیت وە لە بازاڕو قەرەباڵغی دا هەرات نیەو لەسەرە خۆی . وە بەرامبەر خەراپە تۆڵە ئە ستێنەوە نیت, تەنها ڕەوشتی بەخشینو چاوپۆشیو لێبوردنت لێ بەدی ئەكرێ, وەخودا گیانی ئەو پێغەمبەرەی ناكێشێ هەتا ئەو گەلوكۆمەڵە ڕەوشت خوارە دوور لە مرۆڤایەتی یە بەخەبەر نەهێنێ و ڕاستی نەكاتەوەو بەیەك دەنگ نەڵێن (لاإلـه إلا الله) وە چاوی كوێر ڕۆشەن بكاتەوەو گوێی كەڕ سوك بكاو, مێشكی بێ هۆش بێنێتەوە هۆشو, گیانی بێ ئاگا بەخەبەر بێنێ .

## ﴿ ڕەوشتی کڕیاری یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

### (معاملة الصحابة)

دەگێڕنــەوە (جــەریری بەجــەلی رضي الله عنه ) یــەکێك لــە یارەکــانی پێغەمبــەر(ﷺ) بەندەیەکی نارد بۆ ئەوەی ولآغێکی بۆ بکڕێ, بەندەکە ڕۆیشت مەیدانی ولآغ فرۆشــتن, ولآغێکــی دیــاری کــردو ووتــی: ئــەو ولآغــە بەچــەند دەفرۆشــی .؟ فرۆشیارەکە ئاگا دری بازاڕ نەبوو ووتی: بەوەندە پارە دەیفرۆشم, بەندەکە ووتــی : ڕازیــم بــا بــڕۆین بــۆلای گەورەکــەم بــۆ ئــەوەی پارەکــەت بــداتیێ, بەندەکە ڕێــشمەی ولآغەکــەی ڕاکێشاو لەگــەڵ فرۆشــیارەکە ڕۆیــشتن بــۆلای جــەریری، جــەریر پرســیاری لەبەندەکــە کــرد ؟، ئــەو ولآغــەت بەچــەندی لــێ کڕیــوە .؟ بەندەکەش وەڵامی جەریری دایەوە بە (٤٠٠)چوار صەد درهەم ڕێك کەوتوین، جەریر ڕوی کردە فرۆشیارەکەو پێی ووت : ئەو ولآغە بە (٥٠٠) پێنج صەد درهەم دەفرۆشی .؟ بە(٦٠٠) شەش صەد دەی فرۆشی ؟ کابرای فرۆشیاریش بێ دەنگ بوو، جەریر هەر بۆ خۆی دەی ووت: بە (٧٠٠)حەوت صەد درهەم دەی فرۆشی .؟ بە (٨٠٠) هەشت صەد درهەم دەی فرۆشی .؟

دوایی کابرای فرۆشیار ووتی: من شتی وام نەدیوە تاكو ئێستا کڕیار پارە زیاد بکات ؟ جەریری بەجەلی هاتە وەڵام و ووتی: پەیمانم لەگەڵ پێغەمبەری خــودا دا(ﷺ) کــردوە لــە ســەر ئامۆژگــاری ڕاســتی, بــۆ هــەموو موســڵمانێك, وەنرخــی تــەواوی ئــەو وولآغــەش (٨٠٠) هەشــت ســەد درهــەم دەهێنــێ، ئەگــەر منیش بە کەمتر لێت وەربگرم، مانای وایە خیانەتم لە پەیمانی پێغەمبەر(ﷺ) دا کردووە .

## ﴿ لە نزاو داخوازی وەرگیراو﴾

### (من د عوات الجا بین)

(ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: کابرایەك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەقەبی (ئەبا معلق) بوو توجاڕێکی گەورە بوو شتی بۆخۆی و، بۆخەڵکانی تری دەهێنا وە ئینسانێکی خۆپارێزو بەتەقوا بوو .
ڕۆژێکیان بە ماڵێکی زۆرەوە بۆ تیجارەت دەڕوا لەڕێگایەکی سەخت و پڕمە ترسی. لەناکاودا لە جێگەیەك توشی بە توشی جەردەو ڕێگران دەبێت, لەکەمیندا توندو چاپوك ئامادەو پڕچەك ڕاوەستاوە .
هاواری کردو وتی: ئەوەی پێتە فڕێی بدە دەنا دەت کوژم . کابرایبازرگان و توجار وتی:چیم پێیە دەت دەمێ تۆ دزی سەروەت و ماڵی،نەك کوشتن ولەنا و چون، کابرای دز توڕە بوو وتی: من ماڵم ناوێ تەنها خوێنی تۆ نەبێ .؟ کابرای بازرگان چەندی لەگەڵدا کردی چاری نەبوو بۆیە وتی: ڕێگەم بدە نوێژێك بکەم . دزە وتی: ڕێگەت دەدەم نوێژ بکەی خێرا بازرگانەکە دەست نوێژی هەڵگرت و نوێژی دابەست و دەستی کرد بە پاڕانەوە لەبەر قاپی فراوان و میهرەبانی خودا ئەو دوعایەی دەکرد:

( یا داود, یا ذا العرش المجید, یا فعالا لما یرید واسألك بعزتك التي لاترام الذي لاینام, وبنور وجهك الذي ملأ أركان عرشك ان تكفيني بشر هذا المن, یا مغیث اغثني)

واتە: ئەی خۆشەویست خودای گەورە ئەی خاوەنی تەختی بەختیار, ئەی کاربینی بەدەسەڵات داوات لێدەکەم بەو گەورەیی خۆت, کە کەست لەوێنەو ڕەنگ نیە, گەورەیەکەشت سەرەتایی و کۆتایی بۆ نیە, ئەی خاوەنی موڵکی لەنا و نەچو, بەڕوناکی پڕشەنگێکی ئەوتۆ کە هەموو دونیای پڕ کردووە, لە سزاو ئاژاوەی ئەو دزە بم پارێزی؟ ئەی بەهاواری هاوار کاران، بە فریام کەوە لەدەستی ئەو دزە ستەم کارە لە خودا نەترسە ڕزگارم بکە ؟. سێ جار ئەو

پاڕانەوەیەی دووبارە دەکردەوە هەر لە دوعاو نزا کردنەکەدا بوو، کە سوارێکی چاپوك پەیدا بوو ڕمبێکی بە دەستەوە بوو، لەبەرچاوم بەرزی کردەوەو بە هەموو هێزی لە نێوشانی دزەی ستەم کاری داو گیانی دەرچو !! ئەوجا بەڕوییەکی خۆش ڕووی لە بازرگانەکە کرد، بازرگانەکەش وتی: ئەتۆکێی کە خودا بەهۆی تۆوە منی لەدەستی ئەو ستەمکارە ڕزگار کرد ئەویش وتی: من فریشتە یەکی خودام لە ئاسمانی چوارەم دادەنیشم یەکەم جار : کە پاڕایەوە گوێم لەدەرگاکانی ئاسمان بوو دەلەرینەوە، وەکە دووەم جار پاڕایەوە: گوێم لە دانیشتوانی ئاسمان بوو نزاو هاواریان بوو، کە جاری سێهەم: پاڕایەوە پێیان وتم : پاڕانەوەکەت وەرگیراوە، داوام لە خودا کرد کە ئەو ئیشە بەمن بسپێرێ بۆ کوشتنی ئەو ستەم کارە منیش هاتم و لەناوم برد لە دوایی دا وتی: مزگێنی بدەو بزانە : هەرکەسێك دەست نوێژ هەڵبگرێ و چوار ڕکعات نوێژ بکات و بەو نزاوپاڕانەوە لە خودا داوا بکات،داواکەی وەردەگیرێ ستەم لێ کراو بێت، یان ستەم لێ نەکراوبێت .

## ﴿ ئا فرە تانی زاناو شارەزا ﴾

### ( نساء عالمات)

دەگێڕنەوە (أم درداء)(رضي الله عنها) یاری پێغەمبەری خودا، ئافرەتێکی زۆر زیرەك و لێهاتو بوو دەرسی زانیاری و زانستی دەوتەوە بەو ئافرەتانەی چەرخی خۆی لەمزگەوتی ئەمەوی لە دمشق دا .

کاتێك سەرکردەی موسڵمانایان ئاگادار کرد بەوەی کە (أم درداء) دەرس دەڵێتەوە سەرکردەی موسڵمانان (عبدالملك کوڕی مەڕوان ﷺ) زۆر ئارەزووی کرد بڕوا گوێی لە دەرسەکانی بگرێ بۆ ئەوەی زانیاری لێ وەرگرێ لە مزگەوت پەردەیەکیان بۆ نێوانی ئافرەتەکان دروست کرد (عبدالملك )دەڕۆیشت لە دوای پەردەکەوە دادە نیشت گوێی لە (أم درداء) دەگرت بۆ فێربوونی تە فسیرو شەرع و حەدیس .

## ﴿ کچانی با وەڕدار﴾
(فتاة مؤمنة)

دەگێڕنەوە جارێك خواردنێکیان بۆ( ڕابعەی عەدەوی). برد لە تەمەنی شەش ساڵیدا ڕابعە خواردنەکەی نەخوارد باوکی پێی ووت: کچم چی دەبێت کە ئەو خواردنە بخۆی لە وەڵامدا ووتی: ئەی بابە ئەو خواردنە ناخۆم تاك و نەزانم ڕەوایە(حلال) یان ناڕەوایە(حرام).باوکی ووتی: ئەگەر ئەو خواردنە ناڕەوا بوو هیچی کەمان دەست نەدەکەوت ئەو کاتە چی دەکەی .؟ووتی:بابە لەسەر برسیایەتی ئەو دونیایە ئارام دەگرم, ئەوەم باشترە لەسەر ئارام گرتن لەسزای ئاگری دۆزەخ لەڕۆژی دوایی.

## ﴿ چەند وەلامێکی هەڵقـولاو بە ووتـاری ڕاست و ئامۆژگاری﴾
(إ جابات تنضح بالحكمة والموعظة )

دەگێڕنەوە جارێك (عومەری کوڕی عبدالعزیز) بەزیادی کوڕی ئەبی زیادی ووت: ئەی زیاد بەڕاستی زۆر لەو خودایە دەترسێم بەهۆی ئەو شتانەوە کەتێی کەوتوم لە وەڵامدا زیاد ووتی : من لەوەی لێت ناترسێم, کە لێی دەترسێی. بەڵکو لەوە لێت دەترسێم کەلێی ناترسێی، جارێك بەڕابعەی عەدەویان ووت : تۆ ئافرەتێکی بە تەنها ناتوانی ئیشی ماڵەوە هەموو بکەی و, بۆ ئەوەی هاوەڵێکیشت هەبێ ئەگەر داوا لەخزمەکانت بکەی خزمەت کارێکت بۆ بگرن زۆر چاك بوو,پێویستی ماڵەوەیان بەجێ دەهێنا ؟ لەوەڵامدا ووتی: سوێند بە خودای گەورە شەرم دەکەم لە خودای گەورە کە خاوەنی هەموو دونیاو،ئەوبوو نەوەرەیە.

داوای ماڵی لێ بکەم، ئینجا چۆن داوای ماڵی دوونیا لە کەسێك دەکەم کە هیچی نیە !!.جارێك حەزرەتی (عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ) بە (عامری کوڕی عبدالقەیس ﷺ) ی عەنبەری ووت: کە عەرەبێکی بیابان نشین بوو، ئەی عامر خودات لە کوێیە ؟

لە وەڵامدا ووتی: خودای من هەموو کاتێك لە کەمیندایە .

وەجارێك بەباوکی (عەمری کوڕی عەلا ﷺ )یان ووت :ئایا شتێکی ڕەواوجوانە پیاو بەپیری بخوێنێ،سودو کەڵکی دەبێت ؟ لەوەڵامدا ووتی: ئەگەر جوان بوو بەکەڵکی ئەوە دەهات بژیاو ژیان بەرێتە سەر:ئەوا زۆرچاك بەکەڵکی‌خوێندن دێت .

## ﴿ دڵسۆزی﴾

## (الأخلاص)

دەگێڕنـەوە لـە چـەرخی پادشـای هـە شـتەمی ئەمـەوی( عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز ﷺ) گـورگ دەبـووە پاسـەوانی مـەڕو مـاڵات, شـوانێك ڕۆیـشتە لای خەلیفە عومەرو پرسیاری لێکرد ئەی سەرۆکی موسڵمانان چۆنیە ئێستا سەیر دەکەین گورگ پاسەوانی لە مەڕو مێگەڵ دەکات خەلیفەی موسڵمانان لە وەڵامدا فەرمووی: هەرکاتێك ئێمە دڵسۆزیمان نواند لە نێوانی خۆمـان و خودامـان داو دڵمان لەگەڵ یەکدا پاك‌و, خیانەتمان نەبوو, ئەوا خوداش دڵسۆزی لە بەینی گورگ و مەڕدا دەکات.

## ﴿ داردەست و گۆچانی درەوشاوە ورِوناك﴾

### (العـصا المضيئة)

(ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئێوارەیەك (ئەسیری کوڕی حەزیری ﷺ) و (عوبادی کوڕی بەشیر ﷺ) ئیشیان هەبوو لەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوون قسەیان دەکرد تابەشێك لەشەوێکی زۆر تاریك و سەرما بەسەر چوو, لە دوایی هەستان و بەرەو ماڵ گەڕانەوە،هەریەکەیان گۆچانێکی پێبوو, بە فەرمانی خودا ئەو گۆچانانە وەك‌ولایت بەرچاوی یەکتریان ڕوشەن دەکردو بە دوای ڕووناکیەکەدا دەڕۆیشتن, هەتاك و گەیشتنەوە ماڵەوە

## ﴿ دەست پاکی و میرنشینی﴾

### (أمانة وإمارة)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پوری خوشکی باوکی سەرکردەی موسڵمانان (عومەری کوڕی عبدالعزیز ﷺ) ڕۆیشت بۆ ماڵی حەزرەتی عومەر کە سەیری کرد وا عومەر چێشتی نیسکیان هەیەو لەگەڵ پیواز دادەی خوات پوری ووتی: ئەی عومەر من دەمەوێ لە خەزێنەی موسڵمانان شتێك زیاترم بۆ ببڕیەوە .؟
حەزرەتی عومەریش ﷺ هەر خێرا لەسەر خواردنەکەی هەستا ڕۆیشت درهەمێکی زیوی هێناو بەنهێنی لەسەر ئاگر سووری کردەوەو لەناو کیسەیەکی چنراوی هاوێشت فەرمووی: پورێ هائەوە زیادەیەو بۆم هێناوی پوریشی زۆر بە خۆشیەوە وەری گرت،لەگەڵ دەستی لێدا هاواری کردوو بێ هۆش کەوت, لە دوای ئەوەی کە بە هۆش هاتەوە ووتی: ئەی پورێ ئەگەر دەت زانی ئەوە حاڵتە و بۆ تۆزێك ئاگری دونیا خۆت ڕاناگری, ئەدی دەبێ حاڵی من و تۆ چۆن بێت و, چۆن خۆمان ڕابگرین لەبەر ئاگری دۆزەخ لەڕۆژی دوایی .

## ﴿ خواردنی ماڵی خەلیفە ﴾

### (طعام بيت الخليفة)

دەگێڕنـەوە خەلیفـەی موسـڵمانان( عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز) ڕەوشـتی وەهابوو لە دوای نوێژی خەوتنان تۆزێك دەڕۆیشتە لای کچەکانی و سەلامی پێ دەگەیاندن. شەوێك کە ڕۆیشتە لایان کچەکانی هەستیان کرد کە باوکیان هاتە ژوورێ دەستیان لەسەر دەمیان دانا بوو خێرا بەرەو دەرگا کەوتنەڕێ، حەزرەتی عومـەر بـە بـەخێو کەرەکـەیانی ووت: هـۆی چـیە ئـەمڕۆ کـچەکانم دەسـتیان لەسەردەم داناوەو دوور دەکەونەوەلێم،لە وەڵامدا ووتـی: ئێوارە تـەنها نیسكەو، پیوازمان خواردووە. خواردنی کەمان نەبووە، ئەوانیش پێیان ناخۆش بوو کە تۆ بۆنی دەمیان بکەی، خەلیفە عومەر لەو کاتەدا دەستی کرد بە گریان و، بە کچەکانی ووت: ڕۆڵەکانم چی سودێکتان پێ دەگات کە خواردنی جۆراو جۆر بخۆن و، فەرمان بە باوکیشتان بکەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ لە پێناوی خواردنی جۆراو جۆردا، کچەکانی کە گوێیان لە باوکیان بوو هەموویان دەستیان کردە گریان بە جۆرێك دەنگیان بەرزکردەوە .

## ﴿ لە ماڵی خەلیفەوە ﴾

### (بيت الخليفة)

دەگێڕنـەوە ئـافرەتی موسـڵمان( فاتمـەی کـچی عبـدالملك ی کـوڕی مـەڕوان) تەربیـەتی لـە فێرگـای موسـڵمانانەوە وەرگرتبـوو: وە بەڕەوشـتی بـەرزو پـیرۆزی قورئـان جـۆش و پـەروەردە کرابـوو لـە بنەماڵەیـەکی گـەورەش پـەروەردە بـوو، باوکی( عبـدالملك ی کوڕی مەڕوان) بوو خەلیفە بوو، مێردەکەی (عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز) خەلیفـە بـوو هـەر چـوار برایەکـەی دەوری خەلافـەتیان

دیتبوو، وەلیدو، سلیمانو، یەزیدو، هیشام، کاتێك ئافرەتی موسڵمان فاتمە داخوازی کرا بۆ( عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ) وگواسترایەوە عومەر ئینسانێکی لێهاتو بوو بەلام تەنیا بوو وە نەچو بووە سەر کورسی خەلافەت، ئەو ئافرەتە خۆی ئارایش دەدا بەهەموو زێڕو جەواهێرێکەوە ئارەزو مەیلی زۆری لەجەواهێرات هەبوو.

بەلام: کاتێك( عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ) لەسەر کورسی خەلافەت دانیشت و ئەو پلەیەی پێدرا داوای لە فاتمە کرد ڕێگەیەك لە دووڕێگا هەڵبژێریَ، یان زێڕو گەوهەرەکانی کەشانازی پێوە دەکات، یان (عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ) ئەویش لە وەلامدا فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە ئەی عومەر هیچ لایەکتان هەڵنابژێرم. ئەو زێڕو گەوهەرە خاوەنی تەنهای خۆمم ئەوا هەموو زێڕو گەوهەرەکەم کەجێی شانازی خۆمن بە گەنجینەی موسڵمانانم بەخشی، بۆ ئەوەی بۆ هەژارو نەدارانی موسڵمانان خەرج بکرێت .

لە دوای ئەوە فاتمە ووتی: خوای گەورە من و تۆ بگێڕیَ بە بالاگەردانی خوداو پێغەمبەری خودا، هەموو ماڵەکەیان لە پێناوی خوادا بەخشی، خەلیفە سەرۆکی موسڵمانان بوو، پێخۆری نەبوو بیخوات، نانی بەهۆی خویَ چێژەکەیەوە دەخوارد .

ڕۆژێکی جەژن کچەکانی بە باوکیان ووت: ئەی بابە بەیانی جەژنە هیچ پۆشاکێکی نوێمان نیە لەبەری بکەین .؟خەلیفە عومەریش بەچاوێکی پڕقینەوە سەیری کردنو ووتی : ڕۆڵەکانم جەژنە بۆ ئەوە نیە پۆشاکی نویَ لەبەر بکەی!! بەڵکو جەژنە بۆ ئەوەیە زیاتر پارێزگاری بکەی و لەڕۆژی دوایی بترسێی.

لێپرسراوی گەنجینەی موسڵمانان ووتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان با موچەی مانگی داهاتویان لە ئێستاوە بۆ سەرف کەین، خەلیفە عومەر لە لێپرسراوی گەنجینە هاتە وەلام و ووتی: هەی دایکت ڕۆلە ڕۆت بۆ بکات، تۆ بە نهێنی(غیب) دەزانی کەئاگادار بیت بەوەی ڕۆژێك لەمڕۆ بەدواوە دەژ یەین ؟.

## دۆستی باوەڕداران

بەو شێوەیە خەلیفە عومەر ڕۆژی بەڕێ دەکرد, کاتێك نزیکی مەرگی هات و نەخۆشی مردن بەرۆکی گرت، یانزە منداڵی هەبوو لە کوڕو کچ, خەڵك دەچونە لای بۆ هەواڵ پرسینی و پرسیاریان لێ دەکرد ئەی عومەر چیت بۆ ئەو منداڵانە بەجێ هێشتووە .؟

لە وەڵامدا دەی فەرموو: ئەگەر تەقوای خودا بکەن و خۆپارێز بن ئەوە سەرچاوەی هەموو شتێکیانە کە بۆم بەجێ هێشتون, چونکە ئینسانی خۆپارێزو ڕەوشت چاك, خودا ئیش و کاریان بەڕێوە دەبات, وە ئەگەر ئینسانی بەد بەخت و ڕەوشت خوارو نزم بن ئەوە نامەوێ شتێکیان بۆ بەجێ بهێڵم کە لەسەر گوناهو ناڕەوا یارمەتیان بدەم, چونکە ئەگەر کردەوەی باشیان نەبوو ماڵیان بۆ بەجێ بهێڵم لە کردەوەی ناڕەوا سەرفی دەکەن و بۆ منیش دەبێتە یارمەتی دان لەسەر تاوان. دوای خەلیفە عومەر فەرمووی: بە هەواڵ پرسەکانی بڕۆن‌و دەورەم چۆڵ بکەن لەو کاتەش دا خێزانی ئەمین و بەوەفای هاتە ژورەوە هەواڵی نەخۆشیەکەی لێ پرسی.؟

خەلیفە عومەر فەرمووی: ئەی فاتمە ئەتۆش بڕۆ دەرێ و دەورەم چۆڵ بکە . بەڕاستی جۆرە کەسێك دەبینم کێشەیانە لەسەر شوێنەکەم ؟ ئەی فاتمە بڕۆ دەرێ ؟.جۆرە بنیادەمێك دەبینم بێگانەن لەبەرچاوم دوو باڵیان هەیەو ئێستا نەبێ شتی وام بەچاو نەدیتوە بڕۆدەرێ کاتی ئەوە هاتووە کە ئاوارەو دەربەدەر بە جێگەی خۆیان شادمان بن!! کاتی ئەوە هاتووە کەغەریب و دەربەدەر پەروەردگاری خۆیان ببینن, وەکاتی ئەوە هاتووە کە بۆ ماڵی هەتا هەتایە بگەڕێنەوە, بڕۆ دەرێ ئەی فاتمە کاتی ئەوە بەسەر چوو کە تۆ لەلای من بیت . ئێستا لای من تەنها جێگەی چەند ئەندامێکی نورانی دووباڵ و, سێ باڵ و، چوار باڵن, بڕۆ دەرێ؟. کاتی ئەوە هاتووە کە گیان خۆی جوان و ڕازاوە دەکات, چونکە دەڕوا بۆ خزمەتی خوای میهرەبان, میوانی پەروەردگاری دەبێت,وە حەزرەتی عومەر لەو کاتەش دا کەکاتی کۆتایی ژیانی بوو، قورئانی پیرۆزی

## دۆستی باوەڕداران

زۆر بەڕێکی دەخوێندو کۆتایی ژیانی بە خوێندنی ئەو ئایەتە هێنا کە دەفەرموێ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ القصص/٨٣.

واتە: ئەو ماڵەی ڕۆژی دوایی دەی دەینە ئەو کەسانەی کەلەوسەرزەوی یە خۆیان بە گەورە نازانن و لەسەر ڕێبازی قورئان و سونەتی پێغەمبەر بە ڕێگەدا دەڕۆن و سەریان بۆ فەرمانەکانی خودا کەچ دەکەن و, مل هوڕی و کەللە کۆنی بەکار ناهێنن و ستەمکاریان بۆ خۆیان و, کۆمەڵیان ناوێت, وە بەڕاستی ئەنجامی باش بۆ ئەو کەسانەیەکە خۆیان لە تاوان باری دەپارێزن هەتا دەگەنە ئارەزو مەبەستی خۆیان

بەڵێ لە کۆتایی ئەو ئایەتە . کۆتایی بە ژیانی ئەو دونیایە هێنا خەلیفە عومەر کۆچی دوایی کردوماڵ ئاوایی هەتا هەتایەی لەودونیایە کردوبرد یانە گۆڕستانو لە ژێر گڵ دا شاردیا ئەوە کە بەڕاستی موسڵمان و دادگەربوو, کۆمەلأنی موسڵمانان لەسەر دەمی ئەو خەلیفە بەڕێزەدا بەڕاستی بووژا بوونەوە ژیانێکی پڕ لە کامەرانیان بەدەست هێنا, چونکە بەڕاستی فەرموودە بەرزەکانی قورئانو ڕەوشتی پێغەمبەرو ڕێبازی ئیسلامیان پەیڕەوی لێ دەکرد بۆیە بەو شێوەیە ژیانیان پڕبوو لە خۆشی و کامەرانی بە هەزاران هەزار جار درود و ڕەزای خودا لەسەر ئەو خەلیفە هەرگیز نەمرەو هەموو خەلیفە موسڵمانە ڕاستەکان و هەموو موسڵمانانی ڕاست و ڕاستی پەرست بێت. ئینجا لەدوای ئەو خەلیفە بەڕێزە کە لەژێر گڵ شارایەوە، (یەزیدی کوڕی عبدالملكﷺ) لەسەر کورسی خەلافەت دانیشت کە برای خاتونە فاتمە بوو:

ڕۆژێك لە دەرفەتێك دا یەزید بە فاتمەی ووت: خوشکم زۆر چاك دەزانم خەلیفە عومەر هەموو زێڕو گەواهیری ماڵەکەی لێ سەندوی و هاویشتویەتیە خەزێنەوە. ئێستا ڕێگەم دەدەی زێڕو جەواهیرەکانت بۆ بنێرمەوە خاتو فاتمە ووتی: ئەوە چی دەڵێی یەزید .؟

تـۆ دەتـەوێ شـتێك هەڵبگرمـەوە خەلیفـەی موسـڵمانان لـە خەزێنـە دای نابێت،سوێند بـەو خودایـەی کـە کەسـی لـە ڕەنـگ و شێوە نیـە وە تەنهایـە لـە خودایەتیـدا لـە ژیانی عومـەردا حـەزو ئارەزوی ئەوماڵـەم نـەکردووەو دڵـم پێـی نـەداوە, بـە مردنـی عومـەریش حـەزی پێناکـەم و،خۆشـم نـاوێ و, ڕقـم لێیـەتی بەڕاستی فاتمە خاتون ماڵی خەلیفە عومـەری عبدالعزیز‌ی بەجێ نەمێشت لـەدوای مردنـی هـەتا کۆچـی دوایـی کـردو لەسـەر شـانی پیـاوان بردیـان بـۆ گۆڕستان :ماوەی خەلافە تی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) دووسـاڵ و شـەش مـانگ بـوو,کـەمرد لـە تەمـەنی گەنجیـدا بـوو تەمـەنی چـل سـاڵ بـوو وە جیهـادو تێکۆشـان لـە چـەرخی ئـەو خەلیفـە موسـڵمانەدا لـەلای ڕۆژئـاوا وە گەیـشتە (پاریس) وە لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتە (چین) وە لە (ئە سپانیاو) (پرتوگال) یش فەرمانی ئەوان بەڕێوە دەچوو.

## ﴿ پەند وئامۆژگاری بۆ فەرمان ڕە وایان﴾

## (عـظة للحکام )

لە چەرخی خەلافەتی عەباسیەکان،لەو ڕۆژەی کەخەلیفە (مەنسور) پـەیمانی دەبە ست ڕۆژێکی شادی و خۆش بوو، ڕۆژی ئاهـەنگی خەلافـەتی موسڵمانان, کـە بمانـەوێ دڵ خـۆش و شـادمان بـین بـە هـەبوونی دەوڵـەتی موسـڵمانان, لـەوکاتی ئاهـەنگ گێڕانـەدا, لـە پڕێکدا زانایـەکی لێهـاتوو کـە بەڕاسـتی زانـای جەنگاوەر بوو. ووتـەی خۆش و ڕاست و بـەجێی دەکرد، هاتـە نـاو کۆڕەکـەوە, خەلیفـە مەنـسور سـەیری کـرد ووتـی: سـوێند بـە خـودای میهرەبـان زانـای جەنگاوەر تەنها بۆیە هاتۆتە لامان کەئەو ڕۆژە خۆشەمان لێ بشێوێنێ لە دوای ئەوەی کەزانای جـەنگاوەر لـەناو کۆڕەکە دانیشت، خەلیفە (مە نسور) ووتـی: ئـەی جـەنگاوەر ئامۆژگاری یـەکم بکـە زاناکـەش فـەرمووی: ئامۆژگاری چیت لێ

بکەم .؟ ووتی لەو بارەوە بێ کە بۆخۆت دیتوتەو چاوت پێی کەوتووە,یان لەو بارەوەبێ کە بیستوتە, خەلیفە هاتە وەلاّم و: ووتی: باثامۆژگاری یەکە لەوبارەوە بێ کەدیتومە, زانای جەنگاوەر ووتی: خەلیفە (عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ) کاتی کۆچی دوایی کرد, یانزە کوڕی لە دوای بەجێ هێشت،وەهەموو سەروەتەکەشی (١٨) هەژدە دینار بوو, بە(٤) چوار دینار کفنەکەی بۆ کڕدرا بۆ خەلاّت, وە گۆڕەکەشی بە(٥) پێنج دینار بۆ کڕدرا( ٩) نۆ دینار مایەوە بەسەر منداڵەکانی دابەش کرا لەکاتی نەخۆشی کۆچ کردنی دا لەبارەی منداڵەکانیەوە پرسیاریان لێ کرد ئەی عومەر چیت بۆ منداڵەکانت بەجێ هێشتووە ؟ لە وەلاّمدا فەرمووی :دوو ڕێگەیان هەیە یان موسڵمانی ڕاستە قینەن و خۆ پارێزو لە تەقوادان.

ئەو کاتە خوای گەورە دەرگای خۆش بەختیان بۆ دەکاتەوە, یان تاوان بارن، ئەو کاتەش هیچیان بۆ بەجێ ناهێڵم ببێتە یارمەتی دانیان لەسەر تاوان باریە کەیان وە جارێك سەرکردەی موسڵمانان (عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ ) ویستی زەوی یەك بکاتە وەقف بۆ موسڵمانان یەکێك لە کوڕەکانی ئەو هەواڵەی کاتی پشودانی نیوەڕۆ کەوتە بەرگوێ, وەهەر لەکاتی بیستنی هەواڵەکە خێرا هەستاو ڕۆیشت بۆلای باوکی : دەرگاوان ڕێگەی نەدا ووتی: دەلێی گەڕێن باخەلیفەی موسڵمانان سەعاتێك پشوو بدات .؟ لە ژوورەوە خەلیفە گوێی لەو دەنگە بوو ووتی: بابێتە ژورێ, کوڕەکەی ووتی: بابە گوێم لێ بوو کە بەڕێزتان زەوی فلاّنە جێگەتان دیاری کردووە بیکەن بەوەقف بۆ موسڵمانان .؟ باوکی ووتی: بەڵێ کوڕم نیازم وایە بەیانی بیکەمە وەقف کە خودا حەز بکات, کوڕەکەی ووتی: بابە منیش بۆیە هاتوم تۆ دەبیە زامنی ئەوەی هەتا بەیانی دەژیەی .؟ هەستە خێرا ڕامەوەستە ئەوەی دەتەوێ بەجێی بهێنە. سەیرکەن چۆن لە خودا ترسان و خۆ پارێزی باوك لە منداڵەکانی دا کاری کردووە. بەڕاستی خۆپارێزو ترسان لە خودا بەو شێوەیە دەبێت, وە هەروەها دەگێڕنەوە

جارێکی خەلیفە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) منداڵەکانی کۆ دەکاتەوەو دە فەرموێ: ڕۆڵەکانم دەم ویست ئێوە بە ژیانێکی هەبونی و بەخشیشی زۆرەوە بەجێ بهێڵم بەڵام بێ گومان: بۆم دەرکەوت کە ئێوە ڕازی نین بەو ژیانە خۆشەوە بەجێتان بهێڵم و منیش لەبەردەستی خودا ڕابگیرێم و موحاسەبەی توندو تیژم لەگەڵ دا بکرێت,لێرە بەسەر هاتی خەلیفە عومەر کۆتایی هات. بەڕاستی زۆر لە منداڵەکانی دڵنیا بوو ژیانی بەختە وەرکردن لەو دونیایەدا بەئاوەدان کردنەوەی دڵیان بەخۆ پارێزیو تە قواکردنیانە نەوەك بە سەروەت و جێگەو ئەرزو خانوی خۆش .

## ﴿ مردن و بێ ئاگای ﴾

## (الموت والغفلة)

ڕەحمەتی خودا لەو کەسەبێ کەگووتویەتی:

تزود من التقى فإنك لاتدرى إذاجن ليل هل تعيش الى الفجر
فكم من فتى امسى واصبح ضاحكاً وقد نسجت اكفانه وهولايدرى
وكم من صحيح مات من غيرعلة وكم من سقيم عاش حينا من الدهر
وكم من عروس زينوها لزوجها وقد قبضت ارواحهم ليلة القدر
وكم من صغاريرتجى طول عمرهم وقدادخلت اجسادهم ظلمة القبر

واتە: تێشوو کردەوەی چاکە بکەن بەڕاستی ئینسان نازانێ کەشەو داهات ئایا هەتا بەیانی دەژیەی یان نا, چونکە زۆر گەنج هەبووە کە ئێوارە یان بەیانی زۆر بەخۆشی بردۆتە سەر, بەخۆی نەزانیوە کفنەکەی بۆ هەڵ دوو راوە،وە زۆریش هەیەو هەبووە ساغ و سەلامەت بووە لە نەخۆشی،خێرا بەلادا هاتووەو مردووە, زۆر نەخۆشی پڕ مەترسیش چاك بۆتەوە, یان بە نەخۆشی ماوەیەکی زۆر ژیاوە, وەزۆر بوکی ناو پەردەش هەبووە, خۆی ئارا یش داوە کەچی بەئاوات نەگەیشتووە گیانی بە خاك

سپاردووە، وەزۆر منداڵی بچوك هیوای دوا ڕۆژ ێکی درێژی بۆ د یاری دەکرا، بەڵام زۆر بەزوویی گیانی دەرچووەو ئەوهیوایەتەزۆرەی لەبن گڵ نراوەڕۆ یشتۆتە ناو تاریکی گۆڕەوە: وەبەو شێوە منیش کردم بەهەڵبەست :

پێت بڵێم کاکی هوشیار وەك برایەکی دڵسۆز
کڕنۆش بۆ خودا بەرە زۆر بەچاکی پڕ بە سۆ ز
ئەو کاتەی کە هوشیاری بە فرسە تی بزانە
بە هیچ جۆرێ ڕێ مەدە بێتە ماڵت بێگانە
عیبادەت بۆخودا بکە هەتا بە هۆش‌و هەستی
نەك ئێوارە بچیە جێ‌و سبەی لەخەوهەڵ نەستی
لەدوونیا زۆرکەسمان دیت ژیانی بەخۆشی‌وشادی
دەبردە سەر بەردەوام بێ غەم‌و نا مرادی
ئاگای لە دواوە نەبوو کفنی بۆ هەڵ دووراوە
تەمەنی ژیانی خۆشی گشتی لێ سە ندراوە
تەفرە مەخۆ بەساغی کە ئێستا چوست و چاکی
زۆرکەس بە ساغی دەمرێ نەکەی بکەی بێ باکی
نەکەی نائومێد ببی لەکاتی دەردوو ئازار
زۆر دەردەدار چاك بوون‌و بردیانە سەر چەند بەهار
چەندبوکی جوان‌وقەشەنگ خۆی قۆزدەکابۆمێردی
بەڵام نەگەیشتە ئاوات گوڵی جوانی با بردی
منداڵی ناسك و ساوا هیوای دوا ڕۆژی زۆر بوو
کەچی لەبەر چاو نەماو خێرا بەرەو ڕێی گۆڕ بوو

# ﴿ کێـوی بە ئارام ﴾

## (جبال الصبر)

(عروەی کوڕی زبیر رضي الله عنه) لەئەسمائەی کچی ئەبو بەکری ڕاست گۆ،کە یەکێك بـوو لـە شـوێن کـەوتوانی پێغەمبـەری خـودا ﷺ دەگێڕنـەوە: جارێـك توشـی نەخۆشیەکی ترسناکی (شێر پەنجە) (سرطان) دەبێت لە دوای هـەوڵ دانێکی زۆر بەدوای پزیشك دا هیچ چارە سەری یەکیان بۆنە دۆزرایەوە بەتەنها بڕینەوە نەبێت .

عوروەی موسڵمانیش بەو بەسەرهات و ڕوداوە کە خودا بەسەری هێناوە هیچ دڵتەنگ نەبوو, بەڵکو زۆریش دڵ خۆش و شادمان بوو بەوەی کەخودا بەسەری هێناوە داماوی وملکەچی خۆی پیشان داوزۆر سوپاسی خودای کرد :

بـە پزیـشکەکانی ووت :ئێـوە فـەرموون: دەسـت بـەکاربن و قاچـم بڕنـەوە !. پزیـشکەکانیش عوروەیـان بـردە ژووری نـە شـتەرگەری (عمليـة الجراحيـة) لەوکاتەدا دەرمانی بێهۆشی نەبوو, بۆیە بەعوروەیان ووت : بۆ ئەوەی لە هۆشی خۆت نەمێنی و ئاگادار نەبیت کە قاچت دەبڕینەوە,

خواردنـەوەی بێهۆشـی بخـۆ ! عـورەوە هاتـە وەڵام و ووتـی: خـودای گـەورە پارێزگاریم بکات و لەو جۆرە خواردنەوە بم پارێزێ, چۆن من بچم شتێك بخۆم کـە خـودا بـە نـاڕەوای دانابێـت و, هۆشـم لـە خـۆم نـەمێنێ و, لـەیادی خـودا فەرامۆش و لەبیرم بکات، نەخێر شتی وا بەبیرم نایات پزیشکەکان ووتیان: ئەدی چۆن بتوانین بێ هۆش ببی تاك و قاچت ببڕینەوە !.

عـوروەی موسـڵمانی ئـازاو چـاو نـەترس وەك و کێـوی نەلـەرز, هاتـە وەڵام و ووتـی: بۆ ئـەوەی لـە هۆشـی خـۆم نـەمێنم و ئاگـام لـە ئازاری قاچم نـەبێت، کە نوێـژم دابەسـت و گەیـشتمە کـاتی ڕێـزو سـوپاس (تحيـات) ئێـوە بـە ئیـشی خۆتانـەوە خـەریك بن چونکە ئەوکاتـە هـەموو هەسـت و هۆشم لـەلای خـودای

گەورەیەو هیچ بیر لە ئازاری گیانم ناکەمەوە .

بەو شێوەیە موسڵمانی بەڕاستی نوێژی دابەست و گەیشتە( تحیات) پزیشکەکان قاچیان بریەوە بێ ئەوەی هاوار بکات!! لەدوای سەلام دانەوەی نوێژەکەی هەڵیان گرت و بەرەو ماڵ بردیانەوە خوێنیش بەردەوام لەقاچی دەهات ! وەعروە دوو کوڕی هەبوو بە هەموویان خێزانێکی زۆر دڵ سۆزو میهرەبانیان پێك هێنا بوو بە هەموو شێوەی خۆشەویستی لەگەڵ یەکتردا ژیانیان دەبردەسەر، زۆر بە جوانی لە فەرمانی یەکتردا بوون بەبێ چرپەو بۆڵە, خەم و ئازاریان گۆڕ دەکردو ئیش و کاری ژیانیان بەڕێوە دەبرد کەبەڕاستی خانەوادەیەکی بەختەوەربوون.

ئینجا عوروەی قاچ براو بەو خوێنە گەشەی کەلەبەری دەڕوی لەگەڵ ئەو میوانانەی کەبۆ هەواڵ پرسینی هاتبوون دانیشتبوون, قاچە براوەکەی لەبەردەمی درێژ کرابوو, ئەو موسڵمانە بەئارامە لەگەڵ ئەو هەموو ئێش و ئازارەی کەهەی بوو. لەبەر ڕەزامەندی و بەرداربوونی خودا بە ئارام و لەسەرخۆبوو.

لەو کاتەدا بانگی کوڕە گەورەکەی کرد کەس وەڵامی نەدایەوە! لەبەر ئەوەی کە یەکەم جار بوو لەو ناوخێزانەدا وەڵامی نەدەنەوەو بە دەنگیەوە نەچن زۆر سەرسام بوو .؟ ووتی(إنا لله وإنا إليه راجعون)

دوای ووتی: بەڕاستی شتێکی ناخۆشە, دیارە کۆتایی مە بۆیە کەس وەڵامم نا داتەوە، یان دەبێ چی ڕوی دابێ ؟ دانیشتوانیش هەستیان بەشتێك کردوو خێرا هەستان و لەلای عوروە ڕۆیشتنە دەرەوە, بەڵام چاویان بەچی دەکەوێت . هەموویان بە جارێك مات و سەرسام بوون! کەسەیر دەکەن کوڕە گەورەکەی لەسەریان بەربۆتەوەو گیانی تێدانەماوە ! نەیان دەزانی بەچی جۆرێك وەڵامی عروە بدەنەوە, دوایی بەهەر جۆرێك بی چونەلای عوروەو ووتیان: خودا پاداشتت بداتەوە بەڕاستی کوڕە گەورەکەت کۆچی دوایی کردوە ؟! ئەو کۆمەڵانی خەڵکەی ئامادە بوون لەوێ بە هیچ شێوەیەك خۆیان بۆڕانەدەگیرا

لەبەر هەنیسکی گریان :

بەڵام عورووەی موسڵمان و بیرو باوەڕ بەهێز، وەك و قەڵایەکی زۆر بەهێزودامەزراو، زۆربە ئارام و هێمنەوە بەزوبانی پڕ بە سوپاسەوە قاچە براوەکەی هەڵگرت و ووتی: ئەی خودای گەورەو میهرەبان، بەمیهرەبانی خۆت،دوو قاچت پێ بەخشیوم، سوپاس و ستایشت دەکەم لەسەر ئەو قاچەی کە لێت وەرگرتمەوە . وە دووبارە سوپاسیشت دەکەم لەسەر ئەو قاچەی کە بۆت هێشتومەوە! وە هەروەها دوو کوڕت پێ بەخشیوم ئێستا یەکێکیانت بۆ خۆت بردەوە، سوپاست دەکەم بۆ ئەو بەخشیشەی کە پێت دام و دوایی بردتەوە! وە هەروەها سوپاسیشت دەکەم لەسەر ئەو بەخشیشەی کە ئەو کوڕەیانت بۆ هێشتمەوە .

بەو شێوەیە بەندەی موسڵمان زۆر بە نهێنی سوپاس و ستایشی خوای لەسەر ئەو ئازارە گەورەیە کرد: دوایی قاچە براوەکەیان لە بەرگێك هاوێشت و چون بیشارنەوە ووتی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایە گەورەیەی کە خەجاڵەتی نەکردم،کە بەو قاچە براوەوە نەڕۆیشتم بۆ جێگەیەك کە خودا پێی ناخۆش بێت !.

## ﴿ ئارام گرتن سێ جۆری هە یە﴾

## (الصبر ثلاثة)

یەکێك لە پیاوە موسڵمانە لە خودا ترسەکان دە فەرموێ: ڕادەی هێمن و ئارامی سێ جۆری هەیە :جۆرێکیان (٣٠٠ ) سێ سەد ڕادەوپلەی چاکەی هەیە . جۆرێکیش (٦٠٠)شەش سەد ڕادەوپلەی چاکەی هەیە. وە جۆرەکەی تریش (٩٠٠)نۆسەد ڕادەوپلەی چاکەی هەیە.

جۆری یەکەم: کە(٣٠٠) سێ سەد ڕادەی هەیە.ئەوە بۆ ئەو کەسانەیە کەلەسەر گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بڕوات و، خۆپارێزبێ .

وەجۆری دووەم: کە(٦٠٠) شەش سەد ڕادەی چاکەی هەیە . بۆ ئەو کەسانەیە کەلەسەر نا فەرمانی خودا ئارامی هەبێ و, لە ترسی خودا نافەرمانی نەکات .

جۆری سێهەم: کە(٩٠٠) نۆسەد ڕادەی چاکەی هەیە . بۆ ئەو کەسانەیە کەتوشی بەلاو بێزاری یەك بوون لە یەکەم ساتی توش بونی ئەو بێزارییە هەرچەند زۆریش گەورە بێت ئارام دەگرن و هیوای تەواویان بە خودای گەورەیە .

## ﴿ هاوارە ئەی ئادەمیزادەکان﴾

## (ویحك یا ابن آدم )

لە (حەسەنی بەسری) یەوە دە گێڕنەوە دەفەرموێ: ئێمە هەوڵ و کۆشش دەکەین هێندێك کردەوەی بەناوچاکە دەکەین دڵمان زۆر پێی خۆشەو پێدەکەنین و ڕادەبوێرین بەڵام, ئاگامان لەوەنیە کە ئایاخودای گەورە ئەو کردەوانەی لێ وەرگرتوین, چونکە بۆی هەیە ئەوکردەوانەمان بەدڵسۆزیو زۆر بەڕێکی بەئەنجام نەگەیاندبێت: ئینجا هاوارە ئەی ئادەمیزادەکان، بەڕاستی هەرکەسێك نافەرمانی خودای گەورە بکات مانای وایە لەگەڵ خودای بەدەسەڵات شەڕدەکات، ئایا دەتوانن لەگەڵ خودا بجەنگن و بەربەرەکانی لەگەڵ دا بکەن .؟؟ سوێند بە خودای گەورە بۆخۆم چاوم بە حەفتا موسڵمانی جەنگاوەری جەنگی بەدر کەوتووە کە بەرگ و پۆشاکیان خوری بوو : ئەگەر چاوت پێیان بکەوتبایە دەت ووت: ئەوانە هەموویان شێتن . یانی ئەوەندە بەکزی و داماوی سوپاسی خودا دەکەن و, لە فەرمانی خودا دەترسێن,وەرچی ڕوناکیو زەردە و پێکەنینی خۆشی هەیە لەدەمو چاویان بەدی ناکرێ !. ئەگەر ئەوانە پیاوە چاکەکانتان بدینن دەڵێن: بەڕاستی ئەوانە هەرچی خوو ڕەوشت بێ تێیان دانییە !!

وەئەگەر چاویان بە خەراپەکانی ئێوە بکەوتبایە دەیان گووت :ئەوانە هیچ با وەڕیان بەڕۆژی دواییو لێ پرسینەوە نیە .!!

وەچاوم بەچەند نەتەوەیەك كەوتووە كە سەروەتی دونیایان لەلا شتێكی زۆر بێ كەڵك بوو, سەروەت و سامانیان بەبەرچاودا نەدەهات, ئەو خاكەی بەسەری دا دەڕۆیشتن زۆریان لەلا بەنرخ تر بوو لەسەروەتو سامانی دونیا,

وە چاوم بەچەند نەتەوەیەكی تر كەوتووە كە ئێوارە یان دەكردەوە هیچیان نەبوو تەنها خواردنێكی كەم كە بەتەواوی تێرت پێی نەدەخوارد، بەوجۆرەش دەیان ووت : نامانەوێ ئەو هەموو خواردنە لەناو ورگو گەدەمان كۆبكەینەوە چونكە شتێكی ناڕەوایە .

هەرچەند كەسەرمایەو دەست كەوتمان كەمیش بێت دەبێ هێندێكی لەڕێگەی خوادا ببەخشین, بەو جۆرە بۆ خۆیان زۆر پێویستیان بەو نەختە خواردنە بوو.

بەلأم, لەبەر ڕەزامەندی خودا ئەوەی كەخۆیان پێویستیان پێی بوایە لەڕێگەی خودادا دەیان بەخشی .

# ﴿ ڕووناكی زانایان﴾

## (أ نوار العارفين)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پرسیاریان لە (حەسەنی بەسری ﷺ) كرد ووتیان: ئەی تەقی دین چ ڕۆژێك لەلای تۆ جەژنەیە .؟ لە وەلأمدا ووتی : هەر ڕۆژێك كەتاوانو نافەرمانی خودای تێدا نەكەم!. ئەو ڕۆژە بە جەژن دادەنێم .

دووبارە پرسیاریان لێ كردەوە ووتیان: چی شتێك بوو كاری تێ كردی و بوو بە هۆی خۆ پارێزی و خودا پەرستیت لەو جیهانەدا .؟

لە وەلأمدا ووتی : زۆر چاك تێ گەیشتم بەردەوام ڕۆزیم هەیەو كەس ناتوانێ بەشی من بۆخۆی بەرێتونەمن بێبەش بكات تەنها خۆم نەبم، بەڕاستی بەوەش دڵم ئاسودەو دڵنیا دەبێت,

وە دووبارە زۆر چاك تێ گەیشتم كەكردەوەكانم كەس بۆم فەراهەم ناهێنێ

تەنها بۆخۆم نەبم! بۆیە منیش پێیەوە خەریك دەبم‌وبەجێیان دەهێنم .

وە زۆر چاکیش تێ گەیشتم هەموو کاتێك خودای گەورە ئاگادارمە دەم بینێ‌و لێی بزرنابم,

منیش شەرم دەکەم خەراپەو تاوان بکەم‌و خودای پەروەرگار لەسەر تاوان‌و نافەرمانی بم بینێ .

وەزۆر چاکیش دەزانم مردن چاوەڕوانیم دەکات, منیش بۆ ئەوڕێگا دوورو ناخۆشە تێشوی بۆ ئامادە دەکەم.

## ﴿ پەشیمانی﴾

## (الأستغفار)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك کابرایەك هاتە لای (حەسەنی بەسری ) وتی: ئەی (تەقیە دین) بەڕاستی ئەم ساڵ ساڵێکی وشك‌و بێ بارانیەو کەوتوینە تەنگە تاوی چی بکەین باشە .؟ (حەسەنی بەسری ) لە وەڵامدا وتی: داوای تۆبەو پەشیمانی لەخودا بکەن .

دوای ماوەیەك کابرایەکی تر هاتو وتی: ئەی( تەقیەدین) سکاڵای هەژاری خۆمت لەلادەکەم بەڕاستی هەژاری ژیانی خستومە بەد بەختی چی بکەم .؟

(حەسەنی بەسری لە وەڵامدا وتی: داوای پەشیمانی لە خودا بکە.

لەدوای ماوەیەکی تر کابرایەکی کەمات وتی: ئەی تەقیەدین زۆر ئارەزووی منداڵم هەیە . بەڵام خێزانەکەم نەزۆکە چی بکەم .؟ لە وەڵامدا وتی: داوای پەشیمانی لە خودا بکە .

لە دوای ئەویش کابرایەکی تر هات‌و وتی : ئەی تەقیەدین. زەویەکەم بێ ئاوو بێ پیت بووەو هیچ شتێکم بۆ شین نابێت چیبکەم .؟ حەسەنی بەسری لە وەڵامدا وتی: داوای پەشیمانی لە خودا بکە .

## دۆستی باوەڕداران

لە دوای ماوەیەکی کەش کابرایەك هات و ووتی: ئەی تەقیەدین کانی و کاریزاوەکانم ووشك بوون و زەویەکەم بێ ئاوماوە تەوە چی بکەم .؟ دووبارە بەهەمان شێوە ووتی داوای پەشیمانی لە خودا بکە .

بەو شێوەیە هەرچی هاتە لای (حەسەنی بەسری ) سکالآی ناڕەزایی دەردەبڕی . بەیەك ووتە وەلآمی دەدانەوە, بۆ یە دانیشتوانی کۆڕەکە سەرسام بون و دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردەوەو ووتیان: ئەی پێشەوا بۆچی هەرچی هاتە لات بۆ سکالآ تۆ دەڵێی داوای پەشیمانی لە خودا بکە ؟. ئەو نهێنیە چیە پێمان بڵێ :

حەسەنی بەسریش لە وەلآمدا ووتی: ئێوەئەو ئایەتە قورئانیەتان نەخوێندۆتەوە دەفەرموێ ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا * يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا * وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾نوح/١٠-١٢.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: پێم ووتن بڕوا بە خودای پەروەردگارتان بهێنین و داوای پەشیمانی و لێخوشبونی لێ بکەن, چونکە بەڕاستی خودا زۆر لێ خۆش بووە, وەئەگەر بەڕاستی پەشیمان ببنەوەو داوای لێ بکەن ئەوا خودای گەورە هەموو نیعمەتێکی خۆشیتان بەسەردا بلآو دەکاتەو, لە ئاسمانەوە بارانی زۆرتان بۆ دەبارێنێ و پیت و پیرۆزی دەخاتە ولآتەکەتانەوە,وە لە هەموو لایەکەوە سەروەت و سامانتان بۆ زیاد دەکاو کوڕو منداڵی زۆرتان پێ دەدات .

وەباخ و باخاتی زۆرتان بۆ سەوز دەکات و بەهەموو جۆرە میووەیەك دڵ خۆشتان دەکات,وە سەرچاوەی کانی و جۆگە ئاوی زۆرتان پێ دەبەخشێ .

# ﴿ پیاوانی بەرزی سەردوانگە﴾

## (رجال المنابر)

دەگێڕنــەوە ڕۆژێــك (حەســەنی بەســریﷺ) زۆر بــەمات و مــەلول لەماڵــەوە دانیشتبو و ملکەچی فەرمانی خودا بوو, لەپڕێکدا کۆمەڵێك لە بەندەکانی شاری (بەصـرە) هـا تنـە لای و وتیـان: ئـەی( تەقیـەدین) سـکالأمان بـۆلات هێنـاوە یارمەتیمان بدە، گەورە کانمان ڕەوشتیان زۆر نامرۆڤانەیە لە گەڵماندا، داوات لێدەکـەین لـەوتاری هـەینی دا تۆزێـك لـەبارەی ڕەوشـتەوە بـدوێی بـۆ ئـەوەی نەختێك بەزەییان پێمان دابێتەوە ئەوندەمان ئازار نەدەن، وە بە هیوای ئەوەش کـەدڵ نـەرمیان لەگـەڵمان دا بـەکار بهێـنن و هێندێکیـشمان سەربەسـت وئـازاد بکەن( حەسەنی بەسریﷺ) ش بەسۆزە وە گوێی لە ووتەکانیان گرت و بڕیاری دا کـە لـەو بـارەوە ووتـار بخوێنێتـەوە، بەلأم واڕێکـەوت ماوەیـەکی زۆر تێپـەڕی (حەسـەنی بەسـەریﷺ) لـەو بارەوە ووتـاری نەخوێنـدەوە، لـەدوای تێپـەڕبونی ماوەیـەکی زۆر (حەسـەنی بەسـریﷺ) لە وتـارێکی هـەینی دا چـووە سـەر بڵنـد گـۆو دەسـتی کـرد بـە وتـاری ڕەوەشـت بـەرزی بەرامبـەری بەنـدەکان، بەڕاسـتی وتارێکی دڵ تەزێن و کاریگەر بوو بەرامبەر بەوانەی بەندەیان هـەبوو، بۆیـە هـەر کەلەمزگەوت ڕۆیشتنە دەر زۆربەیان دەستیان کرد, بەئازاد کردنـی بەنـدەکانیان بـەبێ بەرامبـەری، ئینجـا لـە دوای سەربەسـتی بەنـدەکان ئـەو کۆمەڵـەی پێـشو هاتنەوە لای (حەسەنی بەسریﷺ) و ووتیان: ئەی حەسەن زۆر چاك بزانە بۆیە نــەهاتوین سوپاســت بکــەین بــەڵکو هــاتوین نــاڕەزایی دەربــڕین (حەســەنی بەسریﷺ) ووتی: براکانم بۆچی لێم ناڕازین ؟ بەنـدە ئـازاد بووەکـان ووتیـان: ئـەی( تەقیـەدین) ئێمـە هاتینـە لات و سـکالأمان کـرد هیوامـان وابوو بەزووترین کات لە ووتاری هەینی دا باسی ڕەوشتی جوان وبەرز بەرامبـەر بەنـدەکان باس بکـەی بـەلأم, بـە پێـچەوانەوە باسـەکەت زۆر بـەدوا خـست لـە کاتێکـدا ئێمـە

پێویستیمان بەکاتی زۆر زوو هەبوو باسی بکەی:

(حەسەنی بەسری‌ﷺ) ووتی: برایانی بەڕێزم نازانن هۆی دواکەوتنی و وتارەکەم بۆ چی بوو ؟ من بەندەیەکی هەژار بووم هیچ بەندەم نەبوو، وەسەروەت و سامانیشم ئەوەندە نەبوو بەندەیەك بکڕم و،لەپێش ووتارەکەم سەربەستی بکەم، بۆ ئەوەی سەرنجی کۆمەڵانی خەڵك ڕابکێشم، بۆیە ڕاوەستام هەتاك و خودا دەروێکی لێ کردمەوەو پارەمەتی دام بەندەیەکم کڕی و سەربەستم کرد،لە دوای ئەوەی بۆ خۆم ئەو شتەم بە ئامانج گەیاند . ئینجا داوام لە کۆمەڵانی خەڵك کرد ئەوانیش بەندەکانیان سەربەست بکەن، بەو جۆرە ئەوانیش بانگەوازەکەی خودا یان وەرگرت، وە بەدەم فەرمانی خوداوەهاتن و بەندەکانیان ئازاد کرد .

## ﴿ سەردانی وەلید بۆ مزگەوتی پێغەمبەر( ﷺ )﴾

## ( زيارة الوليد للمسجد النبوىﷺ)

زانای بەناوبانگ و پایە بەرز (سەعیدی کوڕی موسەیەب‌ﷺ) لەسەردەمی( وەلیدی کوڕی عبدالملك‌ﷺ) پادشای وڵاتی ئەمەویەکان، وانەی لەمزگەوتی پێغەمبەردا(ﷺ) دەووتەوە، ڕۆژێکیان( وەلیدی کوڕی عبدالملك‌ﷺ) خەلیفەی موسڵمانان لەگەڵ لێپرسراوی شاری مەدینە (عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ) دا دەچنە ژوری مزگەوت، خەلیفە وەلید لە زانای بە ناوبانگ (سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ)دەچێتە پێش و بەتایبەتی سەلامی لێدەکات مامۆستا سعیدیش زۆر لەسەرەخۆو بەسادەییەوە وەڵامی دەداتەوە بەجۆرێك گوێ یان لەوەڵامەکە نەبوو، (عومەری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ) زۆر لەوە دەترسێ کە خەلیفە وەلید زانای بەناوبانگ سعید لە سەر وانە وتنەوە دوور بخاتەوە چونکە ڕێزی لێ نەناوەو وەڵامەکەی باش نەداوەتەوە! بۆیە عومەر لەو ترسە، ڕووی کردە خەلیفە وەلیدو ووتی: وابزانم سەعید گوێی لەسەلامەکەت نەبووە، دووبارە

وەلید ووتی: زیاتر نەچمەپێش و بەدەنگێکی بەرزتر سەلامی لێدەکەم، بۆیە بەدەنگێکی بەرز وەلید ووتی: سەلامی خوات لەسەر بێ ئەی سعید دووبارە سعیدیش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە زۆر لە جاری یەکەم لەسەر خۆو بەهێواش تر، ئەمجار( عومەری کوڕی عبدالعزیز) بۆ ئەوەی خەلیفە وەلید بێنێتەوە هۆش ووتی: خەلیفە وەلید وابزانم سعید نات ناسێ, چونکە چاوەکانی کزبووە، بەو شێوەیە عومەر بەرگری لە سعید دەکرد، خەلیفە وەلید ڕۆیشتە بەردەمی سەعیدو تۆقەی لەگەڵ دا کردو لەبەر دەمی دانیشت و ووتی: سەلامی خودای گەورەت لێ بێ ئەی سەعید، سەعید یش هەر لەدڵی خۆ یدا وەڵامی سەلامەکەی دایەوە دوای خەلیفە وەلید ووتی: ئەی عومەر بەڕاستی سەعید نەچاوی کەمبینابووەو نەگوێەکانیشی کەڕە تەنها سعید بەندەیەکی لەخودا ترس و خۆپارێزە، بۆیە خودای گەورەش هەموو بەندەیەکی لێ ترساندووە, بەڵێ بەڕاستی هەرکەسێك بەڕاستی لە خودای بترسێ، خودای گەورە هەموو کەسێکی لێ دەترسێنی وە هەرکەسێکیش لە خودا نەترسێ و لە بەندەکانی خودا بترسێ ئەوە خودای گەورە ترسی هەموو کەسێکی دەخاتەناو دڵیەوە.

## ﴿ ولاغەکەت ماندو مەکە نامان گەیە﴾

## (لا تتعب فرسك فلست تلحقنا)

لە (عبیدالله ی کوڕی عومەری )خەڵکی قەواریری دەگێڕنەوە فەرموویەتی: لە ژیانم دا نوێژی بە کۆمەڵی (جماعە) خەوتنانم نەچواندووە، بەڕێکەوت وقەدەر واهات ڕۆژێك میوانێکم هات بەهۆی ئیش و کاری میوانەکە لە نوێژی بە کۆمەڵ دواکەوتم منیش ڕۆیشتم زۆربەی مزگەوتەکانی بەسرە گەڕام بە هیوای ئەوەی لە مزگەوتێك دا بەنوێژی بەکۆمەڵ ڕابگەم بەڵام : گەڕانەکەم بێ سوودبوو هەر مزگەوتێکی دەچوم دەرگایان پێوە درابوو ڕۆیشتبونەوە ماڵ، ئەمنیش بە ناچاری گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بە دڵی ساردو داماوییەوە زۆرم داخ لەو نوێژە

خوارد کە بەکۆمەڵ فەوتاندوومە لەدوای ماوەیەك بەبیرم هاتەوە کە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) فەرموویەتی: یەك نوێژی بەکۆمەڵ خێری(٢٧) بیست وحەوت پلەی زیاتری هەیە .ئەمنیش لەماڵەوە نوێژەکەی خەوتنانم بیست وحەوت جار دووبارە کردەوە ئینجا لێی نوستم، لە خەوم دا چاوم کەوت لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکدام بەسواری ولاغ پێش بڕکێ دەکەین بەڵام، هەرچەندی دەم کردو ولاغەکەم تاودەدا نەیان دەگەیشتمێ، لە ناوکۆمەڵەکە یەکێك ئاوڕی لێ دامەوەو وتی: ولاغەکەت هێندە ماندومەکە نامان گەیە؟. منیش ووتم: بۆچی ناتان گەمێ ؟ لە وەڵامدا ووتی: ئێمە نوێژی خەوتنانمان بە کۆمەڵ کردووە بەڵام, تۆ بەتەنها کردوتە بۆیە نامان گەیە !، لەوکاتەدا بوو لە خەوەکەم بەخەبەر هاتم بە ڕاستی دڵم پڕ داخ و مەلول بوو بەو هۆیەوە .

## ﴿ لەگەڵ خواپەرست و دونیا نەویستان ﴾

## (مع الزا هد ین)

دەگێڕنەوە ڕۆژێکیان زانای بەناوبانگ و لەخودا ترس (مالیکی کوڕی دینار‌ﷺ) بەیەکێك لە کۆڵانەکانی شاری بەسرەدا دەڕۆیشت چاوی بەسەر خۆشێك کەوت لە سەرپشت درێژ ببوو عارەقی بەدەمیدا دەهاتە خوارو دەی ووت: (الله،الله)مالیکی کوڕی دینار‌ﷺ ووتی: بەڕاستی شتێکی ناڕەوایەو زۆر ناشیرینە ناوی خودای گەورەو مهرەبان لەو دەمە دەرچێ کەعارەقی پێدا دێتە خوارێ !.هەر خێرا پێشەوا مالیك ڕۆیشت ئاوی هێناو دەمی ئەو کابرا سەرخۆشەی شوشتەوەوداوای نزای بەخێری لەخودا بۆکرد کەخودای گەورە ڕێگەی ڕاستی پیشان بدات .

ئینجا پێشەوا مالیك کابرای سەرخۆشی بەجێ هێشت و ڕۆیشت بۆماڵەوە، دوای ماوەیەك لێی نوست دەفەرموێ: لە خەوەکەم دا پێیان ووتم : ئەی مالك تۆ

دەمی ئەو سەر خۆشەت لەبەر خاتری ئێمە شوشتەوە، وائێمەش لەبەر تۆ دڵیمان پاك كردەوە، لە دوای ئەوە دەفەرموێ: بەخەبەر هاتم و ڕۆیشتم بۆمزگەوت بۆ نوێژی بە یانی،لەهەمان شەقامی سەر ڕێگا كەبەشێكی زۆر كەمی شەوما بوو چاوم بەو كابرایە كەوتەوە هەناسەی پەشیمانی دەردەبڕی ودەی ووت: ئەی خودای گەورە و مهرەبان: لەبەر دەرگای مهرەبانیت ڕاوەستاوم پەشیمانیم لێ وەربگرە .

له دوای ماوەیەك دەی ووت: ئەی خودای گەورە ئاگادارم بكە پەشیمانیت لێ وەرگرتوم تاك و پیرۆزبایی لەگیانم بكەم، یان پەشیمانیت لێ وەر نەگرتووم تا پرسە لە گیانم بكەم, پێشەوا مالیك دە فەرموێ : گوێم لەو دەنگەبوو چووم بەلایەوە سەیرم كرد هەمان كابرای سەرخۆش بوو كەلە سەرپشت كەو تبوو. پرسیارم لێ كرد حاڵت چۆنە ئەی بەندەی خودا ؟ لە وەڵام دا ووتی: ئەی پێشە وا مالیك ئەو كەسەی كە شارەزای ڕێگەی ڕاستی كردوم .هەر ئەوكەسەش تۆی ئاگادار كردۆتەوە بە ئاكارو ڕەوشتی من .

## ﴿ كۆڕی مردوان﴾

## (مجالس الاموات)

زانای بەناوبانگ و خوداناس (مالیكی كوڕی د ینارﷺ) زۆربەی ژیانی بێ ئیشی لە ناو گۆڕستاندا دەبردە سەر ڕوژێك لەپرێكدا یەكێك دەچێتە لای سەیر دەكات وامالیك لەناو گۆڕستانێك دانیشتووە,پێی دەڵێ ئەی مالیك بۆ لێرە بەتەنها دادەنیشی لەناو ئەو هەموو مردوانە ؟! پێشەوا مالێك لەوەڵامدا دەفەرموێ: نەخێر لەگەڵ مردوان دانانیشم،بەڵكو لەناو كۆمەڵێك خەڵك دادە نیشم بەهیچ جۆرێك ئازارم نادەن، وە كە لە لاشیان ڕۆ یشتم لە پاشە ملە هیچ غە یبەت و باسم ناكەن .

## ﴿ ئامادە بوون بۆ ڕۆژی کۆچ کردن ﴾

### ( الاستعداد ليوم الرحيل )

دەگێڕنـەوە گیـان کێشی هـەمووگیان لەبـەر (ملـك المـوت) ڕۆیـشت بـۆلای حـەزرەتی داود(علیـه الـسلام) حـەزرەتی داودیـش پیـاوی وابەسـام و هەیبـەت ولێهـاتوی بەچـاو نـەدیتبوو ! پرسـیاری کـردو ووتـی: تـۆ کێیـت و چـی کەسێکی,وەبۆچی هاتویە لام .؟ گیان کێشی گیان لەبەران لەوەلاّم دا ووتی: من ئەوکەسـەم کەپادشـایان نـاتوانن بـەرگریم لێبکـەن؟ وە هـیچ خـانو کێـوی بـەرز ناتوانێ ڕێگەم لێ بگریّ؟.حەزرەتی داود ووتی: زۆر چاك بوّم دەرکەوت کە تۆ گیـان کێشی گیـان لەبـەرانی, ئـەویش ووتـی: بـەلێ گیـان کێشم حـەزرەتی داود ووتـی: ئـەی گیـان کـێش تـۆ کاتێـك هـاتوی بـۆلام هـیچ خـۆم ئامـادە نـەکردووە !.گیـان کێشی گیـان لەبـەران ووتـی:ئەی داود کوافلاّنـە کەسـی خزمـت؟. ئـەی فلاّنی کەزور لێت نزیك بوو لە کویّ یە؟ ئەی جیرانەکەت چی لێهات ؟ داودیش فەرمووی: ئەوانە هیچیان نەماون کۆچیان کردووە مردون .

گیـان کـێش ووتـی: ئـەی بـە کـۆچ کرنـی ئـەوان پەنـدت وەرنـەگرت و بـە ئاگـا نەهاتیەوە. کەتۆش لەسەر ڕێگای مردنی .

## ﴿ خۆرا ك ﴾

### (الرزق)

زانـای بـەناوبانگ وخوانـاس (مـالیکی کـوڕی دینـار) دەفـەرموێ: ڕۆژێـك لەسەر سفرەی نان خواردن دانیشتبوم نانم دەخوارد لەوکاتـەدا پشیلەیەك هـات کوتێك لەپارچە گۆشتی خواردنەکەی بەردەمم ڕۆهـات وڕۆیـشت .منیش وردە وردە بەدوای دا ڕۆیشتم بزانم بۆ کویّ دەچیّ کاتێك چاوم پێـی کـەوت پشیلەکە پارچە گۆشـتەکەی بـردە نێزیکـی کونێك ودای نـاو کەڕایـەوە منـیش ماوەیـەك چاوەڕوانیم کرد بزانم نهێنی ئەوە چی یە .؟ کاتیّ چاوم لـیّ بوومـارێکی کوێری گـەورە لـەناو کونەکـەوە هاتـەدەرەوە پارچە گۆشـتەکەی خـواردو ڕۆیـشتەوە نـاو کونەکە.

## ﴿ پاڕانەوە ﴾

### (مناجاة)

دەگێڕنەوە( یەحیای کوڕی مەعاز ) بەردەوام لەبەر خودا دەپاڕایەوە دەی فەرموو: ئەی خودای گەورەو میهرەبان هیچ کات و شەوێك ئاسودەو خۆش نابێت بەبێ داوای میهرەبانیت لە دەرگای میهرەبانیتدا : وە ڕۆژیش ڕۆژی ئاسودەنابێت تەنها بەخوداپەرستی وخۆپارێزی نەبێت : وەجیهان جیهانێکی ڕۆشن و جوان نا بێت تەنها بەیادی تۆوە نەبێت! وە دوا ڕۆژیش هیچ شادی و بەختەوەرییەکی نا بێت تەنها بە بەخشیش وچاوپۆشیت نەبێت : وەتەنانەت بەهەشتیش خۆشنیە تەنها بەگەیشتنی دیدارت نەبێت .

## ﴿ تێگەیشتن و ڕەوشت و ڕێگای پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

### ( الفقهاء وسنة رسول الله صلى الله عـليه وسلم)

پێشەواو سەرکردەی موسڵمانان( عەلی کوڕی ئەبی تالب ) دە فەرموێ: ئەگەر ڕێگای ئاین بەبیرو ڕاو, بۆچون، بوایە دەبوو سۆل پێڵاو، وەك‌وکالەو, گۆرییە وایە کەپێی دەڵێن(خوف) کەلەپێت کرد بۆ سەفەر, لەسەرخاوێنی دەتوانی سێ ڕۆژ داینەنێی و, بۆ ئەوانەش کەلەماڵەوەن, دەتوانن شەو ڕۆژێك دای نەنێن و, مەسحی بکەن یانی لای سەرەوەی گۆریەکە دەستی تەڕیی پێدابهێنن : ئینجا ئەگەر بە بۆچون و ڕەئی بوایە دەبوو ئەوخوفە لای بنەوەوخوارێی مەسح .تەڕ, کرابایە باشتربوو لەلای سەری بەلاّم پێغەمبەری خودام چاوپێ کەوتووە تەنها ڕووە ئاشکراکەی ڕشاندووە : وەسەرکردەی دادوەرو بەڕێز (عومەری کوڕی عبدالعزیز ) دەفەرموێ: داواتان لێ دەکەم خواپەرستی وخۆپارێز بن و ئابوری وپاشە کەوت کردنتان بەشێوەی فەرمانی

خودابێت و بەدوای ڕێبازی پێغەمبەری خوداﷺ بکەون وەدوربکەونەوە لەو ڕەوشت و پەیدا بوانەی کەلەمەوداپەیدادەبن.

زاناوپێشەوای بەڕێزوسەرکردەی کۆمەڵی کاروان چیان (ئەبو حەنیفەﷺ دەفەرموێ: چاودێری لەڕەوشت و ڕێبازی موسڵمانانی پێشوو بکەن وەئاگاداربن و پارێزگاری بکەن وەدووربکەونەوە لەهەموو کردەوەیەك کەتازە پەیدا بووە و داهێنراوەو لە دەوری پێغەمبەردا (ﷺ)نەبووە: وەپێشەوا ( مالك ﷺ )دە فەرموێ: هەرکەسێك ڕەوشتێك دابهێنێ وەلە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نەبوبێ،وەبە ڕەوشتێکی باشی بزانێ ئەوە هەستی وابو دەچێت کە پێغەمبەر(ﷺ) ناپاکی لەبەرنامەکەی دا کردبێ چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: (الیوم اکملت لکم دینکم) واتە: ئەمڕۆ دینی سەر بەرزی ئیسلامم بۆ ئێوە تەواو کردو بەپایان گەیاند, بێ گومان هەرشتێك ئەو کاتە پێغەمبەرمان نەی هێنا بێ ونەی گەیاند بێ ئەمڕۆ بەئاین ناژمێردرێ و لەئاین دانیە وەپێشەوا شافعی ﷺ دە فەرموێ: لە دوای ئەوەی کە هەوڵێکی زۆری داوە ڕێبازە سەر بەرزەکەی پەڕاوی ئیسلامی بەپایان گەیاند،چەند دێڕێکی نوسی و فەرمووی: بێ گومان شتێکی دروست و حەتمیە کە ئەو نوسراوەی من هەڵەو ناتەواوی تێدایە، چونکە خودای گەورە دەفەرموێ :﴿ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً﴾ نساء/٨٢

.واتە: ئەوەبۆچی سەیری یاساو بەرنامەی ئەو قورئانە ناکەن و بیری لێناکەنەوە بێ گومان ئەو قورئانە پیرۆزە کە بەرنامەی هەمووژیانی مرۆڤ و بونەوەرو ئاینی سەر بەرزی ئیسلامە، ڕێك وپێك و بێ غەش و خاڵە چونکە لەلایەن خودایەکەوە هاتووە کە پەروەردگاری هەموو بوونەوەرەو لە هێزودەسەڵاتی مرۆڤ دانیە، وەئەگەر ئەو قورئانە لە لایەنی ئادەمیزادەوە بهاتبایە بێجگە لە خودای گەورە ئەوا گۆڕانی زۆری تێدا دەبوو، چونکە تەنها خودا نەبێت کەس نهێنی نازانێت, بۆیە پێشەوا شافعیﷺ لەکۆتایی

نوسراوەکەیدا دە فەرموێ: هەرشتێك کەووتبێتم و نوسیبێتم بە پێچەوانەی قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ بێ لێی پەشیمانم و نوسراوەکەی من ناتەواوە .

وەپێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەلﷺ ) دە فەرموێ: ڕاستی و بنەچەی ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) لەلای ئێمە گرتنی ئەو شتانەیە کە یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پێوەی هەستاون و پەیڕەویان لێ کردبێ، وەلە کردەوەی داهێنراو دروست کراو دورکەونەوە, چونکە بەڕاستی هەموو دروست کراوێك هەڵە و سەرلێ شێواوی یە .

## ﴿ڕەوشتی پیاوچاکان﴾

## ( اخلاق الصالحين)

جارێك (هارونە ڕەشید) پرسیاری لە( ئەبا یوسف) کرد کەداد پرس و فەرمان ڕەوای ئاین بوو فەرمووی: ئەی (ئەبا یوسف )هێنیدێك ڕەوشتی ئەبوحەنیفەم بۆ باس بکە؟ لە وەڵام دا فەرمووی: سوێند بەخودا ئەبوحەنیفە زۆر بەهێز بوو لە بەرگری کردنی تاوان و ناڕەوا، وە بەسەروەت وسامانی جیهان هەڵنەدەفریواو پارێزگاری چاکی دەکرد، وە زۆربەی کاتەکانی بەبێ دەنگی و بیرکردنەوە دەبردە سەر, گاڵتە بازو زۆر بلێ نەبوو، هەر کاتێك پرسیارت لێ کردبایە لەهەموو ڕویەکەوە کەبیزانیبایە خێرا وەڵامی دەدایەوە، وە بەزانین و فێربونەکەی خەڵکی پێ هەڵنەدەفریواند . وە بەزانیاری یەکەی پارێزگاری لە ئاین و گیانی خۆی دەکرد، هەموو کاتێك بەتەربیە ت و پەروەردەی گیانی خۆی خەریك بوو، تاوان و ناتەواوی مرۆڤەکانی باس نە دەکرد واتە : ناتەواوی خەڵکی دەر نەدەخست، وەباسی هیچ کەسێکی بە ناڕەوا نەدەکرد،تەنها بەچاکە نەبێت (هارونە ڕەشید) فەرمووی:بێگومان ئەوە ڕەوشتی پیاو چاکانە .

## ﴿ خۆ پاریزی پیا وچا کان﴾

## (ورع الصالحين)

دەگێرنەوە جارێك كابرایەك ڕۆیشتە لای پێشەوا (حەنیفە) ووتی: ئەی پێشەوا پێویستی تینی بۆ هێنام هێندێکم وام( قەرز) بدەیە،لەباتی ئەوەش خانوەکەم بارمتەبێ لەلات، پێشەوا حەنیفە قەرزەکەی پێ داو کابرا ڕۆیشت واڕێکەوت ئەو کابرایە لەکاتی گەرماو قرچەی نیوەڕۆدا بەلای خانوە بارمتەکەی داڕۆیشت کەسەیری کرد واپێشەوا حەنیفە لەبەر خۆرەکە دوور لەخانوە کە ڕاوەستاوە کابرا ڕۆیشتە پێشەوەو ووتی:ئەی پێشەوا حەنیفە بۆچی لەوکاتە لەبەر ئەوخۆرە گەرمە ڕاوەستاوی نایە بەر سێبەری ئەوخانووە .؟ پێشەوا فەرمووی: برام ئەو خانووە لەباتی قەرزەکەم بارمتەیە لەلام، وە لەبەرنامەی سەربەرزی ئیسلام دا تاوانە ئینسان لەبارمتە کەڵك وەربگرێ منیش لەوە دە ترسێم کەبێمە ژێر سێبەرەکەی بەکەڵك وەرکرتن بژمێردرێ و،منیش تاوان باربیم,! بۆیە گەرمای خۆرەکەم لەتاوان باربوون پێ ئاسان ترە .

## ﴿ سەرکەشی زانیاری﴾

## (غرور العلم)

دەگێرنەوە جارێك زانایەکی زۆر سەرکەش ولەخۆبایی بەزانیاریەکەی : چونکە خۆی زۆر بەزانایەکی باش دەزانی, ڕۆیشت بۆشارێك بانگەوازێکی بلاو کردەوە هەرکەسێ پرسیارێکی هەیە لەهەر بارێکەوە بێت من ئامادەم وەلامی بدەمەوە.؟ پێشەوا (حەنیفە) لەوشوێنە ئامادە بوو ووتی: من پرسیارێکم هەیە کابرا ووتی: پرسیارەکەت بلێ .؟

پێشەوا فەرمووی: ئەومێرولەیەی کەلەگەڵ حەزرەتی سولێماندا ووتەی کرد نێر بوو، یان مێ بوو .؟کابرای زانای سەرکەش ماوەیەك سەری داخست و

دوایی ووتی: بێ گومان ئەو پرسیارە وەڵامەکەی تەنها خودا دەزانێ! پێشەوا حەنیفە هاتە وەڵام و ووتی: ئەو مێروولەیە مێ بوو کابراکە ووتی: بەچی دەزانی کەمێ بووە .؟ پێشەوا فەرمووی: بە وە دەزانم کەمێ بووە،خودا لەقورئاندا فەرموویەتی: (وقالت النملة) واتە: مێرولەکە ووتی: بەتێی تانیس هاتووە ئەوەش بۆ مێیان دەوترێ دوایی پێشەوا فەرمووی: من لەپێناو هیچ شتێك دا پرسیارم لێ نەکردوی تەنها لەبەر ئەوە پرسیارم لێ کردی بۆ ئەوەی ئاگادارت بکەم کە فێرو هەوا لێ نەدەی و لەخۆت بایی نەبی .

## ﴿ پێشەوای زاناو تێکۆشەر﴾

### (امام الفقه والجهاد)

موسڵمانە لە خودا ترسەکان بەڕاستی وبێ دوو دڵی هەرچی دەیان کرد تەنها لەبەر ڕەزامەندی خودای مهرەبان دەیان کرد وەهەر شتێکیش کەدووریو خۆپارێزیان لێدەکرد لەبەر ڕەزامەندی خودا بوو سە یرکەن پێشەوای زانایان ئەبوحەنیفە لەسەردەمی خولەفای عەباسی (ئەبی جەعفەری مەنسور) توشی ئازارێکی زۆر دژوار هات لەپێناوی ئەوەی کەداد پرسی و فەرمان ڕەوایی نەکات.

خەلیفەی موسڵمانان (ئەبو جەعفەری مەنسور) داوای لەپێشەوا حەنیفە کرد ووتی: دەبێ ببی بەداد پرسی نیشتمان .؟( ئەبوحەنیفە) لە وەڵام دا ووتی: من توانای داد پرسیم نیەو پیاوی ئەو پلەیە نیم (ئەبوجەعفەر) ووتی: ئەی حەنیفە بێ گومان تۆپاڵەوانی ئەو ڕێبازەی وەلەتۆش زانا ترو تێ کە یشتوترمان تێدانیە ئەبوحەنیفەش ووتی: نا وانیە زۆر کەس لەمن زاناو شارەزاتر هەیە .

خەلیفە مەنسور ووتی:حەنیفە درۆدەکەی لەتۆمان زانا تر تێدانیە, لەکۆتایی کێشەکەدا ئەبوحەنیفە ووتی:ئەی مەنسورمن درۆزنبم ؟چۆن قایل دەبی مرۆڤی درۆزن ببێتە داد پرس و فەرمان ڕەوا!

## ﴿ دەمە تەقێ یەك لەنێوان ئەبو حەنیفەو بێ باوەڕێك﴾

## (حوار بين ابى حنيفة وجاحد)

هەموو کاتێك بێ بڕوایان بەچاوی کوێری کەرەستە(مادە)وە سەیری ئەو بوونەوەرە گەورەیە دەکەن،جارێك بێ باوەڕێك دەچێتە لای ئەبوحەنیفە:ئەو ووت, وێژە ڕو دەدات :

بێ باوەڕەکە دەڵێ:( ئەبوحەنیفە) ئێوە موسڵمانن باوەڕتان بەخودا هەیە چاوتان بەخودا کەتووە .؟

ئەبوحەنیفە: پاكوبێ لەکەیی بۆئەو خودایە یە کەهیچ چاوێك نایبینێ وهەستی پێ ناکات .بێ باوەڕان بەمێشکی خاڵی و بۆشیانەوە ڕولەڕاستی وەردە گێڕن و بەرەو لای کەرەستەی ڕەق وتەق باوەشی بۆدەکەنەوە لەئەزمونگەی زانیاری خۆیاندا لەوە زیاتر هەست ناکەن و ئەوەی لەڕوانگەی پێنج هەستەکانەوە هەستی پێنەکرێ بەبوونی دانانێن. بەڕاستی ئەوانەش گومڕاوڕێ لێتێکچو سەرگەردانن : ئەگەر سەری خوێنەر نەیە شێنم تەنها ئەوەندە دەڵێم کێ ئەوهەستانەی دروست کرد .؟

بێ باوەڕەکە :ئەیحەنیفە بەوپێنج هەستانە، هەستتان بەخودا کردووە؟ دەستتان پێ کەوتووە؟ بۆنتان کردوە؟ گوێتان لێ ی بووە؟ تامتان چێشتووە .؟

ئەبوحەنیفە فەرمووی:﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ شوری/١١ واتە:خودای گەورەو بەسۆزو مهرەبان هیچ شتێك وێنەی ناکات ولەوێنەی کەسیش نیە، وەکۆیاو بینایە بە هەموو شتێك .

بێ باوڕەکە: ئەی خەلیفە تۆ خودایەکەت بەو پێنج هەستانە هیچ هەست پێ نەکردووە، چۆن بۆم ڕون دەکەیەوە کەخودات هەیە .؟

ئەبوحەنیفە: ئەگەر ژیریت(عەقڵت) هەیە چۆن بۆم ڕون دەکەیەوە کەژیریت هەیە ؟ ئایا بەچاو بینیوتە ؟

بیَ باوڕەکە: نەخێر نەم بینیوە .

ئەبوحەنیفە: گویێت لە ژیریت بووە ؟

بیَ باوەڕەکە: نەخێر گویێم لیَ نەبووە ؟

ئەبوحەنیفە: بۆنی ژیریت کردووە ؟

بیَ باوەڕەکە: نەخێر بونم نەکردوە .

ئەبوحەنیفە: هەستت پیَ کردوە .؟

بیَ باوەڕەکە: نەخێر هەستیشم پیَ نەکردووە.

ئەبوحەنیفە: دەستت بەژیریت کەوتووە ؟

بیَ باوەڕەکە: نەخێر دەستیشم پیَ نەکەوتووە .

ئەبوحەنیفە: تۆ شێتی یان ژیری ؟

بیَ باوەڕەکە: من ژیرم و عەقلم هە یە .

ئەبوحەنیفە: ژیریەکەت لەکویَ یە ؟

بیَ باوەڕەکە: ژیریەکەم هەیەو هیچی تر .

ئەبوحەنیفە: بەوشێوەیە خودای گەورە هەیەو تەواوسازە.

وەئەو ژیریەی کە تۆش هەتەو نای بینی،دروست کراوی ئەو خودا گەورە یەیە.

## ﴿ ئاین سروشتیە ﴾

## (دين الفطرة)

پرسیارێکیان لە عەرەبێکی دەشتەکی کرد، چۆن باوەڕت بە ئاینی ئیسلام و بەمحمد هێنا . ؟

لە وەلاّم دا ووتی: باوەڕم بە محمد کرد : لەبەر ئەوەی فەرمانی بە هیچ شتێك نەداوە کەژیری وعەقلّ بلّیَ : خۆزیا فەرمانی بەوشتە نەدابا, وەسەر پێچی هیچ شتێکیشی نەکردووە، کەژیری بلّیَ: خۆزیا سەربێچی لەوشتە نەکردبایە.

## ﴿ پێشەوا حەنیفە وەڵامی بێ باوەڕان دەداتەوە﴾

## (ابو حنيفة يردعلى الملحدين)

دەگێڕنـەوە : لەوسـەردەمەی کـە پێـشەوا (حەنیفـە) قوتـابی بـووەو لـەلای مامۆسـتای بـەناوبانگ(حمـاد) دەی خوێنـد, خـەونێك دەبینـێ لەخەوەکـەی داچـاوی بـە بـەرازێك دەکـەوێ لـە دارێکـی گـەورە هـاڵاوەو دەیـەوێ دارەکـەی هەڵکەنێ، لەوکاتەدا کەڵێکی بچوکی درامکە شۆڕ دەبێتـەوە بەهـەموو هێـزی لە بەرازەکە دەدات, بەرازەکەش هاوار دەکات و بۆی دەردەچێ، لە دوای ڕاکردنی بەرازەکە هـەر لەخەوەکەی دا چاوی بە ئادەمیزادێك دەکەوێ لە ژێـر سێبەری ئەو دارە دانیشتووە و یادی خودا دەکات .

لـەو کاتـەدا( حەنیفـە) بـە خەبـەردێت، بـۆ مانـای خەونەکـەی دەچێتە لای ماموستای (حمـاد)، بەڵام کـە سـەیری ماموەسـتا دەکـات زۆر بـەمات و مـەلولی دانیشتووە.پێشی ئەوەی خەونەکەی بۆ بگێڕێتـەوە دەپرسـێ ماموەسـتا هـۆی چیە وا بـەمات و مـەلولی دانیـشتوی؟، لـە وەڵام دا دەفـەرمووێ: حەنیفـە چـەند کەسێکی بێ باوەڕ هاتونە شارەکەمان بە نوێنـەری نەتـەوە بێ باوەڕەکان، بۆ ئـەوەی دانیـشتنێك لـە گـەڵ ماموەسـتایانی بـاوەڕدار پێـك بهێـنن بـۆ ڕون کردنەوەی ئەو بوونەوەرە کە خودا یەکی هەیە, چونکە ئەوان باوەڕیـان وایە کە ئەو بونەوەرە هیچ دروست کەرێکی نیـەو بە سروشت هـەربووە, وە یەکەم جار چونە لای پادشای ئەو شارەو: ئـەوانیش منیـان بەچاك هەڵبـژاردووە, بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەی کە ڕێکیان خستووە، وە کاتێکمان دیاری کردووە بۆ دانیشتنی ئەو کۆڕە .

منـیش هەرچـەند بیردەکەمـەوە نـازانم چـی بکـەم چـونکە پرسـیار لەبنـەڕەتی شتێك دەکەین نەبەچاو دەدیترێ و,نە بەهەستەکانیش هەستی پێ دەکرێ، بۆیە

زۆر دەترسێم لەو کوڕەدا سەر کەوتو نەبم و بڕوا دارەکانیش باوەڕیان تێك بچێت، لە دوای ووتەکانی ماموستا (حماد)، ئەبوحەنیفە ووتی: بەباس کردنی ئەوبەسەرهاتە مانای خەوەکەشم بۆ ڕوون بۆوە، ئەو بەرازەی کەلە خەوم دا چاوم پێی کەوتوە سەرۆکی بێ باوەڕکانە دەیەوێ قەدی ئەو دارە گەورەیە کە سەرچاوەی زانیاری یە هەڵکەنێ،ئەویش ئەتۆی مامۆستا (حماد) .وە ئەو کەڵو لقە بچوکەی لە دارەکە شۆڕ بۆوەو لە بەرازەکەی داوە و،ملی پێ شۆڕ کردو بۆڕاندی و هەلآت، ئەوە منم قوتابی تۆ بەبەڵگەی تەواو ملیان پێ شۆڕ دەکەم و سەر بۆ ئیسلام دادەنەوێنن : ئینجا ماموەستا،تۆ هیچ مات و مەلول مەبە، ڕێگەی من بدە بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکان، بێ گومان ئەگەر سەرکەوتم ئەواشتێکی زۆر پیرۆزە کە قوتابیەکی بچوکی تۆ توانای وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەی هەیە ؟

وە ئەگەر دووبارە منیش سەرنەکەوتم ئەوا تۆ هیچ دڵ تەنگ مەبە چونکە من قوتا بیەکی بچوکی تۆم، واسەرنەکەوتم بەلآم کەتۆ وەلآمت بدابانایەوە دیارە زۆر بەئاسانی سەردەکەوتی مامۆستا( حماد): بەو ووتانە زۆر دڵ خۆش بوو ووتی: زۆر باشە بە هیوای خوای گەورە، لە دوای ئەوەی لە شوێنی دیاری کراو کۆبونەوە، کۆمەڵێکی زۆر چا وەڕوانی مامۆستا (حماد )بوون لەوکاتەدا قوتابی زیرەكولە خوداترس ئەبوحەنیفە ڕۆیشتە ناو کۆڕەکەوە بەدانیشتوانی ووت: بەڕێزان لەبەر سادەیی پرسیارەکان مامۆستا (حماد) نەی توانی ئامادەی کۆڕەکە ببێ بۆیە بچوك ترین قوتابی بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکانتان ئامادە بووە کەمنم خودا یاربێت بەتەواوی وەلآمی پرسیارەکانتان دەست دەکەوێ :ئێستاش چی پرسیارێکتان هەیە بفەرموون .؟ بەو شێوەیەی خوارەوە چەند پرسیارێك لەئەبو حنیفە کرا :

پرسیاری یەکەم :

پ: لەچ ساڵێك دا خوداکەتان لەدایك بووە .؟

و. خوداکەمان نەدایکی هەیەو،نەباوك، لەهیچ کەسێك نەبووە( لم يلد ولم يولد) واتە: خوداکەمان بەردەوام هەیەو، نەلەکەس دەبێ و،نەکەسیشی لێ دەبێت.

پ: لەچ ساڵێك دا خوداکەتان پەیدابووە .؟

و: خوداکەمان سەرەتاو کۆتایی نیەو ،بەردەوام هەربووەو هەردەبێ .

پ: دەمانەوێ بەبەڵگەی زانستی و ڕەوان بۆمان دەربخەن کە خودا هەیە !: نەوەکو بە ئایەتی قورئان .؟

و: ئایا لە پێشی ژمارە چواری حسابی چی ژمارەیەك هەیە .؟

وەتیان: ژمارە سێ هەیە .

ئەدی لە پێش ژمارە سێ چی هەیە ؟

وەتیان: ژمارە دوو هەیە .

ئەدی لە پێش ژمارە دوو چی هەیە ؟

وەتیان: ژمارە یەك هەیە.

ئەدی لەپێش ژمارە یەك چی هەیە .؟

وەتیان: هیچ ژمارە یەك نیە .

ئینجا پێی وەتن: باشە کەلەپێشی ژمارە یەکی حسابی دا هیچ نەبێت : چۆن دەگونجێت لەپێش یەکی ڕاستی و دوور لەخەیاڵات کە خودایەکی گەورەیە شتێك هەبێت:بەڵێ‌بەڕاستی هیچ شتێك نییەو،خودا هەر هەبووەو سەرەتای بوونی نیە .؟

پرسیاری دووەم:

پ: خوداکەتان ڕوی لە کوێ یە .؟

و: ئەگەر چرایەك هەڵبگیرسێنین لە جێگایەکی تاریك،ڕوناکیەکەی بۆ کوێوە دەڕوات .؟

وەتیان: ڕووناکیەکەی بەهەموو لایەك دا بڵاو دەبێتەوە فەرمووی: ڕووناکیەکی دەست کرد بەهەموو لایەك دا بڵاو ببێتەوە، ئەدی بۆچی دەبێ

گەورەیی و ڕووناکی خودای مهرەبان تەنها بەلایەك دا بلاّوبێتەوە.؟

پرسیاری سێهەم:

پ: ئێستا شتێکمان لەخودی خوداکەتان پیّ بناسێنە ئایا ڕەقە وەك ئاسن، شلە وەك و ئاو،غازییە وەك و دووکەلّ وهەلّم :

و:ئایا ئێوە هیچ جار بەرێکەوت دا نەنیشتون لەلای نەخۆشێك لەکاتی گیان دەرچونی .؟ ووتیان: بەلّێ دانیشتوین فەرمووی: باشە پێش مردن قسەی لەگەلّ دا دەکردن و دەجولاّیەوە بەلاّم لە دوای مردن لەجولّەو قسەکردن کەوت لەبەرچی .؟ ووتیان: لەبەرئەوەی گیانی تێدا نەما فەرمووی: باشە ئێوە لەلای بوون کەگیانی دەرچوو.؟ ووتیان:بەلّێ لەلای بووین فەرمووی: دەئێوەش خودی ئەو گیانەم بۆ باس بکەن ڕەق بوو وەك ئاسن،شل بوو،وەك و ئاو،گازی بوو,وەك دووکەلّ وهەلّم .؟

ووتیان: بێگومان لەوبارەوە هیچی لیّ نازانین فەرمووی: ئێوە نازانن گیان چیە کەدروست کراوێکی ئەو خودایەیە بەلاّم داوای ناسینی خودی خودام لیّ دەکەن ؟

پرسیاری چوارەم:

پ:خودایەکەت ئێستا لەکوێیە ؟

و : ئەگەر پەرداخێك شیر بدۆشی و بیهێنی مادەیەکی چەوری تێدایە ؟ ووتیان: بەلّێ فەرمووی: باشە چەورییەکەی لە کوێی شیرەکە دایە ؟ ووتیان: شوێنی تایبەتی نیەو لەهەموو گەردیلەی شیرەکەدا بلاّو بۆتەوە، فەرمووی: دروست کراوێکی ئەو خودایە کە چەوری شیرەکەیە,هیچ جێگەی تایبەتی نەبێت، ئێوە دەتانەویّ خودی خوداتان پیشان بدەم و شوێنی بۆ دابنێم،بەڕاستی شتێکی سەیرە .؟

پرسیاری پێنجەم:

پ: ئەگەر ئێوە دەلێن هەموو شتێك دیاری کراوە لە پێشی ئەو بوونەوەرە

گەورە ئەدی ئیشی خوداکەت چیە ؟

و:ئەوکردەوانەی کە لەسەرەتاوەخودا داینـاوە بـۆ ئادەمیزادەکـان نـەی چەسپاندوە بفەرموێ:حەتمەن هەردەبێ بیکات و,خوداهیچ دەسەڵاتی تێدانیە، هەرکات ئادەمیزاد ئیشەکەی کرد ئەوکاتە لەسەری دەنوسرێ, وە بەهۆی هەوڵ و کۆشـشی ئـادەمیزادەوە کـەخودای گـەورە هێنـدێکیان بـەرز دەکاتـەوەو هێندێکیش سەر شۆڕو نزمیان دەکات .

پرسیاری شەشەم:

پ: چونە بەهەشت سەرەتایەکی هەیە : بەڵام چۆن بڕانەوەی نیە ؟

و: ژمـارەی حـسابی سـەرەتاییان هەیـە لەیەکـەوە دەسـت پـێ دەکـات بـەڵام بڕانەوەیان نیە .

پرسیاری حەوتەم:

پ: ئەدی چۆن دەڵێن لە بەهەشت دا دەخۆن و دەخۆینەوە : بەڵام پاشە ڕۆکی نیە ؟

و: ئێمەوهـەموو گیـان لەبـەرێك لـەناو منـداڵ دانـی دایکـدا مـاوەی نـۆ مـانگ دەمێنینەوە بەگوێرەی پێویست خواردن وخواردنەوەو دەخۆین :بەڵام هیچ پاشە ڕۆیەکی نیە ؟

پرسیاری هەشتەم:

پ: ئەدی ئێوە دەڵێن میوەو خۆراکی بەهەشت هەردەی خۆی و کۆتـایی نایـات ؟

و :هەروەك و خودای گەورە زانست و زانیـاری پـێ بەخشیوین هـەتا لێـی بلاو بکرێتەوە کۆتایی نایات .

پرسیاری نۆیەم و, دەیەم و, یانزەیەم .

پ: کەدەڵێن خودا هەیە پیشانمان بدەن ؟وەدەڵێن پەری لەئاگر دروست کراوە بـەئاگریش سـزا دەدرێ،ئینجاچـۆن ئاگربەئاگرسـزا دەدرێ ؟وەدەڵـێن هـەموو

شتێك دیاری كراوه بەقزاو قەدر لەسەر ئینسان،ئەدی بۆچی لەسەركردەوەكانی ئازار دەدرێ،یان پاداشتی دەدرێتەوە ؟.

و: بۆوەڵام دانەوەی ئەوپرسیارانە پێویستی بەشتێكی دیاری هەیە بۆ تێگەیاندن, هەموو بەجارێك وتیان: چی پێویستە بیكە ؟

قوتابی زیرەك و چاپوك(( نەعمان )مشتێك خوڵی هەڵگرت و بەدەم وچاوی بێ باوەڕەكانی دادا بەتایبەتی سەرۆكی بێ باوەڕەكان، دەنگی ناڕەزایی بەرز بۆوە، وەزیر كە ئامادەی كۆڕەكە بوو هاتە ناو باسەكەوەو زۆر بەناڕەزایی ووتی: بۆچی شتی وات كرد ؟ نەعمانیش فەرمووی: ئەوە وەڵامی پرسیارە كانیان بوو وتیان: چۆن ئەوە وەڵامە ؟ فەرمووی:بەڵێ وەڵام بوو: بەڵام ئایاهیچ ئازاریان پێ گەیشت سەرۆكی بێ باوەڕەكان ووتی:بەڵێ زۆرمان ئازار پێ گەیشت، ئەبوحەنیفە ووتی: كوا ئازارەكە لەكوێیە پیشانم بدە ؟ سەرۆكی بێ باوەڕەكان ووتی: ئازارەكەی بەبرینەكەوەیە بەڵام ناتوانم پیشانت بدەم،ئەبوحەنیفەش فەرمووی: كەتۆ نەتوانی ئازارێكی بچوكی گیانتم پیشان بدەی!. چۆن داوای پیشان دانی خودای گەورەم لێ دەكەی!!. تۆ برینەكەتم پیشان بدە منیش خودایەكەمت پیشان دەدەم ؟، وە هەروەها ئێوە ووتان: چۆن پەری ( اجنه) لە ئاگر دروست كراوە بەئاگر سزا دەدرێ، ئەدی چۆن ئێوە لە خاك دروست كراون, واتە ئادەمیزاد توخمێكی تەواوی لە خاكە, چۆن بەو خاكە ئازارتان پێ گەیشت !، وەهەروەها ئێوە دەڵێن: هەموو شتێكی دیاری كراو قەزاو قەدەرە بۆچی لەسەری سزا دەدرێی، ئەدی بۆچی ئێوە هاوارتان كردو نارەزاییتان دەربڕی و داوای تۆڵەی لەمن دەكەن؟.خۆ ئەوەش دیاری كراوەو دەبو هەربیكەم !.

بەم شێوەیە لەكۆتایی پرسیارەكاندا سەرۆكی بێ باوەڕەكان باوەڕی هێناو موسڵمان بوو وەزۆربەی هاوەڵەكانیش باوەڕیان هێنا، ئێنجا قوتابی زیرەك و زانا ئەبوحەنیفە ئەو شعرانەی ووت:

فیا لك من آيات حق لواهتدى بهن مريد الحــق كـــن هــــوا ديا
ولكن علـى تـلك القـلوب اكنة فليست وان اصغت تجيب المنـا ديـا

واتـە: ئەوانـەی کـە دەیانـەوێ لـە نیشانەی ڕاسـتی شـارەزابن, وە ئەوانـەی بـە دوای ڕاستی دا دەگەڕێن, بەونیشانانە شارەزا دەکرێن، بەڵام ئەودڵانەی شـارەزا نابن ئەوە کوێرن و پـەردەی تاریکیـان لەسـەرە, بـاگوێش ڕابگرن و وەڵامـی بـانگ دەرەکەش بدەنەوە خۆزیـا ئەوانـەی ڕێـی ڕاسـتیان دەوێ شـارەزا بووبـان بـەڕۆژو شەوێ بەو جۆرەم وەرگێڕا بەهەڵبەست :

بەبێ دوودڵی ئەوەی دڵ پاکە شارەزا دەبێ بۆرێگەی چاکە
بەڵام ئەوانەی دڵیان تار یکە بیرو ویژدانیان تەنگ و باریکە
شارەزا نابن بۆرێگەی ڕاستی هەرچەند بانگیان کەی بۆخواپەرستی

## ﴿ خێزانی چاك ﴾

## (الاسرة الصا لحة)

دەگێڕنەوە یەکێك لە پیاوچاکان بەناوی ( سـابتی کوڕی ابراهیم ) ڕۆژێك لـەناو شـاری کوفـەدا بـەناو باخێـك دا دەڕۆیـشت سـێوێك کەوتـە خـوار ئـەویش هـەڵی گرتـەوە ودەسـتی کرد بـە خـواردنی سـێوەکە نیـوەی خـوارد بـوو، بـەبیری هاتەوە کەئەو سێوە ئیخۆی نیەو خاوەنێکی هەیـە، نیوە سێوەکەی بەدەستەوە گرت، ڕۆیشتە لای باخەوانەکە وتـی: بـرای بـەڕێزم نـەم زانـی سـێوێك بەربۆوە لەوباخـەومنیش هـەڵم گـرت و نیـوەم خـواردو ئـەوەش نیوەکـەی تریـەتی هـاتوم ئازادم بکـەی و, چـاو پۆشـیم لێ بکـەی، کـابرای باخـەوان وتـی: ببـورە نـاتوانم چاوپۆشیت لێ بکەم چونکە منیش تەنها باخەوانم، باخەکە خاوەنی خۆی هەیە.

سـابتی لـەخودا تـرس وتـی : بـرام خاوەنەکـەی لـە کـوێ یـە بـڕۆین بـۆلای و داوای چـاو پۆشـی ولێبوردنی لێ بکـەم ؟ باخـەوان وتـی: لێـرەوە دووفرسـەخ

## حۆستی باوەڕداران

ڕێگـا, شـەو ڕۆژێـك دووره, كـابرای لـەخودا تـرس بـەناوی (سـابیت) ووتـی: هەرچەندە دوور بێ پێویستە بچین بۆلای،داوای چاو پۆشی لێ بکەم چونکە بە هیچ جۆرێك بۆمن ڕەوانیە شتێك بخۆم بەبێ پرسی خاوەنەکەی وە پێغەمبەری خوداش (ﷺ) لەو بارەوە دەفەرموێ: (من نبت جسمه من حرام فالنار أولى به) واتە:هەر پارچەو قەڵەوییەك لە خواردنی ناڕەواوە پەیدا بوو بێت بێگومان ئاگر لەو قەڵەویە باشترە بەم شێوەیە دەستی کرد بەڕوێشتن بۆلای خاوەنی باخەکە کەگەیشتە جێو لەدوای تۆزێك پشودان، ڕووی لـەخاوەن باخەکە کردو ووتـی: گەورەم سێوێك لە باخەکەت کەوتووەو منیش نەم زانی نیوەم خواردوو ئەوەش نیوەکـەی تریـەتی هـاتووم چـاو پۆشـیم لێ بکـەی، خـاوەن باخەکـە سـەیرێکی کابرای کردو ووتی: بە مەرجێك نەبێت چاو پۆشیت لێ ناکەم .؟ سابیتی لەخودا ترس ووتی: مەرجەکەت چیە بیڵێ ؟

خاوەن باخەکە :ووتی چاوپۆشیت لێدەکەم بەو مەرجەی کچێکم هەیە مارەی بـبڕی لـەخۆت ؟!!( سابتی کـوڕی ابراهیم‌ﷺ) بەسـەر سـوڕمانێك ووتـی: مانـای چیە ! لەتێکم سێو خواردووە، بەمەرجی کچ مارە کردنێك نەبێت چاو پۆشیم لێ ناکەیت ؟ خاوەن باخەکە ووتی: باچۆنیەتی و شێوەی کچەکەمت بۆ باس بکەم، لـە پێـشی مـارەبڕینی کـچەکەم : کـوێرە، کـەڕە، ئیفلیجـە, یـانی قاچـەکانی شـەلەپەتەیە، نـاتوانێ لەسـەریان ڕابوەسـتێ، سـابتی لـەخوداترس کەوتـە بیرکردنەوە، خودایە من چیم کردو,چۆن بتوانم لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا ژیان بەسەر بـەرم لە پێناوی چاو پۆ شی کردن ولێبـوردنی لـە تێك سێودا، چەندی کردی لەگەڵ خاوەن باخەکەدا ئەو مەرجەی لەگـەڵ بـەکار نەهێنێ بەلام بێ سود بوو، بۆیە بەناچاری پەیمانەکەی قبوڵ کردو ووتی: مادام لێم نابوری ڕازیـم کچەکەتم لێ مارەببڕە، لەبەر ڕەزامەنـدی خـودا بـە شـێوەیەکی زۆر چاك خزمـەتی دەکـەم، بەڵکو خودای گەورە بەو بۆنەیەوە پاداشتی چاکەم بداتەوە بەو شێوەیە, باوکی کچە خاوەن باخەکە, دوو ڕاستی بێژی (شاهد) بانگ کردوکچەیان مارە بڕی، لە

دوای ماوەیەك خاوەن باخەکە کچەکەی ئامادە کردو گواستیانەوەو بردیانە ناو پەردەوە، (سابتی کوڕی ابراهیم) بۆ لای بووکی ڕۆیشتە پەردەوە کە تائەوکاتە دەزگیرانی چاو پێنە کەو تبوو وتی : هەرچەند دەزانم کە کەڕی بەلاَم سەلامت لێ دەکەم بۆ ئەوەی فریشتەکانی خودا وەلاَم بدەنەوە سابتیش سەلامێکی پڕ بە دڵ لە بووکی تازەی نێو پەردە کرد بووکی تازەی ناوپەردە بە لێوی دەم بەخەندەوە زۆربەچاپوك و گورج وگۆڵیەوە خێرا لەبەر هاوسەری تازەزاوای هەستاو وەلاَمی سەلامەکەی زۆر بەجوانی دایەوە!! لەزاوا ڕۆیشتە پێشەوەو دەستی لەناودەستی زاواناو بەگەرمی دەستی یەکتریان کوشی، سابیت وتی: ئەی خودای گەورە چی دەبینم، من ئەو کچەم بەچی پەیمانێك مارەکردووە،بەلاَم سەیر دەکەم نە کوێرە، نەکەڕە، نەلاڵە، نە ئیفلیجە،بۆیە بەسەر سوڕمانێکەوە لێی پرسی و وتی: بێگومان من سەرسام ماوم باوکت تۆی لێ مارەبڕیم بەو مەرجانەی سەرەوە کەچی هیچ لەو مەرجانە لەتۆدا بەدی ناکەم پێم بڵێ بۆچی باوکت وای پێ وتم ؟ بووکی ناو پەردەی لێو بەخەندە هاتە وەلاَمو وتی: باوکم ڕاستی وتوە کەوای پێ وتوی ئەمن کوێرم و چاوم نابینێ واتە: لە ژیانم دا بەچاوم سەیری شتی ناڕەوام نەکردوە, مانای وایە چاوم لەشتی ناڕەوا کوێرە، وە هەروەها گوێیەکانم لە وتەی ناڕەوا کەڕە واتە: هەرچی خودای گەورە پێی ڕازی نەبێ گوێی لێ ناگرم، وە زوبانم لە وتەی ناڕەوا لاڵە: تەنها بۆ یادی خودا نەبێت، وە قاچەکانم ئیفلیجن واتە: لە ژیانم دا پێیان نەڕۆیشتوم بۆ جێگەی تاوانو ناڕەوا .

سابیت دەفەرموێ: کە سەیری دەمو چاویم کرد وەكو مانگی شەوی چواردە دەدرەوشانەوە لەدوای بەیەك گە یشتنمان خودای گەورە کوڕێکی پێ بەخشین سەر ڕوی جیهانی بەزانین و زانیاری ڕۆشەن کردەوە، ئەویش پێشەوای بەبەڕێزوبە نرخ (ئەبوحەنیفە) بوو،(نەعمان کوڕی سابت ) ئەو ئافرەتە موسڵمانە بووە دایکی پێشەوا (ئەبوحەنیفە) ئەو (ئەبوحەنیفەیە)ی کە هەوڵو

کۆششی لە(٨٣,٠٠٠) هەشتاوسیّ هەزار پرسیاری شەرعیدا کردووە وە ئەو پێشەوایە ماوەی (٤٠)چل سال نوێژی بەیانی بەدەست نوێژی خەوتنانەوە کردووە، (ئەبوحەنیفە)شەوێك لەشەوە درێژەکانی زستان ڕۆیشتۆتە ناوخانەی خوداوە (کعبە) لە مەکەی پیرۆز لە دوای نوێژی خەوتنان دوو رکاعەت نوێژی دا بەستووە هەتا نوێژی بەیانی ئینجا لێی بۆتەوە لەرکاعەتی یەکەم دا لەسورەتی فاتحەوە هەتا ئایەتی ﴿اما السفینة فکانت لمساکین یعملون في البحر﴾ خوێندوە: وە لەڕکاعەتی دووەمیش دا لە ئایەتی ﴿اما السفینة﴾ هەتا ﴿من الجنة والنا س﴾ خوێندوە ئینجا سەلامی داوەتەوە .

## ﴿شوێن کەوتن وگیان دەرچونی ستەم کاران﴾

## (مصرع الظالمین)

دووژمنان و ناحەزانی ئیسلام بەهەمووشێوەیەك خەریکی تاوان کاری و خەراپەن بەرامبەر بە ئیسلام و فەرمان ڕەوایانی ئیسلام هەر چۆنی بۆیان کرابێت درێخیان نەکردوە، وەخودای گەورەش کە هەمووکات ئامادەو لەکەمیندایە کاتێکی ڕەخساندووە بۆ لە ناو بردنی ئەو تاوان بارانە, وە ڕێبازی ئیسلام و فەرمان ڕەوایانی ئیسلامی گەشەدار کردووە هەروەك و( هونادی کوڕی ئەسوەد)دەڵێ:(منو ئەبو لەهەب و, عەتبەی کوڕی ئەبولەهەب) کۆمەڵێك لە خەڵك خۆمان ئامادەی ڕۆیشتن کرد بەرەو شام :

(عەتبەی کوڕی ئەبو لەهەب) ووتی: دەڕۆم بۆلای محمدو هێندێك گاڵتەی پێ دەکەم ئێنجا دێمەوەو بەرێدەکەوین و دەڕۆین،(عەتبە) ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ووتی: ئەی محمد من باوەڕم بەخودایەکەت نیە!! بەو ووتە بۆش و بێ کەڵکانە بۆ ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆری ڕست، پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێ کرد فەرمووی: ئەی پەروەردگارم سەیەك لە سەگەکانتی بەسەردا زاڵ بکە، لە

دوای ئـــەوە ((عەتبـــە) گەڕایـــەوە لای بـــاوکی و ڕوداوەکـــەی بـــۆ گێڕایـــەوە (ئەبولەهەب) ووتـی: بەڕاستی کوڕم لەو دوعایەی محمد زۆر دەترسێم توشی شتێك ببی،: ئێنجا بەڕێ کەوتن بەرەو شام لە ڕێگا لەلای پەرستگای ڕەبەنێك (راهب) دابەزین ئەبو لەهەب ووتـی: زۆر چاوە دێری (عەتبە)ی کوڕم بکەن چونکە بەڕاستی لە دوعاکەی محمد زۆر دەترسێم بۆیە داوای لە کاروان چیەکان کردو ووتی: بارخانەکانتان لە شوێنێك کۆبکەنەوە (عەتبە) بچێتە سەریان و ئێوەش لە دەوری کۆ ببنەوە کاروان چیەکانیش بەووتەکەی ئەبو لەهەبیان کردو, لەهەر چواردە ورەی کۆڕیان بەست شەو لەدوای خەوتن بەدرەنگەوە, شێرێك هات یەك بەیەك بۆنی دەکردن و بەجێی دەهێشتن تاك و نۆرە گەیشتە عەتبە یەك چنگی لێدا سەری لەلەشی جودا کردە وە لەدوای ئەوە بەخەبەر هاتن ئەبو لەهەب ووتی سوێند بەخودا دوعاکەی محمد کاری خۆی کرد.

## ﴿ پێنـــج فەرمان﴾

### (خمسةامور)

پێشەوای بەنرخ (مالیکی کوڕی ئەنەس) شەوێکی لە خەویدا چاوی بەگیان کێش (ملك الموت) دەکەوێ پرسیاری لێ دەکاو دەڵێ ئەی گیان کێش،تەمەنم چەندماوە لە ژیاندا، گیان کێشیش بە هەر پێنج پەنجەکەی دەستی ڕادەوەشێنی و ئیشارەی بۆ دەکات، پێشەوا مالیك لەو پەنجانە دڵی دەکەوێتە لەرزەو دووبارە پرسیاری لێ دەکاتەوەو دەڵێ بێ گومان نازانم ئەو پێنج پەنجانە مانایان چیە ؟ پێنج ڕۆژە،پێنج حەفتەیە، پێنج مانگە، پێنج ساڵە،بەوەڕاناگات گیان کێش وەڵامی بداتەوە,پێشەوا مالك بەخەبەر دێت لەخەوەکەی، ئەوجار زیاتر دڵ تەنگ و مەلول دەبێت، بۆیە ڕێگا دەگرێتەبەر دەڕوات بـــۆلای زانـــای بـــەناوبانگ (ئـــبن و ســـیرین) بـــۆ مانـــای

خەونەکەی(إبن‌وسیرین) دە فەرمویٚ: ئەی مالك خێرە هاتوی، پێشەوا مالك دەفەرمویٚ: ئەی (إبن وسیرین) لە خەوم دا چاوم بەگیان کێش کەوتو پرسیارم لێکرد تەمەنم چەند ماوە لە ژیاندا، گیان کێشیش بە پێنج پەنجەی دەستی ئامـاژەی بـۆ کـردم، ئێستاش نازانم ئەو پێنج پەنجە پێنج ساڵە، پێنج مانگە،پێنج حەفتەیە، یان پێنج ڕۆژە، مامۆستا (إبن وسیرین) هاتە گوفتار ووتی: ئەی پێشەوا مالك خانوی کوچ کردن( مردن) بۆ کەس دیاری نەکراوە نە بەڕۆژ نە بەمانگ نەبە ساڵ، تەنها گیان گێش بەوجۆرە وەڵامی داویەوە فەرموویەتی: پرسیارەکەی تۆ لەو پێنج فەرمانە نادیارانەیە کە هیچ کەسێك نایان زانی، تەنها خودا نەبێت !! هەروەك‌و دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ لقمان / ٣٤

واتە: ئەو پێنج نادیارانە تەنها خودا پێیان زانایەو کەس بە دامەزراوی (یەقین) نایان زانیٚ، تەنها خودای گەورە بە دامەزراوی دەزانیٚ کەی ڕۆژی دوایی دێت؟، وەهەر خودایە باران دەبارێنیٚو،دەزانیٚ ئەوبارانە خێرو پیرۆزی دەبێت یان کارەساتی لێدروست دەبێت؟! وەهەروەها بە تەنها خودایە دەزانیٚ چی لەناو منداڵ دانی ئافرەت دا هەیەو کوڕە یان کچە تەواوە یان ناتەواوە, چارەنوسی چاکە یان خەراپە,زیرەك‌و زانایە یان نەزان‌و کەودەنە؟! وە بەتەنها خودایە دەزانیٚ بەیانی چی ڕودەدا, بێجگە لەخودا هیچ کەس نازانێت؟ بەڕاستی زۆرکات ئادەمیزاد تەگبیروڕا دەردەبڕیٚ, بەڵام بۆبەیانی کارێکی تر ڕوی داوە؟! وە تەنها هەر خودایە دەزانیٚ کەی و, لە کویٚ و, بەچی دە مرین؟! بێجگە لەخودا کەس نازانیٚ, وە بێگومان تەنها خودا زاناو ئاگادارە بەو پێنج نادیاریانە .

# ﴿ بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) تۆلە بەرزترین پلەدای﴾

## (وإنك لعلى خلق عظيم)

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە یەكێك لە ڕێگاكانی مەكەدا دەڕۆیشت، چاوی بەپیرە ژنێكی پشت چەماوە كەوت كوڵێكی گەورەی پێ بوو لەلای دانیشتبو, بانگی لەپێغەمبەر كرد ووتی: ئەی برام وەرە ئەوكوڵەم بەكوڵ دابدە ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دایەگیان تۆ ئەو كوڵە ناتوانی ئەمن بۆت هەڵدە گرم! بەڵێ پێغەمبەری(ﷺ) میهرەبانی, بەبەزەیی, كوڵەكەی بەشانی خۆی داداو لەگەڵ پیرەژن بەرەو ماڵ ڕۆیشتن : پیرەژنەكە لەڕێگا بەدەم ڕۆیشتنەوە قسەی دەكردو دەی ووت : كوڕم پیاوێك لە مەكەدا پەیدا بووە ناوی محمدە داوای پێغەمبەرایەتی دەكات و دەڵێ تەنها یەك خودا هەیە!, نەكەی بەووتەكانی هەڵ بفریوێی و بچی باوەڕی پێ بكەی، چونكە درۆ دەكات ! پیرەژن زۆر لەو جۆرە قسانەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەكرد نەی دەزانی ئەوە پێغەمبەرە وابەبێ هەواو خۆ هەڵكێشان كوڵی بۆ هەڵگرتووە, لەدوای تەواو بوونی ووتەكانی پیرەژن، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەنەرمی و لەسەرە خۆیی ووتی: دایەگیان ئەو پیاوەی داوای پێغەمبەرایەتی دەكات منم و,دەمەوێ بە فەرمانی خودا كۆمەڵانی خەڵك لەچەوسانەوەو ژێر دەستەیی ڕزگار بكەم، پیرەژنەكە زۆر بە خەجاڵەتیەوە ووتی: چۆن تۆ محمدی وا بەو شێوەیە بەزەیت بەمنی بێ باوەڕدا دێتەوە ؟ بێگومان بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خودای وەلە بەرزترین پلەی ڕەوشت بەرزیدای .اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله . باوەڕی هێناو موسڵمان بوو.

# ﴿ ڕێزو گەورەیی زانست﴾

## (عـزة العلم)

دەگێڕنـەوە لـە دوای ڕۆیشتنی ( هـاڕون ڕە شـید ) بـۆ شـاری مەدینـە بـۆ دیـدەنی گـۆڕی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ڕۆیـشت بـۆ مزگـەوتی پـیرۆزی پێغەمبـەر (ﷺ) چاوی بەپێشەوا (مالـك) کـەوت دەرسـی دەووتـەوە پێـی ووت: ئـەی مالـك ئەگەر بهات بایە ماڵمان و دەرست پیێ بووت بام چی دەبوو ؟ واتـە: وەرە ماڵمـان و دەرسـم پـیێ بڵـیێ: پێشەوا (مالـك) لـەوەڵام دا ووتـی: بەداخـەوە ئـەی( هـاڕون) چونکە زانیـاری بـۆ لای کـەس ناچێت، ئەگـەر بـۆ خـۆت ئـارەزوت لـە زانیارییـە دەبیێ بۆلای بچی،( هـاڕون ڕە شید) ووتـی: ڕاست دەکـەی ئـەی پێشەوا لەمـەو دواش بۆخۆم دێم بۆلات بۆ مزگـەوت، دوو بارە پێشەوا (مالك) ووتـی: ئـەی (هاڕون) هەرکاتیێ بە درەنگەوە هاتی و کۆمەڵانی خـەڵك دانیشتبون لێت ڕازیو قایـل نـابم بـەناوکۆڕی خەڵکەکـەدا بـڕۆی:( هاڕونەڕەشید) ووتـی: لـە فـەرمان و گویێ دێری دام، بەم شێوەیە ڕۆژێك لە دوای نوێژی عەسر پێشەوا مالك دەرسـی دەوتـەوە (هاڕونەڕەشـید)یـش لەگـەڵ چـەند کەسـێك دا ڕۆیـشتنە مزگـەوت هـەر خێرا کورسیەکیان بۆ هێناو دایان ناو (هاڕون)یش لەسـەر کورسـیەکە دانیـشت، پێشەوا مالکیش کەچاوی بەو کارە کەوت زۆر توڕەوگرژ بوو بابـەتی قسەکانی گۆڕی و ووتـی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی (من تواضـع لله رفعـه ومـن تكبر وضـعه الله ) واتـە: هـەر کەسێك لەبەر ڕەزامەنـدی خـودا مل کەچـی بکـات خـودای گـەورە پلـەو پایـەی پـیێ دەبەخـشیێ, وەهـەر کەسـێکێش خـۆی بـە گـەورە دابنـی لەسـەر خـەڵك خـودا سـەر شـۆڕو مل کەچـی دەکـات و تێکـی دەشـکێنیێ( هاڕونەرەشید) لە فەرموودەکەی پێشەوا (مالك) تـیێ گەیـشتو لەسـەر کورسیەکە هاتـە خـوارو, وەك و خـەڵکەکە لەسـەر ئـەرز دانیـشت و ووتـی: ئـەو کورسـیەی لا بـەرن، (هاڕونەڕەشـید) پێـشی گەڕانـەوەی لەسـە فەرمکـەی(٤٠٠) چـوار صـد دیناری بە بەخـشین بۆ پێشەوا (مالك )دانا ووتـی: پێشەوا ئەو بەخشیشەم لیێ

وەربگرە ؟ پێشەوا( مالك) ووتی: بم بورە ئەی( هاڕون) پێویستیم بە خێرنیەو پێم ناشیا, وەهەروەها دیاریش وەرنا گرم،( هاڕونەڕەشید) ووتی: بۆچی دیاری وەرناگریت لە کاتێك دا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دیاری وەرگرتووە،پێشەوا ووتی: من پێغەمبەر نیم دیاری وەربگرم, ئەوە ماڵەکەت و هەڵی بگرەوە دەبێ ئینسان هەر بەخودای گەورە پشت ببەستێو باوەڕی تەواوی هەر بەخودا هەبێت، لە دوایی (هاڕونەڕەشید) ماڵ ئاوایی کردو داوای لە پێشەوا (مالك) کرد دیدەنیەکی بکات بۆ شاری (بەغداد) پا یتەختی جێ نشینی عەباسیەکان، بەلاَم پێشەوا (مالـك) داوایەکەی ڕەت کردەوەو ڕازی نەبوو ووتی: سوێند بەخودا هاوسێ یەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هیچ شتێك دا ناگۆڕمەوە .

## ﴿ ڕووناکی باوەڕ ﴾

## (أنوار العقيدة)

پرسیارێکیان لە(مالکی کوڕی ئەنەس ﷺ)کرد لەواتەی ئەوئایەتەی کەخودا دەفەرموێ:﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾طه/٥

واتە: ئەوخودایە بەبەزەیی وەهرەبانەی کە تەختی دا گیر کردووە لە ژووروی هەموو ئاسمانەکانەوە, پێشەوا (مالك) لەوەلاَم دا ووتی: بەرزی وهاوسەنگی خودای گەورە دیارییە, بەلاَم چۆنیەتەکەی نادیارییە، باوەڕ بوون بەخودا پێویست و (واجب) ە پرسیار کردن لەخودی بەرزی خودا کاری نەشیاوو پێنەچووە, ئەوەی لەسەر خودا پێویستە ناردنە, وەئەوەش کەلەسەر پێغەمبەر (ﷺ) پێویستە گەیاندنە, بێگومان خودای گەورەومیهرەبان هەربووەو هەیەو شوێنی تایبەتی بۆنیەو،هەر بەوجۆرە بووە،پێشی ئەوەی شوێن وجێگەی دیاری بکات،هەروەكو بووە گۆڕانی بەسەردا نایات, وەزاناو ئاگادارە بەوەی بووەو,دەبێت و, بەو شتانەش کە ئێستا نەبووە،ئەو پەروەردگارەی چۆنی ئارەزوو لێبێ بووەو دەبێ.

## ﴿ تێگەیشتنی زیندوان لەمردوان﴾

### (تعليم الأموات للاحياء)

ئەوکاتەی کەپێشەوا (مالك کوڕی ئەنەس‌رضي الله عنه) کۆچی دوایی کرد, وەپێشی خانوی کۆچ کردن دەربارەی ئەو زانایە ووتراوە، ئەگەر (مالك) لەمەدینە بێت هیچ کەس بۆی نییە لەبارەی دینەوە بدوێ, لەدوای مردنی هێندێك لەهاوڕێیانی لەخەودا چاویان پێی کەوت بەوێنەوسوڕەتێکی زۆر جەوان،لەناو باخ ومێرگوزارێکی زۆرخۆش ودڵکراوە, ووتیان: ئەی (مالك) چۆن گەیشتی بەوپلەو ڕێزەزۆرەوە ؟! لەوەڵام دا ووتی: بەهۆی زیکرو یادێك کەبەردەوام و هەمیشە کردبوومە ویردی سەر زووبانم، ئەوزیکرەش لەحەزرەتی(عثمانی کوڕی عەفان رضي الله عنه)وەرگیراوە کەهەر کاتێ تەرمێکی دەدیت دەی فەرموو:(سبحان الحي الذي لايموت)واتە:پاكو بێگەردی بۆئەوخودایەیە بەردەوام زیندووەو نەبوونی بەسەردا نایات, وەمنیش کاتێ ئەو ویردو زیکرەم زانی فێری بووم و بەردەوام دەم ووت: کاتێ ڕۆیشتمە دادگای خودا پێیان ووتم: ئەی( مالك) بەهۆی ئەوەی کەهەردەم و بەردەوام تۆ بەو زیکرەوە یادت دەکردین، ئەوا ئێمەش لێت ڕازی بووین و دڵنیایی خۆمان پێبەخشی : ئینجا ئەوە فێر بوونی زیندوانە لەمردوان:

# ﴿ لەبەردەم خانەی کۆچ کردن﴾

## (امام دار الهجرة)

دەگێڕنەوە ئافرەتێك لە شاری مەدینەدا کۆچی دوایی کرد، لەکاتی ئامادە کردنی تەرمەکەی بۆ شوشتن ئافرەتێك خۆی ئامادە کرد بیشوات، لەکاتی شوشتن و ئاوپێدا کردنی تەرم شۆرەکە، کەوتە باس کردنی مردوەکە بە ناڕەوا، دەی ووت: ئەو مردووە دەبێ چەند جار داوێن پیسی کردبێ و کاری ناڕێکی ئەنجام دابێت بەو شێوەیە باسی ناتەواوی مردوەکەی دەکرد، لەو کاتەدا دەستی مردو شۆرەکە بەتەرمەکەیەوە نووسا بە جۆرێك تواناى جولاندنى نەما، ئافرەتەکە زۆر ناڕەحەت بوو, بەدەستەکەی تری دەرگای ژورەکەی پێوەدا بۆ ئەوەی کەس هەستی پێ نەکات و بەڵکو بتوانی دەستی لە تەرمەکەی بکاتەوە، بەڵام بەداخەوە چەندی کردی بێ سوود بوو, ماوەیەکی زۆر لە ژورێ مایەوەو نەهاتەدەر,کەس و کاری مردووەکە هەرچاوە ڕوانی بوون و پۆشاکیان ئامادە کردبوو کە خێرا تەواو بێت و, ئافرەتە تەرم شۆرەکە بێتە دەرێ، بۆیە هەر کاتە ناکاتێك بانگیان دەکرد ئایا شوشتنی کۆتای نەهات،ئافرەتەکەش لە ژورەوە دەی ووت :ڕاوەستن ئارامتان هەبێت لە دوای ماوەیەکی زۆر کەلەوزەو توانادا نەما ئافرەتێکی تر بەهەرشێوەیەك بوو خۆی گەیاندە لای تەرمەکەی کەسەیری کرد وادەستی ئافرەتە تەرم شۆرەکە بە تەر مەکەوە نوساوەو هێزی لەبەر نەماوە ئەوەندەی هێزوتین لەخۆی بکات، ئەو جار سەرگەردان بوون نەیان دەزانی چی بکەن خۆ ئەو مردوە نابێ ئاوا بمێنێتەوە دەبێ لە ژێر خاك دا بیشارنەوە بۆیە ڕۆیشتن بولای زانایان بزانن فەرمانیان بەچیە .؟ هێندێك لە زانایان دەیان ووت دەبێ دەستی تەرم شۆرەکە ببڕنەوە بۆ ئەوەی تەرمەکە بشارنەوە،چونکە تەرم شاردنەوە شتێکی پێویستە, وەهێندێکشیان دەیان ووت: دەبێ تۆزێك لە تەرمەکەی ببڕن بۆ ئەوەی زیندوەکە ڕزگار بکەین چونکە

زیندو باشترە لە مردو بەو جۆرە کێشە لە نیوان زانایاندا بەرپا بوو بە هۆی ووتەیەکی بێکەڵك وسوك،لەسەر زوبان و دەمی ئەو ئافرەتە دەرچوو، بەڵام ئەوقسەسوکە لە کێشانەدا زۆر گران وقورس بوو هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو ووتەیە فەرموویەتی :( قذ ف محصنة يهدم عمل مئة سنة)

واتە: بەناڕەوا باسی ئافرەتێکی بێ تاوان کردەوەی باشی سەد ساڵ دەڕوخێنی و لە ناوی دەبات، بەڵێ بە و جۆرە زاناکان سەرگەردان مانەوە نەیان دەزانی دەستی ئافرەتەکە بپڕنەوە، بۆ ئەوەی تەرمەکە بنێژن یان تۆزێك لاشەی تەرمەکە بپڕن، بۆ ئەوەی دەستی زیندوەکە ڕزگار بکەن، لە کۆتایی دا هانایان بردە لای پێشەوا (مالك ) ڕوداوە کەیان تێ گەیاند ئەویش بەپەلەو خێرا خۆی گەیاندە شوێنی ڕوداوەکەو لە دوای دەرگاوە بە ئافرەتەکەی ووت: چیت بەو مردووە ووتووە ؟ ئافرەتەکەش ووتی: پێشەوا چیت لێ بشارمەوە پێم ووتووە دەبێ ئەو ئافرەتە چەند جار ئیشی ناڕەوای کردبێ، پێشەوا(مالك) فەرمووی:لەسەر فەرموودەی قورئان دەبێ هەشتا داری تۆڵەت لێ بدرێ هەروەك و خودا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ نور/٤.

واتە: ئەوانەی کە توهمەتی داوین پیسی دەبەن و ئافرەتێکی داوێن پاك بە داوێن پیسی، تاوان باردەکەن،دوایی چوار شاهید ئامادە ناکەن لەسەر داوایەکەیان کە ئەو ئافرەتە داوێن پیسی کردوە، دەبێ(٨٠) هەشتا داریان لێ بدەن و هەتا هەتایە شاهیدیان بۆ هیچ شتێك لێوەر نەگرن،وە بە تاوان باریش ناو دەبرێن، ئێنجا پێشەوا (مالك) ووتی: ئێوەش بەوشێوەیە چەند ئافرەتێك بڕۆنە لای ئەو تەرم شۆرەو هەشتا داری لێ بدەن، بۆئەومەبەستە چەند ئافرەتێك چون و هەشتا داریان لە ئا فرەتەکەدا لە دوای تەواو بوونی دارەکان دەستی ئافرەتەکە لە تەرمەکە بەڕەڵا بوو. وە هەر بۆیەش ووتویانە هەتا پێشەوا (مالك )لە شار دابێ کەس بۆی نیە لەبارەی ئاینەوە قسە بکاو بدوێ .

# ﴿خۆپارێزی و زانیاری﴾

## ( تقوی وعـلم)

زانـای بەناوبانگ ولـەخودا تـرس پێـشەوا( شـافعی رضي الله عنه)دەفـەرموێ: ڕۆژێـك بەهەڵە چاوم بە پاژنەی ئافرەتێك کەوت، لە دواییدا کە سەیری کتێبم کرد هیچ شتێکم لە بیرنەمابوو منیش زۆر بە دڵی پەرێشان و, مەلولەوە ڕۆیشتم بۆلای مامۆستا( وە کیعی کوڕی جەراح رضي الله عنه) سکاڵای بیٚ بیروهۆشیم لە لا کرد، بەو چەند ووتانە ؟

شــكوت الــى وكيــع ســوء حفظــي

فأرشـــدني الـــى تـــرك المعاصـــي

واخبرنـــي بـــأن العـــلم نـــور

ونـــور الله لايـــهدى لعاصـــي

واتـە: سـکاڵای لـە بـیر چـوونەوەم بـردە لای ماموسـتا (وەکیـع) ی ئـەویش شـارەزای کـردم کـە تـاوان و نـاڕەوایی نەکـەم وەپێـی ووتم: زانیـاری ڕووناکیـەو ڕوونـاکی خـوداش تـاوان بـاران شـارەزا ناکـات :منـیش بەوشـێوە کـردم بەهەڵبەست:

چومەلای زانا وەکیـعی بۆ سکاڵای بیری کو یٚرم

پیٚ ی ووتم ئیشی خەراپە لێرە بەدوا هەڵ بوێرم

علم و زانیاری ڕووناکە تیشکی خوای گەورە وبەڕێز

هەر لەگــەڵ ڕوونا کی دەڕوا چاك بـزانە پڕ بە هێز

نوری خوا ڕووناکی بەخشە بۆ کەسیٚ نوری بویٚ

ڕێگەی ڕۆشەن بەدی ناکەن کەسیٚ لەخوا دورکەویٚ

## ﴿پرسەی نەفسی خۆت بکە بەو شێوەی کە پرسەی خەڵکی پێ دەکەی﴾

## ( عـز نفسك بما تعـزى بە غـيرك)

دەگێڕنـــەوە جارێـــك بـــە پێـــشەوا (شـــافيعی ﷺ)ان ووت :ئـــەی پێـــشەوا (عبدالرحمن كوڕی مەهدی ﷺ) كوڕێكی مرد لەسەر تەرمەكەی كردیە هاوارو ڕۆڕۆ، پێشەوا (شافعی ﷺ) بەو شێوە پرسە نامەیەكی بۆ نوسی ئەی برای موسڵمان پرسەی نەفسەكەی خۆت بكە بەوەی كەپرسەی خەڵكی پێ دەكەی ئەو ڕەوشتانەی لەخەڵك داپێت خۆش نیەو ڕق وقینت لێیانە لە خۆشت دا،پێت خۆش نەبێ‌و ڕقت لێیان بێت، وەخودا ئارامت پێ ببەخشێ لە كاتی توش بوونی بەسەرهات . وە خودای گەورە پاداشتی هەموولایەكمان بداتەوە بە هۆی ئارامی و لەسەرە خۆیی, وە ئەو شعرانەشی بۆ نوسی :

إنـــی معـــزيك لا إنـــی عـــلی ثقـــة
مـــن الخلـــود ولـــكن ســـنة الـــدين
فمـــا المعـــزی ببـــاق بعـــد ميتـــه
ولا المعـــزی ولـــو عـــاش الـــی حـــين

واتە: پرسەت لێدەكەم‌و هیوای ئەوەم نیە كە ئەمن هەردەمێنمەوە بەڵام ئاین ڕەوشتی وایە پرسەت لێ بكەم، چونكە ئەوەی سەرە خۆشی دەكات لە دوای مردوەكە نامێنێتەوە, وە ئەوەی سەرەخۆشیشی لێ دەكرێ بەردەوام نامێنێتەوە باماوەیەكی زۆریش بەسەر بەرێ هەر كۆچی دوایی دەكات : منیش بەوشێوە ردمە هەڵبەست :

دەچمە لای خاوەن موسیبەت پرسەی خۆشی لێدەكەم
نەك لەبەر وەی خۆم دەمێنم بۆ ژیانی خۆم ڕێدەكەم
هیچ كەسێ لەم ژیان‌و ژینە تا ئەبەد نای باتە سەر
گەر سەدان ساڵ بژی دەمری لەماڵێ دەت هێنتەدەر

## ﴿ وتو ویژو گوفتوگۆ کردن بە هەڵبەست ﴾

(محاورة شعرية)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پێشەوا(شافعی رضي الله عنه)لەگەڵ پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رضي الله عنه ) بەیەك دەگەن پێشەوا( شافعی رضي الله عنه) فەرمووی:

أحب الصالحين ولست منهم لعلي أن انال بهم شفاعة
واكره من تجارته المعاصي وان كنا سويا في البضاعة

واتە:پیاوی باشم خۆش دەوێن هەرچەند کەبۆ خۆشم پیاوی باش نیم،بەلاّم هیوام زۆرە کەبەبەر نزای ئەوان بکەوم، وە زۆریش قینم لە بازرگانی خەراپە دەبێتەوە هەرچەند کە ڕەوشتەکانمان لەگەڵ تاوان باران وەك و یەکە: بەو جۆرە کردم بەهەڵبەست :

هەرچەند کەمن پیاو چاك نیم، پیاو چاکم زۆر خۆش دەوێ
خودا کارێکی وا بکا چاکەی وانم بەرکەوێ
تاوان و ناڕەوایی بەدڵ زۆر ڕقم لێ یە
هەرچەند کارو کرداری ڕەوشتی من لە وێ یە

پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رضي الله عنه) لە وەلاّم دا فەرمووی:

تحب الصالحين وانت منهم ومنكم سوف يلقون الشفا عة
وتكره من تجارته المعاصي وقاءَ الله من شر البضاعة

واتە: ئەی (شا فعی رضي الله عنه)تۆ پیاوی باشت خۆش دەوێو بۆخۆشت یەکێکی لەپیا و باشان وە هیواشمان وایە کە لەمەودوا بەبەر تکای ئێوە بکەوین, وە زۆرتان ڕق لە بازرگانی تاوان باری یە, خودای گەورە لە بەلاّو ئاژاوەی تاوان باران بت پارێزێ :

تۆ پیاو باشت خۆش دەوێ بێگومان تۆش لەوانی
بە هیوای چاکەی تۆمە هەرچەندکە پێ ی ئەزانی
کردەوەی بەد ڕەفتاری زۆر پێت ناخۆشە بەزۆر
خوداش تۆ دەپارێزێ لەبەلاّو کردەوەی بۆر

## ﴿سێ شتی بە کەڵك﴾

### (ثلاثة مفيدات)

ڕۆژێـك پێـشەوا(شـافعی) دەچـێتە دیـدەنی پێـشەوا (ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەل ) شەو لە دوای نان خواردن و دانیشتنێکی خۆش بردنە سەر, هەر یەکەیان دەچێتە سەر جێگای خەوتن، کچەکەی پێشەوا (ئەحمەد) زۆر بە ووردی لە هەڵ سوکەوتەکانی پێشەوا( شا فعی) ورد دەبێتەوە، بەیانی لەدوای هەستان و نوێژ کرن کچی امام (احمد) دەچێتە لای باوکی و دەڵێ: بابە ئەوەیە (شافعی) کەزۆر باست بۆ دەکردین ؟ لە وڵامدا باوکی ووتی: بەڵێ کچم ئەوەیە زانای بەرزو بەناوبانگ کچەکەی ووتی: بابە لەئێوارەوە هەتا ئێستا سێ ڕەخنەم لێگرتووە ؟ باوکی ووتی: ڕەخنەکان چین بڵێ: کچەکەی ووتی: ئێوارە لەسەر سفرەی نان خواردن زۆری خوارد, زۆرخواردنیش نیشانەی تەمبەڵییە، وە کەڕۆیشتە سەر جێگای نوستن هەتا بەیانی هەڵنەستاو شەو نوێژی نەکرد، وە هەروەها بەیانی هەستا بەبێ دەست نوێژ جەماعەتی بۆ کردین پێشەوا (ئەحمەد) ووتەکانی کچەکەی بە پێشەوا (شافعی) ڕاگەیاند بۆ ئەوەی وەڵامی ڕەخنەکانی بداتەوە( شافعی) ووتی: ئەی (ئەحمەد) بۆ یە ئێوارە زۆرم خوارد چونکە دەم زانی کە خواردنەکەتان دروستو ڕەوایە وە تۆش ئینسانێکی بەخشندەی، وە هەروەها خواردنی بەخشندانیش دەرمانی دەردانە, وەخواردنی چاو چنۆکانیش دەردو نەخۆشیە, وەهەروەها من بۆیە زۆرم خوارد لەبەر خواردنو وورگم نەبوو چونکە ئەوەندە زۆر خۆرنیم؟ تەنها بۆیە خواردم بۆ ئەوەی وەك دەرمان نەخۆشی پێ چارەسەر بکەمو ببێتە شیفای دەردەکانم، وە ئەو شەویش ڕێگای شەو نوێژم نەبوو لەبەر ئەوەی کەسەرم خستە سەر بالیف بۆ نوستن،خەیاڵو بیرێك هاتە بەر چاوم بۆ دەرهێنانو حەل کردنی چەند پرسیارێکی شەرعی, بۆئەو مەبەستە قورئان و

فـەرموودەکانی پێغەمبـەرم(ﷺ)هێنایـە پـێش بـیرو فکـرم (٧٢)حـەفتاو دوو پرسیاری شەرعیم شی کردەوە،کە بۆ موسڵمانان, بۆتە خزمەتێکی زۆر باش و گـەورەو پێـشکەشم کردون،بۆیـە نـەم تـوانی ئەمـشەو شـەونوێژێ بکـەم, وە هـەروەها نوێـژی بـەیانیم بـە جەماعـەت بـۆ ئێـوە کـرد بـەبێ دەسـت نوێـژ هەڵگرتنەوە:

سوێند بە خودای گەورە لە ئیوارەوە هە تاکو ئێستا چاوم نەچۆتە خەو, بۆیە دەست نوێژەکەی ئێوارەم نەشکاوە تاك و دەست نوێژی بۆ نوێ بکەمـەوە, وە بە درێژایی شەو بە خەبەر بووم : نوێـژی بەیانیم بەدەسـت نوێـژی خـەوتنان بۆ کردن .

## ﴿ لەمیهرەبانی وسینگ فراوانی پێشەوا مالك و شافـعی ﴾

### ( في رحاب مالك والشافعي)

ئەوکاتەی کە پێشەوا( شا فعیرضي الله عنه) قوتابی پێشەوا (مالكرضي الله عنه ) بووە ڕۆژێك (شافعیرضي الله عنه) لە مزگەوت دا لەناو کۆڕێکی زۆر گەورە وتار دەخوێنێتەوە، پێشە وا ( مالـكرضي الله عنه) بـەنهێنی دەڕواتـە مزگـەوت و لـە پـەنای پایەیـەکی مزگـەوت دادەنیـشێ بـۆ ئـەوەی (شـافعیرضي الله عنه ) هەسـتی پـێ نـەکات و بزانـێ ووتارەکـەی چۆنە، بـەلام . بەڕاستی ووتارەکـەی بـەدڵ دەبێت و، هەربـەنهێنی لەسـەر پایـەی دیوارەکە دە نوسێ، هەرکـەس دەیـەوێ زانیـاری بـاش فێـر بـێ بالـەلای (محمـدی کوڕی ئیدریسرضي الله عنه ) یانی پێشەوا (شـافعی) بخوێنێت، لە دوای نوسینی ئـەو نوسـراوەیە نـەی هێـشت (شـافعیرضي الله عنه) هەسـتی پێبکـات خێـرا ڕۆیـشتە دەرەوە، کاتێـك( شـافعیرضي الله عنه) چـاوی بـەو نوسـراوەیە کـەوت و خوێندیـەوە فـەرمووی: سوێند بەخودا ئەو نوسراوە ووتەی مامۆستا :( مالیك)ە بۆ یە( شافعی) ش لـە ژێـری نوسـراوە کەیـەوە نوسی،چۆن وا دەبێـت ئـەی پێشەوا (مالـك) (شـا فعـی) قوتابی بەردەستی تۆ یە !!

## ﴿لە ئەندازە بەدەری زانایان﴾

### (كرامة الفقهاء)

ڕۆژێك لە ڕۆژان گەنجێکی تازە پێ گەیشتو دەچێتە ماڵی پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەلﷺ) سکاڵای دایکی لە لای دەکات و دەڵێ ئەی پێشەوا دایکم توشی ئیفلیجی بووە بەهەموو شێوەیەك داودەرمانمان بەکار هێناوە بەڵام هیچ کەڵکی نەبووە ئێستاش دایکم منی ناردووە بۆلای تۆ، کە تکای بەخێری بۆ بکەیت و بەڵکو خودای گەورە تەندروستی باش بکات ولەونەخۆشیە چاك و ساڕێژ بێتەوە,

پێشەوا( ئەحمەدﷺ) ووتی: ڕۆڵەم کێ پێ ی ووتی: خودا تکای من وەردەگرێت، بڕۆ بۆلای دایکت، تکاو نزاکەمان پێی گەیشتو, دایکت باش بۆوەو، با ئەویش تکای بەخێرمان بۆ بکات :

گەنجەکە: دەستی کرد بەگریان زۆر بەکوڵ دەگریا، دایکی پێشەوا (ئەحمەدﷺ) چاوی بەو گەنجە کەوت دەگریا، ووتی: ڕۆڵە بۆچی دەگریەی چی بووە گەنجەکە ووتی: ئەی دایکی پێشەوا من هاتوم بۆ لای کوڕەکەت کە تکام بۆ لەخودا بکات بۆ دایکم بەڵام . هیچ تکای بۆ نەکردم پێی ووتم: بڕۆوە بۆلای دایکت، ئەمجار دایکی پێشەوا ووتی: کوڕم بڕۆ بۆلای دایکت من گوێم لێ بوو (ئەحمەد) تکای بۆ دایکت دەکرد، کوڕە گەنجەکە بەو ووتەیە دڵی دامەزراو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە لە دەرگای دا دایکی هەستاو, دەرگای لێ کردەوە، بەتکای پێشەوا (ئەحمەد) لەبەر خودای گەورە ئەو ئافرەتە لە ئیفلیجەکەی چاك بۆوە .

## ﴿ دەرمانی خوداناسان﴾

(دواءالعارفين)

جارێـك كابرايـەك هاتـە لای زانـای بـە ناوبـانگ و خـودا ناسـی بەڕاسـتی (سوفيانی سەوری) ووتی: ئەی (سوفيان) هاتومە لات و هاوارم بۆت هێناوە نەخۆشـی دورکەوتنـەوەم لـەخودا هەيـە، هـەتا بیٌ باوەڕ نـەبووم بـە فريام کـەوە (سوفيان) لەوەڵام دا ووتی: پێويستە ڕەگی دڵسۆزی لەدڵت دا بەکاربهێنی وە ئارامت هەبیٌ و مل کەچی فەرمانی خودابيت واتە: ڕەگی دڵ سۆزی و گەڵای ئارام و شەربەتی مل کەچی لە ناو قاپی خۆپارێزی بکەی، ئاوی فرمێسکی چاو کە لـە ترسـی خـودا ڕژابێـت بخەيتـە سـەری و ئاگری مات و مـەلولی لـەژێر هـەڵ بکـەی و بـە پـاکی و، پاك کردنەوەيـەکی بەرامبـەری خـۆت ڕابگری، وە دەسـتی ڕاسـتی بـۆ درێـژ بکـەی و پيالـەی پەشـيمانی نـۆش بکـەی و بـە تـرس و خۆپارێزيـەوە بـی شـڵقێنە و،لـە چـاوتەنگی و ورگ برسـيەتی و ڕژدی خـۆت بپارێزە ئەگەر بەوشێوەيە ڕەفتارت کرد، ئەوا بەفـەرمانی خـودا لـەو نەخۆشيە ساغ دەبيەوە .

## ﴿ لە گەڵ خۆشەويستانی خوادا﴾

(مع اولياء الله)

دەگێڕنەوە (ئەبو يەزيـدی بەسـتامی) شـەوێك لـە خـەوی دا بـانگی دەکـەن، ئـەی بـاوکی يەزيـد هەسـتە ئـەم شـەو جـەژنی (گـاورو فەلانـە) لەکليـساکانيان کۆبونەوە برۆ بۆلايان‌و پەيامی (پێغەمبەر) يان پێڕا بگەيەنە، باوکی يەزيد هەر خێرا لە خەوەکەيدا ڕاپەڕی بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو بانگە وازەبداتەوە، بەرەو کليسايەك بۆکليسای گاورەکان کەوتەڕیٌ بـەنهێنی ڕۆيشتە نـاو گاورەکانـەوە لـە

سوچێکەوە لێی دانیشت بەبیری خۆی وای زانی کەس هەستی پێ نەکردووە، بەڵام ڕاهیبەکەیان هەر چاوی دەگێڕاو بەگاورەکانی ووت یەك قسەتان بۆ ناکەم هەتا ئەو پیاوەی لە سەر ئاینی (محمدە) لێرەبێ دەستیشی بۆ باوکی یەزید ڕادەهێشت:

خەڵکەکە هەموو بە جارێك ووتیان: گەورەمان چۆن لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا دەزانی ئەوە لەسەر باوەڕی ئاینی (محمدە ) ؟ ڕاهیبەکە لە وەڵام دا ووتی:دۆستو هاوڕێیانی محمد نیشانەی پاکی و کڕنۆش، لەدەم وچاویانەوە دەدرەوشێتەوە، ئەو جار گاورەکان ڕوویان لە باوکی یەزید کردو ووتیان: لێرە بڕۆ کلیسەکەمان بەجێ بهێڵە، ئەبو یەزید لە وەڵام دا ووتی: لێرە ناڕۆم هەتاك و خودای گەورە نێوانمان نەکات کەبەڕاستی خودای گەورەش گەورە ترین دادپرسە؟. هەرچەندی کردیان( ئەبو یەزید) نەڕۆیشت، ڕاهیبەکە ووتی: باشە ئەبو یەزید من چەند پرسیارێکت لێ دەکەم ئەگەر بەتەواوی وەڵام بدەیەوە هەمووومان باوەڕ بە خودای تاکو تەنهاو, بەپێغەمبەریەتی محمدﷺ دەهێنین . وە بەپێچەوانەش ئەگەر تەنها یەك پرسیار وەڵام نەدەیەوە لەسەرت دەدەم، (ئەبویەزید)فەرمووی:چۆنی ئێوە ئارەزودەکەن باوابێ،وەهەر پرسیارێکتان هەیە بیکەن ؟ ئامادەم وەڵامت بدەمەوە چونکە خودای گەورە لە قورئان دا دە فەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ بقره /٢٨٢.

واتە: خۆ پاریزبن ویادی خودا بکەن خودای گەورەش فێری هەموو شتێکتان دەکات وە هیچتان لەبەردەم عاسێ و گیرنا بێت . وەبێ گومان خودای گەورەش زانایە بەهەموو شتێك ڕاهیبی گاورەکان هەستایە سەرپێ و دەستی کرد بە پرسیار کردن: باوکی (یەزیدیش) دانیشتبو گوێی ڕاگرتبو، ڕاهیبەکە ووتی:

١- ئەو یەکەی هەرگیز وە قەت نابێ بە دوو: چی یە ؟

٢- وە ئەو دووەی هەرگیز وە قەت نابێ بەسێ: چی یە ؟

٣- وە ئەو سێ یەی کەهەرگیز نابێ بە چوار :چی یە ؟

٤- وە ئەو چوارەی کەهەرگیز نابێ بە پێنج: چی یە ؟

٥- وە ئەو پێنجەی کەهەرگیز وەقەت نابێ بە شەش: چی یە ؟

٦- وەئەو شەشەی کەهەرگیز وەقەت نابێ بەحەوت: چی یە ؟

٧- وە ئەوحەوتەی هەرگیز وەقەت نابێ بە هەشت :چی یە ؟

٨- وە ئە و هەشتەی هەگیز وەقەت نابێ بە نۆ: چی یە ؟

٩- وە ئەو نۆ ڕادە بەدەرانە (معجزە) چین ؟

١٠- وەهەروەها ئەو دەیانەی کە هیوای زیاتریان لێ دەکرێ چین ؟

١١- وە ئەو پانزە کەسانە کێ بوون ؟

١٢- وە ئەو دوانزە لەرادە بەدەرانە (معجزە) پێك هاتوی چین ؟

١٣- وە ئەو سێنزە کەسە کێ بوون ؟

١٤- وە ئەو گۆڕەی کەبوو بەخاوەنی کێ بوو؟

١٥- وە ئەو شتەی کە هەناسە دەدات وگیانی نیە چیە ؟

١٦- وە ئەو شتەی کە خودا دروستی کردووەو ناخۆشیشی ویستوە؟

١٧- وە ئەوانەکێ بوون ڕاستیان ووت و چونە دۆزەخ ؟

١٨- وە ئەوانەش کە درۆیان کردو چوونە بەهەشت ؟

١٩- وە ئەوانەی کە خودا بەبێ دایك و باوك دروستی کردن کێ بوون ؟

٢٠- وەئەودارەچیە کەخودا دروستی کردووە, سێ کەڵی پێوە هەرکەڵێکی پێنج میوەی پێوەیە،سێ میوەیان لەبەر سێبەرێیەو, دووانیشان لەبەر ڕۆژێیە ؟

لەدوای تەواو بوونی پرسیارەکان ووتی: باوکی یەزید وەڵامی ئەو پرسیارنەم بدەوە تاكو باوەڕ بە خوداو پێغەمبەری خودا بێنین، ئەو جار ڕاهبەکە دانیشت و (ئەبایەزید ﷺ) هەستایە سەرپێ و داوای یارمەتی لە خودای گەورە کرد یارمە تی بدات بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکان, ئەو خودایەی بفەرموێ ببە بووەو هیچ ڕاوەستانی تێدانیە, باوکی یەزید لەوەڵامدا ووتی:

ئەویەکەی نابێ بەدوو ؟ ئەوە خودای گەورەو مهرەبانە ( قل هو الله احد)

بەڕاستی تاك و تەنهایە لەخودایە تیداو هاوبەش ووێنەی نییە .

وە ئەو دووەی هەرگیز نابێ بەسێ ؟ ئەوە شەو ڕۆژە . وەك و خودا دەفەرموێ: (وجعلنا الليل والنهار آيتين)، واتە: شەو ڕۆژمان گێڕاوە بەدوو نیشانەی زۆر گەورە بۆ ئەوانەی کەبیر بکەنەوە . وە ئەو سێیەی نابێ بەچوار ؟ ئەوە بەهانەکانی بەڕێز( موسا ) یە لەگەڵ بەڕێز (خدر) دا سەلامی خوایان لەسەر: ئەویش ئەوانەن, کون کردنو نوقم بوونی کەشتیەکەو، کوشتنی بەندەکەو، چاك کردنەوەی دیوارە ڕوخاوەکە، لە دوایی ئەوە دوورکەوتنەوەی حەزرەتی موساو، حەزرەتی خدربوون لەیەکتری:

وە ئەوچوارەی نابێ بە پێنج ؟ ئەوە تەورات و,زەبورو, ئینجیل و, قورئانی پیرۆزە بۆ دواترین پێغەمبەران هاتەخوار.

وە ئەو پێنجەی نابێ بەشەش؟ ئەوە پێنج فەرزەی نوێژە لەشەو ڕۆژێك دا کە خودا لەسەر کۆمەڵە بەندەکانی بە پێویست گێراوە .

وەئەو شەشەی نابێ بە حەوت ؟ ئەو شەش ڕۆژەیە خودای مهرەبان زەوی وئاسمانی تێدا دروست کردووە، وەك و خودای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ق/٣٨.

واتە: بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانمان دروست کردوە لە ماوەی شەش ڕۆژدا،وەبە بۆنەی دروست کردنیەوە هیچ ناڕەحەتی و ماندو بونێکمان توش نەهاتووە، ڕاهیبەکە هاتە قسەو ووتی ئەی باوکی یەزید بۆ چی کۆتایی ئەو ئایەتە بەو فەرموودە هات کە دە فەرموێ: (وما مسنا من لغوب) واتە: ئێمە هیچ نارەحەتی و ماند و نەبوین باوکی یەزید ووتی: گاورەکان وابیر دەکەنەوە کاتێ خودای گەورە زەوی و ئاسمانی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد هیلاك بووە. ڕۆژی شەممە پشوی داوە. ئێنجا بۆ بەدرۆ خستنەوەی گاورە بێ باوەڕەکان خودای گەورە فەرمووی: ئێمە هیچ هیلاك و ناڕەحەت نەبووین لە دروست کردنی ئاسمان و زەوی هەتا پشوی تێدا بدەین هەروەك و دەفەرموێ:﴿

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾يس /٨٢.

واتە : بێ گومان فەرمانی خودا هەرکاتێك خواستی لەسەر شتێك بوو کە فەرمووی: ببە بووەوتەواوە .

وەئەو حەوتەی کە نابێ بەهەشت ؟

ئەوە دروست کردنی حەوت ئاسمانەکانە لەسەریەك، وە هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ : ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِن فُطُورٍ﴾ملك/٣ .

واتە: ئەو خودایەی حەوت ئاسمانی لە ژور سەرتانەوە دروست کردووە یەك لە سەریەك بەهیچ جۆرێك نارێکی تێدا نابینرێ: د ووبارە سە یریکەن وە ئەگەر گومانتان هەیە بزانن هیچ نارێکی تێدایە ؟

وەئەوهەشتە کە نابی بە نۆ ؟ ئەوە هەڵگرانی تەختی خودای بەخشندەیە لە ڕۆژی دوایی دا وەك خودا دەفەرموێ: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ الحاقە /١٧.

واتە: لە ڕۆژی دوایی تەختی پەروەردگاری تۆ هەشت فریشتە هەڵی دەگرن لە سەرووی هەموفریشتەکانی کەوە:

وە ئەونۆ لە ئەندازە بە درانەش (معجزانە)، ئەوە ئەوکارە هەڵکە وتوانە ی بەڕێز (موسا) یە سەلامی خوای لە سەربێ :

یەکەم: دەستی ڕووناکە هەروەك و ڕۆژ دەدرەوشایەوە؟.

دووەم: دار دەستی کاری هەڵکەوتوی پێ دەکرد.

سێهەم : گۆڕانی هێندێك لە ئادەمیزادەکانە بە بوونیان بە بەرد .

چوارەم: گرانی و نەبونی.

پێنچەم: وێرانی وکارەسات بەبارانێکی بەتەوژم،ماوەی هەشت شەو هەشت ڕۆژ باری بەبێ پشو کەزەوی و خانوی هیچ نەمێشت.

شەشەم:کوڵلە ماوەی هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو: باخ و باخات و دانە وێڵەی

هیچ نە هێشت.

حەوتەم : ئەسپێ‌ومۆرانە ئەویش ماوەی هەشت ڕۆژ دەوامی کرد خۆراکی ماڵیانی هیچ نەهێشت و، کەوتە لەشیان و هەموو گیانیانی قەڵاش کرد.

هەشتەم: بۆق ئەوەیش هەشت ڕۆژ دەوامی کرد ئەوەندە زۆر بوون دەچونە ناو خواردنەکەیان و، ناو قاپ و، پۆشاکیانەوە، بۆ گەنێکی زۆر ناخۆشیان هەبوو بەڕاستی گێجەڵێکی گەورە بوو.

نۆیەم: خوێن لەباتی ئاو هەر خوێن بوو ماوەی هەشت ڕۆژ ئەویش بەردوام بوو وەئەو دەیە: ی کە هیوای زیاتری لێ دەکرێ . ئەوە کردەوەی چاکەیە وەك خودای گەورە دەفەرموێ:﴿مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ انعام/١٦٠. واتە: هەرکەسێك کردەوەیەکی چاکە بکات ئەوە خودای گەورە لەباتی ئەو کردەوە دەئەوندەی خۆی چاکەی بۆ دەنوسێ‌و زیاتریشی بۆدەنو سێ بۆ ئەوکەسانەی ئارەزوی لێ بێت:

وە ئەو یازدە:کەسەش براکانی حەزرەتی (یوسف)ن وەك‌وخودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾یوسف /٤ واتە: ئەی بابە من لە خەوم دا چاوم بە یانزە ئەستێرەو، مانگ‌و، ڕۆژ کەوت .کڕنوشیان بۆ دەبردم .

وە ئەوکارە هەڵکەوتوانەی (معجزە) کە لەدوانزە شت پێك هاتووە،

ئەو فەرموودە خودا یی یە بخوێنەوە دەفەرموێ :

﴿وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً﴾ البقرە /٦٠

واتە:کاتێك موسا داوای ئاوی کرد ئێمەش پێمان ووت دار دەستەکەت (عصا) بەوبەردە ڕەقەدا بدە . کەعەصایەکەی لەبەردەکەدا (١٢) دووانزە سەرچاوەی ئاولەبەردەکە هەڵقوڵا .:

وە ئەوسێزدە: کەسەش بریتین لەبرایەکانی حەزرەتی یوسف و،باوك و،

دایکی, وەك وخودا دەفەرموێ : ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾یوسف/٤

واتە:ئەی بابە من لەخەوم داچاوم بەیانزە ئەستێرەو,مانگو, ڕۆژ, کەوت.کڕنۆشیان بۆدەبردم.

وەئەو شتەی کە هەناسە دەدات و, هیچ گیانی تێدانیە ؟ ئەوە سپێدەی بەیانە کە ڕووناکی دوونیا دادەگرێ .وەکو خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ التكویر/١٨

وە ئەو گۆڕەی بوو بە خاوەنی، ئەو فەرموودە خوداییە بخوێنەوە دەفەرموێ:﴿ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ * فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُسَبِّحِينَ * لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ الصافات / ١٤٢ – ١٤٤

واتە: ئەگەر حەزرەتی یونس لەکاتی خۆشی و هێمنی دا یادی خودای نە کردبایەو, لەکاتی قوتدانی نەهەنگەکە یادی خودای نەکردبایە, ئەوە لە ناوزگی نەهەنگەکە هەتا ڕۆژی دوایی دەمایەوە بەڵام.بەهۆی پیرۆزی یادی خودا ڕزگارمان کرد.

وەئەوانەی کەڕاستیان ووت وچوونە دۆزەخەوە، ئەوە گاورو یەهودین. ڕاهیبەکە ووتی. لەوئایەتەدا خودا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَى شَيْءٍ﴾ البقرة/١١٣.

واتە: یەهودی دەڵێن گاور لەسەر هیچ ئاینێك نین،وگاور دەڵێن: یەهودی لەسەر هیچ ئاینێك نین تەنها لەوەدا ڕاستیان ووتوە،بۆیە خاوەنی دۆزەخن وە خودای گەورە لەئایەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾آلعمران/٨٥.

واتە: هەرکەسێك بێجگە لەئاینی ئیسلام بەدوای هەرئاین وڕێبازێك دا بڕوات ئەوە خودا لێی وەرناگرێ و بەهۆی ئەوەشەوە کە دەستی لە دینی ئیسلام هەڵگرتووەو پشتی تێ کردوە لەڕۆژی دوایی دا لەزەرەر مەندان دادەبێت.

## دۆستی باوەڕداران

وە ئەوشـتەی کـەخودادروستی کـردووەو ناخۆشی ویـستووە ئـەوەخودای گەورە دە فەرمویٚ : ﴿إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾لقمان/١٩.

واتە: بیٚ گومان ناخۆشترین دەنگ دەنگی زەڕەی گویٚ دریٚـژە لەبەر ناسازی هیٚزی ئاوازەکەی.

وە ئەوانـەی کـە درۆیـان کـردو چـونە بەهەشـت .ئـەوە برایـەکانی حـەزرەتی یوسف بوون وەكوخودای گەورە دەفـەرمویٚ: ﴿إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَاعِنَا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾یوسف/١٧.

واتە: کاتیٚك ئیٚمە گەیشتینە دەشت دەستمان کرد بەیاری یوسفمان لـەلای پـۆ شـاکەکانماندا بـەجیٚ هیٚـشت ئاگامـان لیٚ نـەبوو گـورگ خـواردی. لـەو قسەیەدا درۆیان کرد گورگ نەی خوارد بوو لەدوای زۆر لەماند وبوون و ئازاریٚکی بـەتین حەزرەتی یوسف بەوفـەرموودە خودایی یە وەلامی دابونـەوە : ﴿قَـالَ لاَ تَثْرِيـبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾یوسف/٩٢.

واتـە: ئـەمڕۆ یوسـف هـیچ تۆڵـەی دڵ ئازاردانی لەسـەر ئیٚوە نیە خـودا لیٚتـان خـۆش دەبـیٚ و بـیٚ گومـان خـوداش میهـرە بـان وبەبـەزە یـی یـە. وەحـەزرەتی یەعقوب سەلامی خودای لەسەر،بەکوڕەکانی فەرموو:

﴿قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيَ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾یوسف/٩٨

واتە: ئیٚستا وازم لیٚ بهیٚنن هەتا کاتیٚك خودا دڵم ڕوناك دەکاتەوە بۆ نزاکـردن: کـاتی تایبـەتی هەیـەو خـودا حـەز بکـات بـەو زوانـە داوای لیٚ خـۆش بونتـان بـۆ دەکەم لە خوای مهرەبانی خۆم: بەڕاستی خوداش تاوان بەخش ومهرەبانە.

وەئـەو شـتانەی کـە خـودای گـەورە بـەبیٚ دایـك و بـاوك دروسـتی کـردون ئـەوە فریـشتە کـانی خـودان کـە پەیکـەریان لـە ڕوونـاکی دروسـت کـراوە نـاخۆن و, ناخۆنەوەو, نانون،ژن و ژن خوازیان نیەو, منداڵ و نەوەیان لیٚ پاشەکەوت نـابیٚ وەزیکرو یادو نزایـان بەهـەموو کـات بەردەوامـەو ڕاوەسـتانیان نیە، وەك و چـۆن ئیٚمـە هـەتا لـەژیان دابین بـەردەوام هەناسـە دەدەیـن . ئـەوانیش بـەردەوام یـادی

خودا دەکەن.

وەھەروھا حەزرەتی ئادەم خودا خەلقی کرد بەبێ دایكو باوك وە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ آل عمران/٥٩.

واتە:بێ گومان شێوەی حەزرەتی عیسا وەك و شێوەی حەزرەتی ئادەم وەھایە کە بەبێ باوك لەدایك بووە.

ھەروەھاخودا ئادەمی لەقوڕ دروست کردووەو فەرمووی:ببە بەئینسانێکی زیندو؟ ئەویش بوو.

وەھەروەھا بەرانی حەزرەتی اسماعیل و حوشتری حەزرەتی صالح بەبێ دایكو باوك دروست کراون .

وە ئەودارەی کە لە(١٢) دوانزە کەڵ پێك ھاتووە. ھەر کەڵێکیش (٣٠)سی چڵی پێوەیە ھەرچڵێکیش (٥)پێنج میوەی پێوەیە (٣)سێ میوەیان لە بەر سێبەرن و (٢)دوانیان لەبەر ھەتاون .ئەوە ساڵە دوانزدە مانگە ھەر مانگێك سی ڕۆژە، ھەر ڕۆژێك پێنج نوێژی پێویستی تێدایە سێ یان لە ڕۆژ ئاوادان نوێژی شێوان و، خەوتنان و، بەیانیان، وە دوانیشیان لە ڕۆژێ دان نیوە ڕۆو، عەسر، بەو جۆرە (ئەبویەزید) وەڵامی ھەموو پرسیارەکانی ڕاھیبەکەی دایەوە، دوایی ووتی: منیش پرسیارێکم ھەیە و وەڵامم بدەوە ؟

ڕاھیبەکە ووتی: پرسیارەکەت بکە منیش ئامادەم وەڵامت بدەمەوە ( ئەبویەزید ﷺ) فەرمووی: باشە کلیلی دەرگای بەھەشت چیە ؟ ڕاھیبەکە بەبێ وەڵام ڕاوەستاو ھیچ دەنگی نەکرد گاورەکان ھەموو بە جارێك بەڕاھیبەکەیان ووت: گەورەو بەڕێزمان تۆ ئەو ھەموو پرسیارەت لێ کرد بەبێ ڕاوە ستان وەڵامی دایەوە، ئەویش تەنھا یەك پرسیاری لێ کردوی ڕاوەستاوی وەڵامت نیە، بە تەنھا یەك پرسیار نازانی !. ڕاھیبەکە ووتی: ڕۆڵەکانم من وەڵامی پرسیارەکەی دەزانم . بەڵام لەئێوە دەترسێم، گاورەکان ھەموو بەجارێك

وتيان: وەلامەكەى بدەوەو هيچ ترست نەبێ، بەو جۆرە ڕاهيبەكە هەستايە سەرپێ و بەدەنگێكى بەرز هاوارى كردو وتى: كليلى دەرگاى بەهەشت. (لااله الا الله محمد رسول الله) يە.

ئەوجار لەدوايى ڕاهيبەكە، گاورەكانى ناو كليسايەكە هەموو بە جارێك وتيان: ( لااله الا الله محمد رسول الله) هەموويان بەجارێك موسڵمان بوون وكليساكەيان گۆڕى بە مزگەوت و يادو خودا پەرستيان بەڕاستى دەست پێ كرد .

## ﴿ ئامۆژگارى وڕاسپێرى شارەزايان﴾

## (وصاياالعارفين)

جارێكيان كۆمەڵێك بە (ئيبراهيمى ئەدهەمﷺ)خوداپەرستى لەخوداترسيان ووت: ابراهيم ئامۆژگارى يەكمان بكە سودى بۆمان ببێ ئەويش لەوەلام دا وتى: شەش ئامۆژگاريتان دەكەم ئەگەر بەقسەم بكەن سودى لێ وەردەگرن :

يەكەم: هەركاتێك بەندەكانى خواتان ديت بەئيشى دونياوە خەريك بوون ئێوەش بەئيشى دواڕۆژەوە خەريك بن.

دووەم: هەركاتێك بەندەكانى خواتان ديت خەريكى پاكى ئەندامى دەرەوەيانن ئێوە خەريكى پاك و ڕێك خستنى ناوەوەتان بن بۆئەوەى دڵ وگيانتان پاك بكەنەوە.

سێهەم: ئەگەر كۆمەڵانى خەڵك گيرۆدەى ئاوەدان كردنەوەى باخ وبێستان بوون ئێوە گيرۆدەى ئاوەدان كردنەوەى گۆڕەكانتان بن.

چوارەم: ئەگەر بە ندەكانى خودا خەريكى ڕێزلێنانى خەڵك بوون ئێوە خەريكى ڕێزلێنانى خوداى پەروەردگاربن.

پێنجەم: ئەگەر بەندەكانى خودا خەريكى دۆزينەوەى ناشيرينى

یەکتربوون،ئێوە خەریکی دۆزینەوەی ناشرینی خۆتان بن.

شەشەم:پێویستە لە دونیادا تێشوێك ئامادە بکەن کەبتوانن پێی بگەنە ڕۆژی دوایی چونکە بێگومان ئەودونیایە کێڵگەی دواڕۆژە . وە مهرەبانی خودا لەوکەسەبێ کەووتویەتی:

ا ن لله عبـادا فـطنـا     طلقوا الدنيا وخافوا الفتنا
نظروا فيها فلما علموا     إ نـهـا ليســت لحي سكنا
جعلوها لجة وا تخذ وا     صالح الاعمـال فيهاسفنا

واتە: بەڕاستی لەو جیهانەدا چەندەها بەندەی زیرەك ولەخودا ترس هەیە کەلە دونیادا زۆر گەڕاوە، وە ترسی نەمان ولەناوچونیشی بووە کاتێك بۆی دەرکەوتووە و ژیانی ئەوجیهانەی بەتاقی کردۆتەوە کە کەس لە و جیهانەدا بەیەك جاری نامێنێتەوە دەکەوێتە ناو شەپۆلی بێ پایانی دەریاوە بەهیچ ڕزگاری نابێ تەنها کردەوە با شەکانی نەبێ بۆی دەبێتە کەشتی ورزگاری دەبێت.

زۆر بەندە هەیە زیرەك وبەڕێز دونیـا گەڕاوە بە تواناو بە هێز
لەگەڵ زیرەکیش لەبەلاَ ترساو زانی کە دونیای بۆ نابێ تەواو
هەرچی کەهەیە لەوسەردونیایە دەبێ کۆچ بکا بۆ دنیای دوایە
زانی کەکەشتی لەزەلکاو جێماو بێ کەشتی وبەلەم بۆی نابێ تەواو
دیاری وکردەوەی چاکە دەنێرێ تابەد نـاو نەبێ و بڵێن بەخێرێ

## ﴿ نیشانەی خۆشی ﴾

### (آيات الشفاء)

لە شێخ( ئەبی قاسمی قەشیری ﷺ) دەگێڕنەوە کوڕەکەی نەخۆشیەکی زۆر کوشندە تینی بۆ دێنێ شێخ دەفەرموێ: کەچاوم پێی کەوت لێی دڵنیا بووم کەدەمرێوناڕیات زۆر دڵتەنگ وناڕەحەت بووم لەبەر ناڕەحەتیم خەوم لێ کەوت لەخەوەکەم دا چاوم بەپێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوت سکالای دڵی خۆم لەلای پێغەمبەر کردو هاواری کوڕەکەم پێڕاگەیاند,پێغەمبەر(ﷺ) لەخەوەکەمدا پێی ووتم: ئەوەچی دەڵێی ئەی شێخ بۆچی تۆنیشانەی خۆشیت نەخوێندۆتەوە لەقورئانی پیرۆزدا شێخ دە فەرموێ: پێغەمبەرﷺ. ئەوەندەی ووت: بەخەبەر هاتم کەوتمە بیرکردنەوە لەکۆتای دا بۆم دەرکەوت خودای گەورە لە(٦) شەش جێگە دا نیشانەی خۆشی فەرمووە: منیش بەسەر کوڕەکەم دا خوێندەوە,تەواو ئارامی بەمن بەخشی وکوڕەکەشم چاك بۆوە، ئەوەش ئایەتەکانن :

ئایەتی یەکەم:خودای گەورە فەرمووی: ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾توبە/١٤.

واتە: ئەگەر بەگژ کافران دابچن و لەگەڵیاندا بجەنگن. ئەوا خودا بەدەستی ئێوە سزایان دەداو, ئێوەش بەسەر دەخات و,خۆشی وساخ وسەلامەتی دڵی ئەو موسڵمانانە دەدا کەبەدەستی ئەوان توشی ئازاربون.

ئایەتی دووەم: ﴿وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى﴾یونس/٥٧.

واتە:بێگومان ئەوقورئانە خۆشی وساغی دڵ ودەرونتانە چونکە لەنەخوشی ودەر دەسەری ڕزگارتان دەکاو شارەزاتان دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست وبەختەوەر .

ئایەتی سێیەم : ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ﴾النحل/٦٩.

واتە: ئەوەی لەزگی مێش هەنگوین دەردەچێت کەهەنگوینە بۆخواردن

و.چەند رەنگ وجۆری هەیە . ئومێدو هیوای ساغ بوون و چاك بوونەوەی زۆر لەنەخۆشییەکانی تێدایە بۆ ئادەمیزادەکان.

ئایەتی چوارەم: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً﴾الإسراء/٨٢

واتە:ڕەوانە دەکەین بۆسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی کە ساغییە و هۆی ڕزگاری وخۆشی و.ئاسایشە بۆ موسلمانان .

ئایەتی پێنجەم: ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾الشعراء/٨٠.

واتە: بێگومان پەروردگاری جیهان کەخودای گەورەیە هەر ئەوە ڕێ نیشان دەرو هۆی ڕزگاریمان لەتەنگ وچەڵەمەو لەکاتی نەخۆشی وساغیمان.

ئایەتی شەشەم: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء﴾ فصلت/٤٤.

واتە: بڵێ ئەی محمد بێ گومان ئەوقورئانە هۆی ڕێگەی شارەزایی و ڕاستە بۆ ئەوکەسانەی کەباوەڕ یان بەخوداو پێغەمبەری خودا هەیە. وە هەروەها هۆی ساغی وڕزگاری بوونە لەنەخۆشی بیرو باوەڕی نالەبارو چەوتو ناڕێکی ناودڵ .

## ﴿ شێوەی ژیری وکارامەیی لەئامۆژگاری تاوان باردا ﴾

## (اسلوب حکیم فی موعظة العاصی)

کابرایەك ڕۆیشتە لای (ابراهیمی ئەدهەمﷺ) ووتی: ئەی باوکی ئیسحاق بێ گومان من ستەمم لەگیانی خۆم کردوەو سەرگەردان ماوم داوای یارمەتیت لێدەکەم ئامۆژگاریم بکەی کەلەبەد بەختی و سەرگەردانیم ڕزگارم بکاو سەرزەنشتی گیانمیشی تێدابێت (ابراهیمی ئەدهەمﷺ) لەوەلام دا ووتی: پێنج ئامۆژگاریت لێ دەکەم ئەگەر پە یڕەویان لێ بکەی و توانات بە سەریدا هەبێت ئەوا بەهیچ جۆرێك توشی ناڕەوایی نابیت :

کابرا ووتی: ئەی باوکی اسحاق پێم بڵێ ئەوە چیە.؟ ابراهیم فەرمووی:

ئامۆژگاری یەکەم: هەرکاتێك ویستت نافەرمانی خودا بکەیت ئەوا خۆراکی خودا مەخۆ .؟ کابرا وتی: ئەی لەکوێ بخۆم .؟ ابراهیم فەرمووی: ئەی برا: ئەدی شتێکی جوانە تۆ ڕۆزی خودا بخۆی و نافەرمانیشی بکەی .؟

کابرا:وتی بێ گومان شتێکی زۆر ناشرینە نان بخۆی و نان دێن بدرێنی .

ئامۆژگاری دووەم: هەرکاتێك ویستت نافەرمانی خودا بکەی ئەوا هەوڵ بدە لەخاکەکەی دامەنیشە, کابرا وتی: ئەی لە کوێ دابنیشم خۆهەرچی هەیە هەمووی هەر خاوەنی خودایە ابراهیم فەرمووی: ئەی شتێکی جوانە تۆ نافەرمانی بکەی و ڕۆزی بخۆی و لە نیشتمانەکەشی دابنیشی.؟ کابرا وتی: بێگومان شتێکی ناشیرین وناڕەوایە .

ئامۆژگاری سێهەم : هەرکاتێك ویستت نافەرمانی خودا بکەی و ڕۆزی بخۆی و لەنیشتمانەکەشی دابنیشی هەوڵ بدە لەجێگەیەك نافەرمانی بکەی کەخودا نەت بینێ،کابرا وتی: ئەی ابراهیم چۆن شتی وادەبێت خۆ خودای گەورە ئاگاداری هەمووشتێکەو هیچی لێ وون نابێ,ابراهیم فەرمووی: ئەی شتێکی ڕەوایە تۆ ڕۆزی خودا بخۆی و لەنیشتمانی دابنیشی و لەبەرچاوی ئەویش نافەرمانی و تاوان بکەی: کابرا وتی. نەخێر ئەی ابراهیم بەڕاستی شتێکی ناڕە وایە.

ئامۆژگاری چوارەم : وتی هەرکاتێ گیان کێشی ئادەمیزاد هات گیانت بکێشێ تۆ بڵێ جارێ تۆ مۆڵەتم بدە تاك وپەشیمان دەبمەوە کردەوەی موسڵمانانە بەچاکی دەکەم .؟ کابرا وتی یاابراهیم ئەوقسەم لێ وەرناگرێت وگوێشم ناداتێ ابراهیم فەرمووی: باشە کەتۆ دەزانی ناتوانی گیان کێشی ئادەمیزاد لەخۆت لابدەی تاك وپەشیمان دەبیتەوەو کردەوەی چاکە بۆدوا ڕۆژت دەکەی, وەزۆر چاك دەزانی کەمردن گەیشتە سەرت بەهیچ شێوەیەك مۆڵەتت نادا چۆن هیوای ڕزگاریت هەیە لەدوا ڕۆژدا . کابرا وتی: بەڕاستی وایەو هیچ توانای مۆڵەتم نیە.

ئامۆژگاری پێنجەم : ووتی.:هەرکاتێ فریشتەی تۆڵە هاتن بۆلات بۆئەوەی بت بەن بۆ ناوئاگری دۆزەخ لەگەڵیان مەڕۆ, کابرا ووتی: بەخودا ئەی ابراهیم وازم لێ ناهێنن وبەقسەشم ناکەن، ابراهیم ووتی: ئەی چۆن هیوای ڕزگاریت هەیە کابرا ووتی: ئەی ابراهیم بەسمە بەس پەشیمانم لەهەموکردەوە یەکی ناڕەوا. بەو شێوەیە پەشیمان بۆوە،بەباوەڕێکی توندەوە وازی لەهەموو کردەوەیەکی نافەرمانی هێنا بەمەردانە یادی خودای دەکرد بەبیرو وباوەڕی چاکەوە وە لەتاوان وناڕەوا پارێزگاری دەکرد بەو جۆرە بەردەوام بوو هەتا کۆچی دوایی کرد.

## ﴿ دڵ مردن ﴾

## (موت القلب)

لە (شەقیقی بەڵخی)ەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی : جارێك (ابراهیمی ئەدهەم) لە شاری بەسرەدا دەگەڕا, کۆمەڵانی خەڵك کە چاویان پێ کەوت لێ ی کۆبونەوە ووتیان: ئەی ابراهیم خودا لە قورئان دا فەرموویەتی: (ادعونی استجب لکم).واتە: داوام لێ بکەن و لێم بپاڕێنەوە لێتان وەردەگرم و بەدە نگتانەوە دێم. بەلأم ئێمە هەمووکات نزاو پاڕانەوەمانە و لێمان وەرناگیرێ هۆی چیە ؟ ابراهیم لە وەلأم دا ووتی: ئەی کۆمەڵانی خەڵك چۆن نزا تان وەردەگیرێ دڵ و گیانتان لە هەشت شتدا مردووە هەروەها پشتتان لە هەشت شت کرد وە

یەکەم: خوداتان ناسیوە کەبەڕاستی بەتواناو پەروەردگارە بەلأم. فەرمانەکانی بەجێناهێنن .

دووەم: قورئان دەخوێنن بەلأم ڕەفتاری پێ ناکەن.

سێهەم: ئێوە دەڵێن پێغەمبەرمان خۆش دەوێ بەلأم. ڕێبازەکەیتان وازلێ هێناوە.

چوارەم:دەڵێن شەیتان دوژمن مانە بەڵام لەفەرمانی شەیتان دان واتە : بەگوێرەی ئەو ڕەفتار دەکەن.
پێنجەم: دەڵێن پێمان خۆشە بچینە بەهەشت. بەڵام کردەوەی چاکی بۆناکەن.
شەشەم:دەڵێن پێمان خۆشە لە دۆزەخ ڕزگارمانبێ بەڵام خۆتان دەهاونە ناوی.
حەوتەم: دەڵێن مردن ڕاست ودروستە بەڵام خۆتان بۆ ئامادە ناکەن.
هەشتەم:خۆتان بەکردەوەی خەراپی خەڵکی سەرگەردان کردووە بەڵام نارەواو تاوانی خۆتان لەبیرکردووە .
نۆیەم: مردوەکانتان دەنێژن بەڵام بایەخی پیٚ نادەن وپەندی لێوەر ناگرن.
دەیەم: بەهرەو خۆش خوانی خۆتان خواردووە. بەڵام سوپاسی لەسەرناکەن.

## ﴿ هەشت پرسیاری تیشك دەر ﴾

### ( ثمان مثائل مضيئة)

دەگێڕنەوە (شەقیقی بەڵخی ﷺ) جارێك بەحاتەمی ووت: ئەی حاتەم ماوەیەکی زۆرە تۆهاوسێیەتی منت کردوە لەو ماوەیەدا چی فێربووی؟
حاتەم لەوەڵام دا ووتی: هەشت شتی بەنرخ فێربووم :
یەکەم:کاتیٚ سەیری کۆمەڵانی خەڵکم کرد هەمووکەسێك دڵسۆزێکی هەیە لەو ژیانی دونیایەدا.بەڵام مەخابن کاتێك دڵسۆزە بەپەرۆشەکەی کۆچی دوایی کردوو بردیانە سەرگۆڕستان بەتەنیا بەجێی دەهێڵن و ماڵ ئاوایی لیٚ دەکەن لەبەر ئەوە منیش بڕیارم داوە کردەوەی جوان ورەوشتی پیاوانە بکەمە دڵسۆزو خۆشەویستی خۆم بۆ ئەوەی لەناو گۆڕو گۆڕستانیش دا هەر هاودەمم بیٚ و، بەتەنیا بەجێم نەهێڵیٚ.
دووەم:چاوم بە فەرمودەیەکی خوداکەوت دەفەرمویٚ : ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ

﴿وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى﴾النازعات/٤٠.واتە : ئارەزوتان لەهەوا بازی و تاوان بپارێزن .منیش بەفەرمانی ئەو فەرموودە هەوڵم دا کەئارەزوەکانم بمرێنم ولەشو ێنی ئەوان کردەوەی چاکەو خۆڕاگری و یادی خودا بەجێ بهێنم.

سێهەم:سەیری کۆمەڵانی خەڵکم کرد هەرکسێ شتێکی بەنرخی لەلا جوانەو خۆشی دەوێ وپارێزگاری دەکات منیش لەفەرموودەی قورئان داچاوم بەو ئایەتە کەوت دەفەرموێ :

﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ﴾النحل/٩٦.

واتە: ئەوەی لای ئێوەیە دەڕزێ و کۆتایی دێت بەڵام . ئەوەی لەلای خودایە بۆ ئێوە لەکردەوەی چاکەو یادی خودا ئەوە هەربەردەوامەو دەمێنێتەوە،بۆیە منیش هەرشتێکی باش وبەنرخ بکەوێتە دەستم لەڕێگای خوادا دەی بەخشم . بۆ ئەوەی لەلای خودا پارێزراوبێ بۆم .

چوارەم: کۆمەڵانی خەڵکم بۆدەرکەوت تەنها ئاواتیان سەروەت وسامان وپلەوپایەو ناونیشانە, بێ گومان ئەوانەش بۆ ڕۆژی دوایی هیچ کەڵکیان نیە,بەلاَم دوایی کە سەیری فەرموودەی خودام کرد دە فەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات/١٣

واتە: بەڕێزووگەورەتان لەلای خودا ئەوکەسە تانە کەیادی خوداو خۆپارێزی زیاتر بێت. منیش هەموو ئاواتێکم کردەوەی باش وخۆپارێزیە بۆ ئەوەی لەلای خودا بەڕێزبم .

پێنجەم:چاوم بەکۆمەڵانی خەڵك کەوت زۆر بە یان ئێرەیی وحەسادەت بەیەکترەوە دەبەن بەلاَم کەچاوم بە فەرموودەی خوداکەوت کەدەفەرموێ:﴿ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ﴾ الزخرف/٣٢

واتە: ئێمە ژیان و بەڕێوە چونی ژیانمان لەناو کۆمەڵانی خەڵك دابەش کردووە بەشێوەی لێهاتویان لەژیان دا .بۆیە منیش باوەڕی تەواوم بەخودا هێناو لەئێرەیی دوورکەوتمەوە.

شەشەم: کاتێ کۆمەڵانی خەڵکم بۆ دەرکەوت زۆربەیان خەریکی ناخۆشی وبەربەرە کانێن، لە دوایی دا چاوم بە فەرموودەی خودا کەوت دە فەرموێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوّاً﴾الاعراف/٢١

واتە: بەڕاستی شەیتان دووژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە. دەئێوەش بەدووژمنی خۆتانی بزانن. منیش بەو بۆنەوە لە دووژ منایەتی کۆمەڵانی خەڵك کەناریم گرت و دوور کەوتمەوە، تەنها شەیتانم کرد بەدووژمنی سەرەکی ڕاستەق ینەی خۆم .

حەوتەم: کاتێ بۆم دەرکەوت کۆمەڵانی خەڵك بۆ پەیدا کردنی ڕۆزی خۆیان سوكو بێ نرخ دەکەن بەڵام کە سەیری فەرموودەی قورئانم کرد دەفەرموێ : ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللّهِ رِزْقُهَا﴾هود/٦

واتە:هەرشتێك لەو خاك و زەویەدا هەیە بەتێکڕا هەمووی خۆراكو ڕۆزیان لەسەر خودایە، بۆیە منیش هەوڵم دا بەردەوام بم لەسەر ئەوشتەی لەسەرم پێویستە بۆ خۆدا بە ئەنجامی بکەیەنم وە ئەوەی لەسەر خودا پێویستە بۆمن وازی لێ بهێنم.

هەشتەم:کۆمەڵانی خەڵکم چاو پێکەوت کەزۆر بەیان باوەڕیان بەبازرگانیەکەیانو ئیش وکاریانوو تەندروستی گیانیانەوەیە.بەڵام ئەمن تەنها باوەڕوئاواتی هەرە بەرزوگەورەم بەخودای خاوەن دەسەڵاتە.

## ﴿ گەورەیی لەئیسلامدا بە دی دەکرێ﴾

## (العـزة بالأسلام)

زانای بەناو بانگ وخواپەراستی بەڕاستی (فەزیلی کوڕی عەیاز) لەپێشی گەڕانەوەی بۆلای خودا ڕێگرو دز بوو. شەوێك دەڕواتەماڵێك بۆ دزی،کاتێ بەسەرخانویەك دەکەوێ لە دوایی کە بەقادرمەکان دا دەڕواتە خوار بۆ حەوشەکە. گوێی لە دەنگی خاوەن ماڵەکە دەبێ ئەوئایەتەدەخوێنێ‌دەفەرموێ:
﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾الحديد/١٦

لەهەموو تاوان و ناڕەوایی یەك پەشیمان بۆوەو گەڕایەوە . واتە : ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوکەسانەی کە باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەرو بەدینی سەربەرزی اسلام هێناوە دڵیان لەترسی خوداو بۆ یادی خوداو پەیڕەوی قورئانی پیرۆز لێ بداو فەرمانی خودا بەجێ بهێنێ. (فەزیل) دەڵێ کە گوێم لەخوێندنی ئەو قورئان و ئایەتە گرت بێ گومان کارێکی زۆری کرد : وام هەست دەکرد کە قاچم لەسەرپێ پیلکەکاندا بەرزدەبۆوە بۆلای خودای گەورەو ڕێگای دەگرت وەدەی ووت. ئەی خودایە دەتکەم بەشاهید کاتی ئەوە هاتووە دڵم بەیادی تۆوە لێ بدات . ئای کەترسی تۆ لەدڵمدا چۆن ژیانی ژاکاندوم،بەڵێ ئەو پیاوە ئیش وکاری دزی و ڕێگری بوو ترس وبیمی لەدڵدانەبوو؟. بەهۆی ڕووناکی ونوری خودا وا ئەمڕۆ گەڕا یەوەو، بوو بەخودا پەرستێکی بەڕاستی و، زانایەکی لێهاتوو وەلە هەموو تاوان و ناڕەوایەك پەشیمان بۆوەو گەڕایەوە . ڕۆژێکیان دایکی بانگی (فەزیل) دەکات‌و ئەویش بەدەنگێکی بەرز وەڵام دەداتەوە دەڵێ: بەڵێ‌دایەگیان ئینجا لەجێگەیەکی چۆڵ بیردەکاتەوە .دەڵێ ئای لەمن چۆن تاوانێکم کردووە بەدەنگی بەرز وەڵامی دایکم داوەتەوە: بۆیە هەوڵ دەدات بەندەیەك دەکڕێ‌و ئازادی دەکات: لەتۆڵەی ئەوقسەیە .

# ﴿ ئارامگری پیاوچاکان﴾

## (صبر الصالحين)

یەکێك لەپیاوچاکان ئافرەتێکی بەدخوی بەدڕەوشت مارە دەکات و, دەیکاتە هاوسەری ژیانی وەهەرچی خۆشی و ڕووناکی ژیان هەیە لێی دەبێت بەشەوەزەنگ وتامی خۆشی لەبیر دەباتەوە. ڕۆژێك یەکێك لەهاوەڵەکانی پێی دەڵێ برۆ ژنەکەت بەرەلا(طلاق) بدەو ڕزگارت دەبێ لە دەستی، بۆچی خۆت بەو ئافرەتەوە گیرۆدە کردووە، پیاوە باشەکەش دەڵێ لەوە دەترسێم ئەگەر بەرەلای بکەم،یەکێکی تر مارەی بکات وپێیەوە گیرۆدە ببێت وژیانی بخاتە ناخۆشیەوە، وەخودا پارێزگاریم بکات کەمن ببم بە سەبەبوهۆ، بۆ ئازاردانی بەندەی خودا، لەدوای وتیان: ئەدی چارەت چیەو چی دەکەی .؟ لە دەستی ئەو ئافرەتە ؟

لە وەلاّم دا وتی: لەسەر ئازارەکانی ئارام دەگرم دڵی خۆم بە فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)دە دەمەوە کە دەفەرموێ:

( أيما رجل صبر علي سوء خلق زوجته أعطاه الله مثلما اعطى أيوب على بلائه، وايما إمرأة صبرت علي سوءخلق زوجها اعطاها الله مثلما اعطى آسية زوج فرعون)

واتە: هەر پیاوێك ئارام بگرێ لەسەر ناتەواوی ڕەوشتی ژنەکەی ئەوە خودای گەورە پاداشتی چاکەی پێ دەبەخشێ هەروەك وپاداشتی حەزرەتی ئەیوبی لەسەر ئارامی نەخۆشی دایەوە .وە هەر ئافرەتێکیش ئارام بگری لەسەر ناتەواوی مێردەکەی ئەوە خودای گەورە پاداشتی دەداتەوە هەروەكو پاداشتی ئاسیەی خێزانی فرعەونی دایەوە .

## ﴿ درود لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) خۆشی وشادی یە﴾

## (الصلاة علی النبی شفاء)

پێشەوای بەنرخ (ئەبو عبدالله ی بوسەیری) خاوەنی هۆنراوی بوردیە ئە فەرموێ: بەفرمانی خودا تووشی ئیفلیجی بووم، نیوەی گیانم لە جوڵە کەوت،پزیشکەکان سەرگەردان بوون لەچارە سەرکردنم،شەوێکیان بەدڵم داهات ووتم :من ئەو هەموو تاریفەی پێغەمبەر(ﷺ) م کردووە چۆن دەبێ بەهاوارمەوە نەیات پێش ئەوەی بنوم سەد سەلاْواتم لەگیانی پێغەمبەردا ﷺ. ومبە هۆنراوەی جوان, بەپێغەمبەرو دینی سەربەرزی اسلام وقورئانم هەڵگوت .

لە دوایی نوستم شەو بەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم داوای چاك بوونەوەم لێ کرد :دەستی پیرۆزی بەسەر گیانم داهێناو پەیمانی ساغ بوونەوەی پێدام . ئەمنیش لە خۆشیان بەخەبەر هاتم، زۆرچاك چاك ببومەوە وەك نەخۆش نەبووبم وا بوو, لە دوای ئەوە : (بردة المدیح) م دانا واتە: تاریف کراوێك کە هۆی رزگاری بوون بوو لەنەخۆشی وە بۆیەش ئەو ناوەم لێنا لەبەر پیرۆزی بردەی پێغەمبەر(ﷺ) کەلە خەوەکەم دا مژدەی رزگاری پێ بەخشیم .

## ﴿ گەورەیی درود لە سەرپێغەمبەر( ﷺ )﴾

## (فضل الاصلاة علی النبی صلی الله علیە وسلم)

زانای بەناوبانگ (عەبدالواحیدی کوری زەید) دەفەرموێ: ساڵێك رۆیشتم بۆ دیدەنی ماڵی بەیت بۆ بەجێ هێنانی پێویستی حەج, لە رۆیشتنەکەمدا کابرایەکم لەگەڵ دابوو بەهەرشوێنێك دا دەرۆیشتین ولەهەر شوێنێك بەرێ دەکەوتین گوێم لێ بوو ئەوکابرایە سەلاْواتی لەسەر پێغەمبەر دەدا(ﷺ)

منیش ووتم: ئەی برام هۆی نهێنی ئەو هەموو سەلاْواتانەت چیە .؟ بەردەوام

دەمت دەجولیٚ وراناوەستی،لەڕۆیشتن ولە دانیشتن دا .؟

کابرا لەوەلاٌم دا ووتی: ئەی عبدالواحد لەوسەلاٌوەت لێدانە شتێکی نهێنی هەیە . دەفەرموێ: منیش ووتم: ئەوشتە نهێنیەم پێ بلیٚ چیە بەبەر ڕەحمەتی خودا بکەوی .؟

کابراکە لەوەلاٌم دا ووتی : سالی ڕابردو لەگەلٌ باوکم ڕۆیشتین بۆ دیدەنی مالی خودا بۆ بەجێهێنانی پێویستی حەج بەلاٌم . واڕویدا باوکم لەڕێگا کۆچی دوایی کرد:باوکم دەم وچاوێکی سپی وگەشاوەی هەبوولەژیاندا, بەلاٌم کەگیانی تێدا نەما ڕەش وناشرین هەلٌگەڕا : منیش زۆر غەمبارو مەلول بووم، بەوخەم وداخەوە لە تەنیشتی لاشەکەی خەوم لیٚ کەوت کەدەم ووت : ئایا هۆی چی بوو ئەو ڕووە پاکە وارەش هەلٌگەڕا ؟!. لەخەوەکەمدا چاوم بەکابرایەکی دەم وچاو پاك و ڕووناك کەوت لەژیانمدا شتی وا جوانم نەدیبوو شەیدای بووم پێی ووتم: ئەی بەندەی خودا دەزانی من کێم .؟ من محمد پێغەمبەرﷺ نێرراوی خودام . ئەگەر بەخەبەر هاتی بڕۆ ئەوپەردەیەی لەسەر دەم وچاوی باوکتە لای بدە بیٚ گومان باوکت زۆر تاوان باری ونافەرمانی خودای کردوە بۆیە دەم وچاوی وا ڕەش هەلٌگەڕاوە بەلاٌم. باوکت درود و سەلاٌوەتی زۆری لەسەرمن داوە،وە ئەو درودانە لەلای خودای گەورە تکایان بۆ کردووە و,تکایەکەشیان وەرگیراوە .

کابرا دەلیٚ لە خۆشیان لەخەوەکەم بەخەبەر هاتم پەردەی سەردەم وچاویم لادا کە سەیرم کرد باوکم دەم وچاوی وەك وەمانگی شەوی چواردە دەدرەوشایەوە .

# ﴿ گەشت نامەی پیاو چاکان﴾

## (ا سفا ر الصالحین)

دەگێڕنەوە ساڵێك پێشەوا( ئەسمەعی ﷺ)دەچێت بۆ دیدەنی ماڵی بەیت بۆ بەجێ هێنانی پێویستی حەج لەڕێگادا توشی بەتوشی ڕێگرانەوە دەبیٚ و پیاوخراپێك بە شیری ڕوتەوە لێی ڕادەپەڕێ و دەڵێ چی دەکەی ئەی کابرا ئیشت چیە.؟ پێشەوا ئەسمەعیش زۆر بەئارام و چاونەترسیەوە خۆی ناشڵەژێنێ و دەڵێ:دەمەوێ منداڵەکانم فێری قورئان بکەم و بەفەرموودەی قورئانیش بەڕێگە دابڕۆن .

کابرای ڕێگر ووتی: ئەی برا ئایەتێك لەوقورئانەی کەمیچم لێ نەخوێندوتەوە بۆم بفەرموو. باگوێم لێ بێ. پێشەوا (ئەسمەعی)ش زۆر بە بلیمەت وپێگەیشتوانە کەئینسان سەری سوڕدەما دەستی بە خوێندنی سورەتی( الزاریات )کرد هەتا گەیشتە ئەو ئایەتە:

﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾الزاریات/٢٢.

واتە: بەناوی خودای گەورەو میهرەبان بێ گومان ئەوەی ئێوە داوای دەکەن لەپاداشت و لە ڕۆزی و هەرچی بەڵێنتان پێدراوە هەمووی لەئاسمانەوەیە . کاتێك ڕێگرەکە گوێی لەو فەرموودەیەبوو ووتی: توخودا بۆم دووبارە بکەوە پێشەوا ئەسمەعیش چەند جارێك ئەو ئایەتەی بۆ دووبارە کردەوە .

کابرای ڕێگر چاوی پڕ بوو لە ئاو فرمێسکی پەشیمانی بەچاوان دا هاتە خوارو شیروزرێ و ڕمبی فڕێداو ڕووی خەجاڵەت وپەشیمانی کردەخوداو ووتی:پاك وبێ لەکەیی بۆ ئەو خودایەیە کەبۆتە دەستەبەری خۆراکمان لەئاسمانەوە کەچی لەگەڵ ئەوەش دا نافەرمانی دەکەین!

سوێند بەخودای گەورە لەمڕۆ بەدواوە ڕێگری نەکەم هەتا لەژیان دام لەسەر دەستی تۆ پەشیمانم لەوڕۆژە نافەرمانی خودا نەکەم. لەدوای ئەوە پێشەوا

ئەسمەعی دەفەرموێ: ئەوجار ئەمن ڕێگەی ماڵی خودام گرتە بەرو کابرام لەو ڕێگایە بەجێ هێشت .

پێشەوا( ئەسمەعی) دەفەرموێ: شەوێك بەدەوری ماڵی بەیتدا دەگەڕام تەوافم دەکرد گوێم لەدەنگێك بوو وەکو ئافرەتی کۆس کەوتو دەینالاند دەنگی هاواری دوونیای بەکوڵەوەگرتبوودەگریاودەی ووت:ئەی خودای گەورەومیهرەبان لەدەرگای میهرەبانیت ڕاوەستاوم بم بەخشەو بێ بەشم مەکە،کەپێشەوا لێی نزیك دەبێتەوە سەیری دەکات ئەو کابرا ڕێگرەیە کە لەڕێگا توشی هات بوو وابە سوزو مل کەچییەوە دەناڵێنی و پەشیمانی خۆی لە دەرگای فراوانی خودا داوا دەکات لەوێش ووتی:

ئەی پێشەوا ئایەتێکی کەشم بۆ بخوێنەوە باگوێم لە لەفەرمانی خودای میهرەبان بێت. پێشەواش ئەو ئایەتەی بۆ دەخوێنێتەوە کە خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ﴾ الذاريات/ ٢٣.

واتە:سوێند بەپەروەردگاری ئاسمان وزەوی هەرچی بەڵینتان پێ دەدرێ هەمووی حەق وڕاستە . هەروەك و دەنگی خۆتان گوێ لێ دەبێ . ئەو جا کابرا بەبێ هۆشی کەوتە سەر زەوی و هاواری دەکردو دەی ووت: ئەی هاوار کێیە ئەو کەسەی کە خودا قینی لێ هەستا بێ بە شێوەیەك سوێندی بۆ بخوات .؟

## ﴿ پارێزگاری کردن لە کۆڕی باس کردنی پاشە ملە ﴾

## (إياكم ومجالس الغيبة)

یەکێك لەپیاوچاکان دەفەرموێ:شەوێکی نوستبوم لەخەوەکەمدا چاوم بەپارچە گۆشتێکی بۆگەنی ڕزیو کەوت بۆیان هێنامە پێشم، گوێم لەدەنگێك بوو پێیان ووتم: فەرموو ئەو گۆشتە بخۆ .؟ منیش ووتم: خۆ تاوانێکی وام نەکردووە کەپێویست بکات بۆ خواردنی ئەو گۆشتە بۆگەنە.خێرا وەلأمیان دامەوەو پێیان ووتم :چۆن تۆ پێویست نیت بە خواردنی! لەبیرت چوو لەپاشەملە باسی برا موسڵمانەکەت دەکرد بۆ خۆی ئاگادار نەبوو پیاوە چاکەکە ووتی نەخێر شتی وا نەبووە .پێی یان ووت: ئەدی لەلای کۆمەڵێك دانەنیشتبووی لە پاشەملە باسی خەڵکیان دەکرد تۆش گوێت ڕاگرتبوو . بۆیە تۆش وە ك ئەوان بە شداری تاوانی .

## ﴿ بەهەشت لەژێر پێ ی دایکاندایە ﴾

## (الجنة تحت اقدام الأمهات)

دەگێڕنەوە پیاوێکی چاك دایکێکی هەبوو تەنها بۆ خۆی خزمەتی دەکرد کەس یارمەتی نەدەدا بۆخزمەت کردن کاتێك ئەو پیاوە کۆچی دوایی کردو گیانی بە خاك سپارد خودای گەورە زۆر قینی لێ هەستا بوو فریشتەکانی خودا ووتیان: ئەی پەروەردگار ئەوکابرایە زۆر ڕێزی لەدایکی ناوەو خزمەتی چاکی کردووە خودای پەروەردگار بە فریشتەکانی ووت: ئێوە نازانن چی شتێك لە نێوانی من و ئەو کابرایە دایە.ئەو کابرایە هەرچەند جارێ کەخواردنی بۆدایکی دەبردو یارمەتی دەدا داوای لەمن دەکردو دەی ووت: ئەی پەروەردگار گیانی بکێشەو لەدەستی ڕزگارم بکە بۆیە منیش لێ ی بەقینم .

## ﴿ئافرەتانی موسڵمان و باوەڕداران﴾

## (مسلما ت مؤمنا ت)

بەڕێز (نەفیسە خاتوون) کەلە نەوەی پێشەوا (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب) بوو ماوەیەك لەپێش مردنی دا گۆڕێکی بۆخۆی هەڵکەندو زۆربەی کاتی لەوێدا بەقورئان خوێندن دەبردە سەر (١٤٥) سەدو چل وپێنج جار لەناو ئەوگۆڕە دا خەتمی قورئانی تێدا کردووە. ئەو ئافرەتە موسڵمانە بەزمانی بەڕۆژ ولەمانگی ڕەمەزاندا نەخۆش کەوت پزیشك هاتە لای و ئامۆژگاری کرد کەڕۆژوەکەی بشکێنێ بەڵام (نەفیسە خاتوون) بە ووتەیەکی شیرین ولەسەر خۆ ووتی: ئەو پزیشکەم لێ دوور بخەنەوە لێم گەڕێن بالەگەڵ خۆشەویشتم دابم . بەو شێوەیە ئەو ئافرەتە موسڵمانە لەسەر جێگای مردن ڕاکشابوو هەر قورئانی دەخوێند کەگەیشتە ئەو ئایەتە کەخودا دەفەرموێ:

﴿لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾الانعام/ ١٢٧

واتە: بۆ ئەو موسڵمانانە بەهەشت (دارالسلام) خانوی ئاسایش وخۆشی لە لای خودای خۆیانەوە بەدەست کەوتووە. وە خوداش سەرداروویارمەتی دەریانە بەهۆی ئەوکردەوانەوە کەکردویانە لەڕەفتاری چاك .گیانی لەجولە کەوت و بۆ بەهەشتی پان و بەرین بەرێ کەوت کۆتای ژیانی بەبۆن و بەرامەی خۆشی بوو.

# ﴿ ئافرەتی بەڕۆژو ﴾

## ( المرأة الصائمة )

پێشەوا (عەبدالله ی واستیﷺ) دەفەرموێ: ڕۆژێکیان چومە مزگەوتی بیت الحرام چاوم بەئافرەتێك کەوت قورئانی دەخوێند زۆر بەجوانی و ڕێکی، منیش ووتم: سەلامی خوات لەسەربێ ئەی جارییەی خودا، ئەویش لەوەلاّم دا ووتی: ﴿ سَـــــــلامٌ قَوْلا مِنْ رَبٍّ رَحِيـــــمٍ ﴾یس/٣٦.

واتە:ئەوانەی دەچنە بەهەشت لەلایەن خودای پەروەردگارو میهرە –بانەوە سەلامیان لێ دەکرێ بۆ ڕێز لێ نانیان, پێم ووت: ناوت چیە ئەی جارییەی خودا .؟ لەوەلاّمدا ووتی:﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ ﴾مریم/١٩

واتە: لەقورئاندا باسی مریەمەی کچی عمران بکە،ئافرەتەکە ناوی مەریەمە بووە ووتم: چۆن بوو هاتویە ئێرە .؟ لەوەلاّمدا ووتی:

﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ال عمران/٩٧.

واتە: بۆ خودا هەیە لەسەر هەموو ئادەمیزادێکی پێ گەیشتو کەتوانای ڕۆیشتنی ئەو ڕێگایەی هەبێ بەماڵ وبەگیان بچێ دیدەنی ئەو ماڵە بکات بۆ حەج لەتەمەنی دا یەك جار ووتم: ئەی جارییە ی خودا شوت کردووە .؟ لەوەلاّمدا ووتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾المائدە/١٠١.

واتە:ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە بەدینی اسلام پرسیار مەکەن لە پێغەمبەر (ﷺ) لەهێندێك شت ئەگەر ڕاستیەکەی بەدەر بکەوێ بۆتان توشی هیلاکیتان بکاو ناڕەحت بن ووتم : منداڵت هەیە .؟ لەوەلاّم دا ووتی :﴿وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ ﴾الشوری/ ٤٩.

واتە: خودای گەورە چی خواستی لەسەربێ دروستی دەکات، نەوەی نێرینە دەبەخشێ بەهێندێ کەس .

ووتم: ناوی منداڵەکانت چیە .؟ لەوەلاّم دا ووتی: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَــى ﴾

مریم/٥١.واتە: لە قورئاندا دا باسی موسی ی کوڕی عمران بکە

﴿ يَادَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ ﴾ص/ ٢٦.

واتە: ئەی داود ئێمە تۆمان کردە جێگە نشینی پێغەمبەرانی پێشو لەسەر زەوی بۆ گەیاندنی فەرمانی خودا.

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ﴾مریم/ ٤١.واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆباسی ابراهیمی خەلیل بکە لەقوڕئان دا ووتم: دە تەویٚ سواری حوشترەکەم بی .؟ لەوەلآم دا ووتی:﴿ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِهِ عَلِيماً﴾ النساء/١٢٧

واتە: ئەگەر کردەوەی چاکە بکەیت بیٚ گومان خودا ئاگادارەو چاکەش وون نابێت. کاتیٚ ویستی سواری حوشترەکە ببیٚ ووتی:

﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾النور/٣٠.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بەموسڵمانەکان بفەرموو: چاوی خۆیان لەبارە شتێکی ناڕەوا بپارێزن. کاتیٚ کە سوار بوو ووتی:

﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾الزخرف/١٣.

واتە:پاکی وبیٚ لەکەیی بۆ ئەو خودایەیە کەئەو ئاژەڵانەی بۆئێمە ڕام کردووە . ئێمە بەبیٚ یارمەتی خودا نەمان دەتوانی ڕامیان بکەین . کاتیٚ ویستی دابەزیٚ ووتی:

﴿وَقُلْ رَبِّ أَنزِلْنِي مُنْزَلا مُبَارَكًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾المؤمنون /٢٩.

واتە: داوابکە لەخودای بلیٚ خودایە دام بەزێنە لەو کەشتیە بۆشوێنێکی بەقەدرو پیرۆز بیٚ گومان تۆ خودایەکی میهرەبان تری لەهەموو ئەوانەی کە یەکێك دابەزێنن لە شوێنێکدا. کاتیٚ گەیشتنە جیٚ ووتم: خواردنت بۆ بهێنم .؟ لەوەلآم دا ووتی:

﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَانِ صَوْمًا﴾مریم/ ٢٦.واتە:من پێویستم کردەوە لەسەر خۆم بەڕۆژو بوون و نەخواردن بۆخودای خۆم کەزۆر میهرە بانە

کاتێك ڕۆژ ئاوا بوو منداڵەکانی هاتن پیٚ ی ووتن :

﴿ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ﴾الكهف/ ١٩.

واتە: یەکێك تان بنێرن نەختێك پارە لەگەڵ خۆی بەرێ و سەیر بکات کام کەس لەخواردنی شارەکە پاکترو خۆشترو هەرزان ترە خواردەمەنیمان بۆ بهێنێ بەڵام بازۆر بەنەرموو لەسەرەخۆیی قسە بکا لەگەڵ فرۆشیارەکان کاتێ لەسەر سفرەی ڕۆژوشکان دانیشت کۆتایی بە خوێندنی قورئان هێنا لەدوای ماوەیەك غەم و پەژارە دای گرت پێم ووت :بۆچی وا پەژارە دای گرتی ئەی جارییەی خودا لەوەڵام دا ووتی: ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ﴾ق/ ١٩.

واتە:لە دونیا ژیانت کۆتایی هات بێ گومان سەختی مردن دێتە سەر ئینسان بەبێ دوو دڵی لەدوای ئەوەی گیانی دەرچوو نوێژمان لەسەر کردو شاردمانەوە لەخەومدا چاوم پێی کەوت پێم ووت:چۆن گەیشتیە جێگەی خۆت و خودای گەورە چی لە گەڵ کردی لێ پرسینە وەت چۆن بوو؟ لە وەڵام دا ووتی: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ{٥٤} فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ{٥٥}﴾القمر/٥٤-٥٥.واتە:بێ گومان ئەوانەی یادی خودادەکەن وخۆپارێزن لەناو باخ و باخاتی بەهەشت دان لەجێگە دانشتنێکی وا خۆش کەجێگەی ڕەزامەندی خودای بەخشندە و میهرەبانە .

## ﴿ شەو هاوەڵی پیاو چاکانە﴾

## (الليل جليس الصالحين)

دەگێڕنەوە یەکێك لەپیاوچاکان ژنێکی هەبوو هەرچەند جارێك ئەوپیاوە لەخەو هەڵدەستا ژنەکەی دەدیت وا خەریکی یادی خودایە. شەوێك پێی ووت: ئافرەت وەرە تۆزێك بنوو پشویەك بدە .؟ ژ نەکە لە وەڵام دا ووتی: ئەی گەورەم چۆن دەتوانم بنووم لە کاتێك دا دەزانم خۆشەویستەکەم بەخەبەرەو نەنوستووە.لەدوایی دا پیاوەکە گوێی لە دەنگی ئافرەتەکە بوو بە دەنگەوە

نزای دەکردو دەی ووت:

يا حبيب القلوب انت الحبيب انت أنسى وانـت مـني قـريب
ياطبيبا بـــــطبه يتداوى كـل ذى سقـم فنعم الطبيـب
طلعت شمس من احب بليل واستنارت فمـا تـلاها غـروب
ان شمس النـهار تغرب بالليل وشموس القلوب ليست تغيـب
واذا ماالليل اسبل ســـترا فـــالى ربها تحـل القـــلوب

واتـە: ئـەی خۆشەویـستی دڵ وگیـان بەڕاسـتی تـۆ خۆشەویـستی وە تـۆ هـاودەمی شـەومی زۆرم لێ نزیکـی ئـەو پزیـشکەی بەزانـستی خـۆی نەخۆشـان دەرمان دەکا بۆ هەموو دەردێك ئەتۆ چاکترین پزیشکی. وا بەدەرکەوت و هـەڵات ڕۆژی ئـەو کەسـەی کـەخودا خۆشـی دەوێ واتـە: بەشـەو ڕۆژ هەڵاتـەو دونیـا ڕووناك دەبێت, لەدوای هەڵاتنی ڕۆژێ تـاریکی نایات وەبێ گومـان ڕۆژی ڕۆژێ بەشەو ئاوا دەبێ،بەڵام ڕۆژی دڵ بە هیچ کاتێك ئاوا بوونی بۆنیە, وە ئەوکاتـەی کەشـەو پـەردەی تـاریکی بەسـەردا دێ ئـەو کاتـە بـۆلای خـودا دەگەڕێتـەوەو شادمان و بەختەوەر دەبێ. منیش بەوجۆرەکردمە هەڵبەست :

ئـەی دڵـەی  پڕجـۆش و خۆشـی ئـەی هیواکـەی پـڕ دڵـم
تـــۆ هیـــوامی تـــۆ لــــەلامی زۆرنزیکـــی وەك دڵـــم
هـەر ئـەتۆ توانـاو بـەهێزی چارەسـازی گـشت نـەخۆش
گـشت دەمـێ شـادی دەهێنـی بـۆ دڵانـی پـڕ بـەهۆش
گەرچـی خــۆری ڕۆژی ڕۆژێ دێــت و زو ئــاوا دەبـێ
تیشکی نـوری زاتـی بـەرزت هـەر دەمـێ گـەش تـر دەبـێ

## ﴿ دراوسێی پیاو چاکان﴾

(جوار الصالحين)

یەکێك لە پیاوچاکان لەخەوداچاوی بەبرایەکی مردوی دەکەوێ بەشێوەو ڕەوشتێکی زۆر دزێ و ناشرین پرسیاری لێ دەکا بۆچی ئاوات دەبینم ؟ ئەویش لەوەلأمی دا دەڵێ: برام بەڕاستی زۆر پەر یێشانم خودای گەورە لێم تورەیەو قینی لێم هاتۆتە جۆش .لەدوای چەند ڕۆژێکی تر دووبارە هەمان پیاوچاك لە خەودا چاوی بە برایەکەی دەکەوێتەوە, بەلأم ئەمجارە بەشێوەیەکی زۆر ڕووناك‌و جوان, دووبارە پرسیاری لێدەکاتەوە برام ئێستا چۆنی .؟ ئەویش لە وەلأمدا دەڵێ: برام لەو ڕۆژانە پیاوچاکێك لەوگۆڕستانەدا شارایەوە خودای گەورە بەهۆی بەرەکەت و پیرۆزی ئەو پیاوە چاکە لەچل کەسی مردوی ئەو گۆڕستانە خۆش بوو بەخشینی منیش یەکێك بوو لەو چل کەسە .

## ﴿ د راوسیٚ﴾

(الجوار)

جارێکیان پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا کرد(ﷺ) ئەی نێردراوی بەڕاستی . ئایا دراوسێی مردوی باش کەڵکی هەیە بۆ مردوەکانی تر .؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا دراوسێی چاك‌وباش بەزیندویی کەڵکی هە یە.؟ ووتیان: بەڵێ دراوسێی باش لەدونیادا کەڵکی زۆرە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر بەو شێوەیە بەمردویش لەگۆڕستاندا کەڵکی هەیە .

# ﴿ئاخ وپەشیمانی﴾

(حسرة)

ڕۆژێك پیاو چاكێك بەڕێگادا دەڕۆیشت چاوی بەكابرایەك كەوت گۆشتی دەبرژاند . كابرای پیاوچاك دەستی كرد بەگریان . كابرای گۆشت برژێن ووتی: بۆچی دەگریەی .؟ئارەزوت لە گۆشتیە!.كابرای پیاوچاك ووتی: نەخێر ئارەزوم لەگۆشت نیە. دووبارە كابرای گۆشت برژێن ووتی: ئەدی بۆچی دەگریەی كابرای پیاوچاك ووتی: من لەبەر ئەوە دەگریەم ئادەمیزاد ئاژەڵ بەمردوویی لەسەر ئاگردا دەنێن و دەی كوڵێنن . بەڵام ئادەمیزاد لەڕۆژی دوایی دا بەزیندویی دەی خەنە سەر ئاگرو دە برژێ .!

# ﴿مەیل وئارەزومەكەن بۆلای ئەوانەی ستەم كارن﴾

(ولا تركنوا إلى الذين ظلموا)

جارێك كابرایەك هاتە لای (حەسەنی بەسری رضي الله عنه) پێی ووت: من بەرگ درووم بەرگی پیاوە گەورە دەسەلات دارە ستەمكارەكان دەدوورم خودای گەورەش لە قوئاندا فەرموویەتی:﴿ وَلاَ تَرْكَنُواْ إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾هود/ ١١٣.

واتە: بەدڵ ئارەزو مەكەن بۆلای ئینسانی ستەمكار دەنا ئاگری ستەمكاری ئەوان دەتان گرێتەوە ئینجا ئایا من لەوكەسانەم كەیارمەتی ستەمكار دەدەن، یان.نا (حەسەنی بەسری رضي الله عنه) لەوەلآمدا ووتی: ئەوەی دەزو دەرزیەكەت پێ دەفرۆشێ یارمەتی ستەمكار دەدات .بەڵام تۆبۆخۆت كە بەرگیان بۆ دەدووری وەك و ئەوان ستەمكاری .

# ﴿ زانایانی دڵسۆز﴾

## (علماء مخلصون )

زانای بەناو بانگ‌وخودا ناسی بەڕاستی( سالمی کوڕی عبداللهﷺ) ڕۆژێك بە دەوری بەیتدا دەگەڕا لەپڕێکدا چاوی بە لێپرسراوی موسڵمانان (هشامی کوڕی عبدالملكﷺ) خەلیفەی دەوڵەتی ئەمەوی دەکەوێ هشام دەڵێ ئەی سالم هەرچیت دەوێ لە دونیا داوام لێ بکە پێت دەبەخشم .؟

سالم لەوەڵام دا دەڵێ: هوشام ئەمن شەرم دەکەم لەناو ماڵی بەیت دا بێجگە لەخودا داوا لەکەسی تر بکەم بۆ شت وماڵی دونیا . لەدوای تەواو کردنی گەڕان بەدەوری ماڵی بەیتدا. ڕۆیشتینە دەرێ لە مزگەوتی حەرام : دووبارە هوشام بەسالمی ووت: ئەی سالم لەناو ماڵی بەیت دا شەرمت کرد بێجگە لە خودا لەکەسی تر داوای شت بکەی، بەڵام ئێستا کە هاتوینە دەرێ لە ژووری بەیت چیت ئارەزو لێ یە داوام لێ بکە, زانای بەناوبانگ ووتی : باشە ئەی هوشام ئارەزوت لێ یە چیت داوا لێ بکەم لەبارەو پایەی ئەم جیهانە بێت، یان جیهانی دوا ڕۆژ .؟

هوشامیش ووتی: لەپایەو باری ئەو جیهانەم داوا لێ بکە . چونکە بێ گومان من خاوەنی هیچ نیم لەپایەی دوا ڕۆژ : سالم لە وەڵامی دا ووتی: من پێم ووتی شەرم دەکەم داوای پایەی ئەم جیهانە لەخودا بکەم کەخاوەنی تێکرایی هەرئەوە .ئینجا چۆن داوای پایەی ئەو جیهانە لەتۆدەکەم کەخاوەنی هیچ نیت !.

## ﴿ ئامۆژگارییەکی بە نرخ ﴾

### (نصيحة قيمة)

جارێك خواناسی بەڕاستی(حەسەنی بەسری)ڕۆیشتەلای سەر کردەی موسڵمانان (عومەری کوڕی عبدالعزیز) سەرکردە عومەر ووتی:ئەی تەقیەدین ئامۆژگاریەکم بکە .؟ (حەسەنی بەسری)ش پێ ی ووت: لەبارەی دونیا بە ڕۆژوبە واتە : زۆر بەخەم پلە و پایەی ئەو جیهانەوە مەبە .

وە لەبارەی مردن ڕۆژو شکێن بە واتە: هەموو کات لە یادت بێ و لێی بێ ئاگامەبە وە تێشو ئامادە بکە لە شەوێك دا کە بەیانیەکەی ڕۆژی دواییە واتە: ئێستا تێشوی دوا ڕۆژت ئامادە بکە .

## ﴿ زانایانی تێکۆشەروخەبات کا ر ﴾

### (علماء مجاهدون)

ڕۆژێك زانای خودا ناس (ئەبا حەسەن ئەحمەدی کوڕی سینان) ڕۆیشتە لای داد پرسی میسر( ئەحمەدی کوڕی تولون) پێی ووت: ئەی کوڕی تولون لەخودا بترسەو یادی بکە .؟

ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لەلای دانیشتبون زۆر سەر سام بوون لەقسەکەی ئەبا حەسەن کەچۆن توانی بەرەو رووی داد پرس ئەوقسە یە بکات !. داد پرسیش کوڕی تولون زۆر ڕقی هەستاو توڕە بوو دەمارەکانی گرژ بوون لە دوای ماوەیەك بە پاسەوانە کانی ووت: بڕۆن بەپاسەوانی شێرەکە بڵێن:(کەشێرێکی بەهێزو دڕندەیەکی ترسێنەریان هەبوو وەك و جەلاد بۆتێك شکانو خواردنی ئەو تاوان بارانەی کەبۆخۆیان حەزیان پێنەدەکرد) هەتا سێ ڕۆژ هیچ خواردنێکی نەدەنێ بۆ ئەوەی ئەوەندە برسی بێ هەرشتێك دارو بەردیش بچێتە لای پەلاماری بداو

بیخواو بیری لێ نەکاتەوە . وەلە دوای سێ ڕۆژەکە ئەو ئەبا حەسەن ئەحمەدی بۆ فرێ بدەنە ژورەوە بابیکات بە خۆراکی برسیەتی . بەوجۆرە فەرمانی داد پرسیان بەجێ هێنا. زانای بەناوبانگیان لەسەر قسەیەکی ڕاست وئامۆژگاری بەنرخ، لە دوای سێ ڕۆژ برسی کردنی شێرەکە فڕێیان دایە لای ودەرگاو پەنجەرەی ژورەکەیان داخست لەدوای تێپەڕینی ڕۆژێك پاسەوانەکە ویستی ڕاپۆرتی بەسەرهاتی (ئەباحەسەن) بۆ پادشا بنێری کە فەرمانەکە یان بەجێ هێناوەو تەنها چەند خوێن وئیسکە شکاوێك نەبێت هیچی تری نەماوە بۆ ئەو مەبەستە ڕۆیشت دەرگەی ژوری شێرەکەی کردەوە بەڵام . ئەوەی کەبیری لێ نەدەکرایەوەو بەرچاوی کەوت سەیری کرد (ئەباحەسەن ئەحمەد) سەری لە کڕنۆش دایەو دەڵێ پاك وبێ لەکەیی بۆ خودای گەورەو بە توانایە . شێرەکەش لەبەرامبەری ڕاوەستاوەو پاسەوانی لێ دەکاو بەهیچ جۆرێك شاڵاوی خەراپەی بۆنەبردووەو .سەری بۆخودای گەورە ڕادەوەشێنێ و بەزوبانی دڵ لەبەر خودا دەپارێتەوە، کاتێ پاسەوانەکە چاوی بەو ڕوداوە کەوت کە چاوەڕوانی نەدەکرا هەر خێرا ڕاپۆرتێکی لەو بارەوە بۆ پادشا نارد پادشاش ووتی: بڕۆن ئەو زانایەم بۆ بهێنن زانایان بۆلای پادشا بانگ کرد ئەویش زۆر بەسەر بەرزی وچاو نەترسیە وە ڕۆیشتە لای پاشا.پادشالێی پرسی ئەی ئەباحەسەن چۆنی .؟

ئەبا حەسەن ئەحمەد ووتی: سوپاس بۆخودا زۆر باشم وەك دەم بینی پادشا ووتی: هۆشت چۆن بۆ ئەو کاتەی شێرەکەیان کردە لات .؟ ئەبا حەسەن ئەحمەد ووتی: زۆر باش بووم ئەو ئایەتەم دەخوێندەوە کەخودا دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ الطور/ ٤٨ .

واتە: تۆ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لەسەر فەرمانی خودای خۆت ئارامت هەبێ وەخۆت ڕابگرە کەبڕیاری خودا ئێستا وایە ئەو بێ باوەڕانە مۆڵەت بدا, وە بەڕاستی تۆش لەچاو دێری خۆمان دای .

پادشا ووتی: بۆ دە ترسای ئەوکاتەی شێرەکەت لەلابوو زاناکە ووتی: من

لەوە دەترسام شێرەکە بەلیك وچەپەڵەکەی خوێم لێ بدات و جلەکانم پیس بکات و نەتوانم نوێژەکانم بکەم ئینجا لە دوای ئەوە پادشا سوپاسی ئەبا حەسەن ئەحمەدی کردو لێ ی خۆش بوو ئامۆژگاری یەکەی وەرگرت وبەرەڵای کرد.

# ﴿هەڵوێستی زانایان﴾

## (مواقف علماء)

دەگێڕنەوە سەرکردەی موسڵمانان (هارون ڕەشید) خەلیفەی سەردەمی عەباسی ڕۆژێك نوێژی عەسر دوادەخات پێشەوا ئەبو یوسفیش بەپەرداخێك ئاوەوە دەچێتە لای هارون لەدوای سەلام وبەخێرهاتن پێشەوائەبویوسف دەڵێ: ئەی سەرکردەی موسڵمانان ئەگەر وا دابنێین ئەودەوڵەتەی تێیدا دەژین دەریاو ڕوبارەکانی هەمووی ووشك بووەو ئاوی تێدانەماوە، تینوایەتی تینی زۆری بۆ هێنای ئاوت بەدەست نەدەکەوت, منیش نیو پەرداخ ئاوم بۆ هێنای بیخۆیەوە چیم دەدەیە .؟ هارونە ڕەشید ووتی: بەو نیو پەرداخە نیوەی فەرمان ڕەوای دەسەڵاتوسامانمت پێ دەبەخشم، دووبارە پێشەوا ئەبویوسف ووتی:ئەگەر ئاوەکەت خواردەوە لەناو گیانت دا مایەوەو نەهاتەدەر تووشی ئازارێکی زۆر بەتینی کردی پزیشك هاتە لات ووتی: من دەتوانم ئەو ئاوە لەگیانت دا بکەمە دەر تۆ چی دەدەیە .؟

هارونە ڕەشید ووتی: نیوەی ئەو دەسەڵاتوسامانەی کەماوەمە پێی دەبەخشم . ئەمجار ئەبویوسف ووتی: ئەی هارون خودای گەورە بەبێ کرێ ئاوت پێدەبەخشێ وە بەبێ کرێ ئاوەکە لەگیانت دەردەکا لەگەڵ ئەوەشدا تۆ فەرمانەکانی بەجێ ناهێنی و نوێژی عەسر بەدرەنگ و دوا دەخەی .!

## ﴿ سامان دەڕواو نامێنێت
## بەڵام سامانی خودا هەربەردەوام دەبێت ﴾

(الملك يزول وملك الله لايزول)

کاتێ (هارونە ڕەشیدﷺ) خەلیفەی دەوڵەتی عەباسی بەرەو تەمەن درێژیو کۆتایی ژیانی دەڕۆیشت فەرمانی دەرکرد گۆڕێکم بۆ هەڵکەنن .! لە دوایی دا وتی: بم بەن بۆدیدەنی گۆڕەکەم کەچاوی بەگۆڕەکەی کەوت دەستی کرد بەگریان دوایی وتی: ئەی ئەو کەسەی کەسامان ودەوڵەتت بەردەوام هەیەو تەفرو تونا نابیت . مهرەبانی لەگەڵ ئەوکەسەدا بکە کەسەروەت وسامانی لەدەست دەچێ و تەفروتونا دەبێت .

## ﴿ نە زانین ڕاستی لە سەرخاوەنی دەدات﴾

(الجهل يشهد على صاحبه)

سەرکردەی موسڵمانان (هارونە ڕشیدﷺ) لەگەڵ زانای بەناوبانگ (ئەبایوسفﷺ) لە ڕۆیشتنی دیدەنی ماڵی بەیت دەبن بەهاوەڵ کاتێ دەگەنە جێ, پێشەوا یوسف لەنوێژێکی چوار ڕکاتی دا دەست بۆ هارون ڕادەکێشێ و دەڵێ فەرموو : هارون بۆ پێش نوێژی پێشکەوە هارونە ڕەشیدیش پێش دەکەوێ ودوورکات نوێژ دەکات و سەلام دەداتەوە .

لە دوای سەلام دانەوە ئەبویوسف دەڵێ : ئەی دانیشتوانی مەکە ئێوە نوێژەکەتان تەواو بکەن چونکە سەرکردەی موسڵمانان . ڕێبوارە نوێژ بە کورتی دەکات . کابرایەك لە دا نیشتوانی مەکە لەناو نوێژەکەی دا هاتە گوفتارو وتی: ئەی ئەبایوسف ئێمە لەتۆ باشتر دەزانین. وەلەوەش باشتردەزانین کە فێریان کردوی، دووبارە: ئەبایوسف لەوەڵام دا وتی: ئەگەر لە ئێمەت باشتر بزانیبایە لە نوێژەکەت دا قسەت نەدەکرد !.

## ﴿ خانەی خودا﴾

(بيت الله)

جارێك ڕووداوێكی ناخۆش لەنێوان (هارونە ڕەشید ) و خێزانەكەی دا ڕووی دا هارونە ڕەشید سوێندی بە تەڵاق خوارد ووتی: نابێ ئەو شەو لەو نشتمانەی كەمن فەرمانی بەسەردا دەكەم ڕۆژ بكەیەوە؟. وەجێگەی فەرمان ڕەوای ئەویش لەڕۆژ هەڵاتی سنوری سینەوە, هەتا ڕۆژ ئاوای سنوری پاریس بوو. وە ئەوكاتەش هیچ شتێكی هۆی گواستنەوەی خێرا نەبوو وەك و ئێستا خێزانەكەی نەی دەتوانی ئەو نیشتمانە چۆن بەجێ بێڵێ،بۆیە بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشەیە زۆربەی زۆری زانایانی كۆكردەوە یەكێك لەوزانایانە(ئەبایوسف) بوو لەدوای ئەوەی كەزاناكانیان تێ گەیاند بۆچی مەبەستیك كۆبونەوە, لەدوای كێشەیەكی زۆر(ئەبایوسف )ووتی: ئەی سەركردەی موسڵمانان دەتوانین سوێندەكەت پوچ بكەینەوە تەڵاقت نەكەوێت هارونە ڕەشید ووتی: چۆن دەتوانی وە بەچی ڕێگایەك .؟

ئەبایوسف ووتی: ئەمشەوخێزانەكەت لەمزگەوت دا ڕۆژبكاتەوە مزگەوتیش خانەی خودایەو بەنیشتمانی تۆ ناژمێردرێ هەروەك و خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴾الجن/ ١٨.

واتە: بێ گومان مزگەوت خانەی خودایەوهەردەبێ خوداپەرستیان تێدا بكرێ و قسەو گفتو گۆیان تێدا مەكەن وەلەگەڵ پەرستنی خودادا كەسی تری تێدا مەپەرستن وهاواری لێ مەكەن بەو شێوەیە خێزانی سەركردەی موسڵمانان هارونە ڕەشید لەمزگەوت دا ئەو شەوەی بەڕۆژ كردەوەو كێشەی نێوان ژن ومێرد كۆتای پێ هات وسوێندەكەشی لێ نەكەوت .

## ﴿خۆپاریزی زانایان﴾
### (ورع العلماء)

زانای لەخوداترس( تاوس) کاری نوسەری بوو لەلای خەلیفەی عەباسی ڕۆژێك جەعفەر دەڵێ ئەی تاوس ئەو مەرەکەبەم بدەیە باشتێك بنوسم تاوسی نوسەریش لەوەلاّم دا دەڵێ: ئەی جەعفەر بۆخۆت هەڵی بگرەوبنوسە؟

ئەبوجەعفەر دەڵێ ئەی تاوس بۆچی تۆ نام دەیە دەست .؟

تاوسیش لەوەلاّم دا دەڵێ:لەوە دەترسم شتێك بنوسی ستەم لەبەندەکانی خودا بکرێ وەبەوهۆیەوە منیش ببم بەهاوبەشی تۆ،لەسزای ئەوشتە لەڕۆژی دوایی دا .

## ﴿ با نگ هێشتن لەنێوان ووتە و کردار﴾
### (الدعـوة بين القول والعمل)

جارێك پێشەوا( سری سەقەتی) بەیەکێك لەقوتابیەکانی ووت: بەناوی (ئەبول قاسم جونەید) ئەی جونەید بڕۆ مزگەوت ئامۆژگاری خەڵك بکە ؟.جونەیدی قوتابی ووتی: مامۆستا زۆر چاك دەتوانم ئامۆژگاری خەڵك بکەم بەلاّم. بەڕاستی لەسێ ئایەتی فەرموودەی خودا زۆر دەترسم بۆیە ناتوانم!. مامۆستا ووتی: ڕۆڵەم .ئەوسێ ئایەتەچین .؟ ووتی: ئایەتی یەکەم :دەفەرمێ:﴿ أَتَـأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ البقره/ ٤٤.

واتە:خودای گەورە سەرکۆنەی ئەوسەروك‌وزانایانە دەکات کەفەرمان بەخەڵك دەکەن بۆ چاکەو خۆشیان لە بیردەچێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوزانایانە زۆر چاك شارەزای دینی سەربەرزی ئیسلام‌وڕەوشتی پێغەمبەری خودان واتە: خـودا دەفـەرموێ: ئەگـەر ئێـوە بەڕاسـتی فەرمانـەکانی خوداتـان

وەرگرتووەوئامۆژگاری خەڵکی پێ دەکەن دەبۆخۆشتان کاری پێ بکەن ئایا هێشتا تێ نەگەیوون.

ئایەتی دووەم:خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ﴾هود/ ٨٨.

وا تە: من نامەوێ کەنا فەرمانیوپێچەوانەی ئێوەبجولێمەوە بۆ شتێك کەبەرگری ئێوەی لێدەکەم واتە: بەئێوە بڵێم ئەوشتە مەکەن خەراپەو بۆخۆشم خۆی لێ نەپارێزم:

ئایەتی سێهەم: دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ * كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾الصف/ ٢ -٣

واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەباوەڕتان هێناوە بۆچی ئەوەی بەدەم دەیڵێن بەکردار بەجێی ناهێنن واتە: قسەوکردارتان لەیەك جیاوازە ئەی نازانن ئەوەش نیشانەی تورە بوون وغەزەبی خودایە.! شتێك بەدەم بڵێن وبەکردار نەیکەن لەدوای ئەوە ماموستا بێ دەنگ بوو جونەیدی قوتابیش ڕۆیشتەوە جێگەی خۆی ولێ ی نوست لەخەوی دا چاوی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوت دەی فەرموو: ئەی جونەید بۆچی ئامۆژگاری خەڵك ناکەی هەستە بڕو بۆمزگەوت وئامۆژگاری خەڵکی بکە, جونەیدیش بە فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵ خۆش بوو هەر خێرا لەخەو ڕاپەڕیو بوڵای ماموستای کەوتەڕێ بەلأم.بێ گومان ماموستاو قوتابی دڵیان لەلای یەك بووە واتە : دڵێك ودوو لاشەیان بووە. بۆیە هەر خێرا ماموستا هاتە قسەو ووتی:ئەی جونەید بەڕاستی شتێکی سەیرە تۆ بەفەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێ ئامۆژگاری خەڵك ناکەیت بەو جۆرە جونەید ڕۆیشت بۆ مزگەوت وبڵاوی کردەوە لەناو خەڵکەکەدا ئەمرۆ ئامۆژگاریتان دەکەم ئاگاداربن لەدوای ئەوەی کەکۆمەڵانی خەڵك کۆبونەوە کابرایەکی بەدڵ بێ باوەڕو,بەجل وبەرگێکی زانا،هاتە مزگەوت لەناو کۆڕەکەدا دانیشت بۆئەوەی نەهێڵێ جونەید ئامۆژگاری خەڵکی بکا دەستی کرد بە

پرسیار کردن ووتی: ئەی جونەید پێم خۆشە ئەو فەرموودەی پێغەمبەرم (ﷺ) بۆشی بکەیەوە کەدەفەرموێ:(اتق فراسة المؤمن فاءنه ينظر بنور الله)

واتە: خۆت لەزیرەکی موسڵمان بپارێزە چونکە بە ڕووناکی خودا شت دەبینێ کۆمەڵانی خەڵکیش هەمووی گوێیان ڕاگرتبوو جونەید چۆن وەڵامی ئەوکابرایە دەداتەوە، وەلەناو دانیشتوانیش دا هەستی بەوە نەکردبوو ئەوەی پرسیارەکەی کردووە بەدڵ بێ باوەڕەو کافرە بەڵام خودای گەورە خستیە دڵی جونەیدەوە ئەوەی کەپرسیاری لێ کردووی بێ باوەڕو کافرە بۆیە جونەید لەوەڵام دا ووتی: ئەی برا ماناوشی کردنەوەی ئەوفەرموودە ئەوەیە ئەتۆ کافرو بێ باوەڕی هاتوی من بێزار بکەی کابرای بە پەنهان بێ باوەڕو، بەئاشکرا موسڵمان،خێرا بەدەنگی بەرزەوە ووتی :(اشهد ان لااله الا الله. واشهد ان محمدا رسول الله) بەو جۆرە بەزیرەکی ولێهاتوی جونەید . ئەو بێ باوەڕە باوەڕی هێنا و موسڵمان بوو.

## ﴿ بێ گومان خانوی من ناسوتێ﴾

## (إن داري مااحترقت)

جارێك كابرایەك بەتاڵوكەوهەڵەداوان هاتەلای(ئەبودەرداء ﷺ) ووتی: ئەی(ئەبادەرداءﷺ)خێرا بگە بەخانوەكەت وادەسوتێ (ئەبودەرداءﷺ) لەوەڵام دا ووتی: نەخێر خانوی من ناسوتێ چونكە لە پێغەمبەرم بیستووە دە فەرموێ هەركەسێك ئەو فەرموودانە بەبڕوایەكی پاك بەیانی وئێوارە بخوێنێ ئەوە نەبۆخۆیونەخانە وادەیو، نەسەروەتو سامانی، توشی هیچ خەراپەیەك نابێت وەئەو فەرمودانەشم ئەم ڕۆ وتووە بۆیە باوەڕم وایە خانوەكەم ناسوتێ لەدوای ئەوە (ئەبودەرداءﷺ ) بەدانیشتوانی ووت: وەرن لەگەڵم بابڕۆین، هەموویان هەستان وبەرەو خانوەكەی كەوتنەڕێ كەسەیریان كرد خانوەكانی دەوروبەری هەموویان سوتابون تەنها خانوەكەی (ئەبودەرداءﷺ) نەبێ

بەساغی مابۆوە توشی هیچ نەهاتبوو ئەوەش فەرموودەکەی پێغەمبەرە دە فەرموێ:

( اللهم انت ربي لااله الا انت عليك توكلت وانت رب العرش العظيم ماشاء الله كان ومالم يشأء لم يكن لاحول ولا قوة الا باالله العلي العظيم,اعلم ان الله على كل شيء قدير, وان الله قد احاط بكل شيء علما, اللهم اني اعوذ بك من شر نفسي ومن شر كل دابة انت اخذ بناصيتها ان ربي على صراط مستقيم)

واتە: ئەی خودایە تۆ پەروەردگاری منی هیچ خودایەك نیە پێو یستی پەرستن بێ تۆ نەبیت وەپشتم بەتۆ بەستووە بێ گومان تۆش خاوەنی تەختی بەرینی وەهەر شتێك تۆ ئارەزو بکەیت دەبێت, هەرچیەکیش تۆ ئارەزو نەکەی بەهیچ جۆرێك نابێت ونەبووە وە هیچ هێزو توانایەك نیە تەنها بەپشتیوانی تۆوە نەبێت ئەی خوای گەورەو بەرێز. وە دەزانم توانای تۆ بەسەر هەموو شتێکەوە وەزانست و زانیاری تۆ هەموو دونیای داگرتووە خودایە خۆم دەپارێزم لەتاوان وخراپەی گیانم وە هەروەها خۆم دەپارێزم بەتۆ لەزەرەرو زیانی هەموو جانەوەرێك کە جڵەویان بەدەستی تۆیە وەیارەبی خودایە لەسەر ڕێگەی ڕاست و دینی پیرۆزی اسلام شارە زام بکەی .

## ﴿ میهرەبانی خودا بۆبەندەکانی﴾

## (رحمة الله لعباده)

دەگێڕنەوە زانایەکی خودا ناس دراوسێ یەکی زۆر خەراپی دەبێت کاتێك دراوسێ یەکەی دەمرێ دەچن بۆلای زانایەکە, کەبچێت نوێژ لەسەر ئەو تەرمە بکات بەڵام زانای خوداناس ووتی: لەبەر ئەوەی کەزۆر ئازاری داوم نوێژی لەسەر ناکەم بۆیە داوایان لەزانایەکی ترکرد نوێژی لەسەر کرد شەوێك زانای لە خودا ترس لەخەویدا چاوی بە دراوسێیەکەی کەوت لەناو باخی بەهەشت دا

یاری دەکرد لەخەوەکەیدا لێ ی پرسی حاڵت چۆنە !.خودا چی لەگەڵ کردی .؟ کابراش ووتی: کاتێ تۆ نوێژت لەسەر نەکردم ترسێکی زۆر گەورەم لێ نیشت کە خودای گەورە سزام دەدات بەڵام کاتێك لەبەر دەستی بەتوانای خودا ڕاگیرام خودای گەورە پێی فەرمووم: ئەی بەندەی من ئەو بەندە زانایەم چی لەگەڵ کرد ؟ منیش ووتم: ئەی پەروەردگارم تۆ لەهەموو کەسێك ئاگاردارتری لە دوایی داخودای گەورە فەرمووی :ئەی بەندەی من زۆر چاك بزانە ئەو بەندەیەم کەتۆی لەدەرگای خۆی دەرکرد بەڵام دەرگای من دەرکراوان وەردە گریێ و تاوان باران دەبەخشیێ و دەیان بەنە بەهەشت والێت خۆش بووم وئازادم کردی .

## ﴿ گەورەیی وکەساسی﴾

## (عـزة وزل)

چەند کەسێك لە کۆمەڵانی خەڵك پرسیاریان لەزانایەکی موسڵمان کرد هۆی چیە!. دینی سەربەرزی ئیسلام فەرمانی داوە هەرکەسێك دەستی یەکێکی بێ تاوان بـبڕێ دەبـێ خوێنەکـەی (٥٠٠)پێـنج سـەد دینـاری زێـڕ بـدات بـەکابرای دەست براو: وەلە هەمان کاتیش دا ئەگەر یەکێك شتێکی بەنرخی چوار یەکی دینارێك بدزێ دەبێ دەستی ببڕدرێ ئەو (٥٠٠)پێنج سەد دینار زێرە مانای چیەو ئەو دەست بڕینەش بۆچی .؟

زاناکـەش لـەوەڵام دا ووتـی: بـێ گومـان یاسـای بەرنامـەی ئیـسلام وەهایـە هەردەستێك ڕاسـت وپـاك بێـت ئـەوە ئـەو دەسـتە زۆر بـەنرخ وپـیرۆزەو خـوێنی دەوێت بەڵام. ئەودەستەی کەناپاکی وخیانەتی پێ دەکرێ ئەوە زۆر بێ نرخە و بەچرۆکی سەیری دەکرێ ودەبێ فڕێ بدرێ لە دوایی ئەو هۆنراوەی خوێندەوە

يد بخمس مئة مسجد وديت مابالها قطعت في ربـــع دينار.؟
عز الأمانة اغلاها وارخصها ذ ل الخيانة فافهم حكمة الباري

واتـە: دەسـتێك نرخـی بڕینەکـەی(٥٠٠) پێـنج سـەد دینـاری زێـڕ بێـت بۆچـی لـەپێناوی چواریەکی دینارێـك دا دەبڕدرێـت : بـێ گومـان دەسـتێك ڕاسـت وپـاك بێت، ئەوەزۆر بەڕێزو بەنرخە :دەبێ زۆر ڕێزی لێبگیردرێ : بـەلآم ئـەو دەسـتەی کـەناپاکی و خیانـەتی پـێ دەکـرێ سـوك و چـروك وبـێ نرخـە, دەبـێ بـبڕدرێو نەمێنێ, ئینجا زۆر چاك لە ووتاری ڕاستی بکەن . بەوشێوە کردم بەهەڵبەست :

پرسـياريان کـردو ووتيـان ياسـای ئيـسلام بـۆ وايـە
گـــەر يـــەکێ دەستـــی بـبڕێ نرخـی دەوێ سـەرمايە
لـەولاش خـۆی دە سـتی دەبـڕێ بـەبێ نـرخ وبـێ پـارە
چـۆن دەبـــێ ياسـا وابـێ هـيچ تـێ ناگـەين لـەوکارە
ياسـا خـۆی دێتـە وەلآم دەڵـێ :دەسـتی ڕاسـت وپـاك
لەسـەر گشتمان پێـو يـستە خزمـە تـی بکـەين زۆر چـاك
بــــەلآم دە ستـــی درۆزن کـەناپاکـــی پـــێ بکـــرێ
لـەســـەر چـواريەکەی دينــار دەبـــێ نـــەمێنی وبـبڕێ

## ﴿ گەورەیی پەروەردگار ﴾

### (عظمة الخالق)

جارێـك کابرايــەك لەگــەڵ خێزانەکــەی (لەبــەريتانيا)وە دەڕۆن بــۆ( يەمــەن) لەيەمەن دەڕۆنە لای زانايەکی موسڵمان. ژنەکە پرسيار لەزانايەکە دەکاودەڵێ: ئەگـەر وەلآمـم بدەيـەوە بـاوەڕ بـەخودا دەهێـنم .؟ زانـا موسـڵمانەکەش دەڵـێ :پرسـيارەکەت بکـە ژنەکـە دەڵـێ پـێم بڵـێ درێـژی وپـانی ئەوخودايـەی دەی پەرستن چەندە .؟

زانايەکە لە وەلآمی دا دەڵێ :باشە تۆ مێردەکەت خۆش دەوێ .؟

ژنەکەی دەڵێ: بەڵێ زۆرم خۆش دەوێ . دووبارە زاناکە لێی دەپرسێ باشە

ئەوخۆشەوستیەی تۆومێردەکەت چەندکیلو مەتردەبێت.؟ژنەکە دەڵێ ئایا خۆشە ویستی چۆن بەکیلۆ مەتر دەپێورێ زاناکەش دەفەرموێ: باشە خۆشەویستی یەکێکە لەدروست کراوانی خودا کە نەیەتە ژێر پێوانەی ئادەمیزاد چۆن تۆ دەتەوێ ئەوخودایەی کەلە هەموو شتێك بەرزو گەورە ترە بێتە ژێر پێوانەی ئادەمیزاد بەڕاستی نەگونجاوە : خودا فەرمووی:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾الشورى/ ١١.

واتە: خودا هیچ شتێك وێنەی ناكات ئەو خودایەی کەبیسەرو بینایە, لەدوای ئەوە ئافرەت وپیاوە بەریتانیەکە بەیەك دەنگ وتیان:( لااله الاالله محمد رسول الله) هەردووکیان باوەڕیان هێنا و موسڵمان بوون .

## ﴿ بە هە شت خانوی باوەڕدارە ﴾

## (الجنة بيت المؤمن)

کاتێك پێشەوای بەرێز (محمد عبدەﷺ) ڕۆیشت بۆ کۆشکی فەرمان ڕەوای (خدێوی عەباس) (بەتریارك)ی گاورو یەکێك لەگەورە ناودارانی جولەکە لەوێ بوو، خدێوی وتی: بەڕاستی زۆر جوان ڕ ێك کەوتوە ئەوە نوێنەری گاوران لە لامە .وە ئەوەش نوێنەری جولەکانە، ئەتۆش ئەی پێشەوا نوێنەری موسڵمانانی ئێستا لێتانم دەوێ بۆم ڕوون بکەنەوە کامەتان دەچنە بەهەشت، بە تریارك وتی: بانوێنەری جولەکان قسەبکات،وە(حاخام)یش نوێنەری جولەکان وتی:با پێشەوای موسڵمانان قسەبکات (خدێوی )وتی : ئەی پێشەوای موسڵمانان قسە بکە، پێشەوا فەرمووی: بێ گومان ئەگەر بڵێین جولەکە دەچنە بەهەشت ئەوا ئێمەش دەچینە بەهەشت چونکە باوەڕمان بە حەزرەتی موسا (موسى) پێغەمبەر هێناوە. وە ئەگەر بڵێین گاور دەچنە بەهەشت دووبارە ئێمە دەچینە بەهەشت چونکە باوەڕمان بەحەزرەتی عیسا پێغەمبەریش هێناوە.

وەئەگەر بڵێن ئێمە موسڵمانین دەچینە بەهەشت ئەوا جولەکەو گاور ناچنە بەهەشت چونکە باوەڕیان بە حەزرەتی محمد(ﷺ) نەهێناوە.

## ﴿ چاووڕاو لەڕاستی و ڕێنەدان بەستەم﴾

## (دعابة فی ا لحق ومنع للظلم)

جارێکیان (عودەی کوڕی ئەرتە ئەت‌ﷺ) دەچێتە لای (شوڕەیح)ی لە کوڕی دادگەری دا،( شورەیح )وتی: ئەوە ئێستا لەچی شوێنێکی خودا چاکت بۆ بکات، عودەی وتی: لەنێوانی من‌وتۆدا دیوارێك هەیە، عودەی وتی: ئەی داد پرس گوێم لێ بگرە، شورەیح وتی: گوێم لێ یە بیڵێ عودەی وتی: من پیاوێکی خەڵکی شامم، شورەیح وتی: جێگەیەکی بەپیت و خۆشە عودەی وتی: ژنم لای ئێوە هێناوە .شورەیح وتی: بە خۆشی ومنداڵی باشەوە بێت. عودەی وتی :کوڕێکم هەیە.شوڕەیح وتی:خودا بیکات بە سوار چاك, عودەی وتی:بیرم وایە لەلای خێزانەکەم بڕۆم شوڕەیح وتی: پیاو پێویستە لای خێزانەکەی بێت،عودەی وتی:بەڵێنم داوەخانوەکەم بۆخێزانەکەم بێ,شوڕەیح وتی:بەڵێ دەبێتە خاوەنی, عودەی وتی:دادگەریمان لەنیواندابکە,شورەیح وتی:واکردم عودەی وتی: بۆکامەمان بوو واتە: بەلای کاممان داهات شوڕەیح وتی: بۆ کوڕی دایکت بوو:

عودەی وتی: بەڕاست گوێی کێ وات کرد .

شوڕەیح وتی: بەڕاست گوێی (شاهیدی) کوڕی خوشکی پورت :

واتە:عودەی بۆ خۆی بڕیاری لە سەر خۆی دا . داد پرسیش بە گوێرەی بڕیارەکەی فەرمانی داد گەریەکەی دەرکرد.

## ﴿ پێ داویستی ودڵ فراوانی﴾

### (حاجة وسخاء)

(ئەبوحەسـەنی غـالی) دانەیـەك لـەكتێبی (جمهـرەی) دانـراوی (ابـن دریـدی )لـەلادەبێت زۆر خۆشـی دەوێ‌و كـەڵكی لێـوەر دەگرێ بـەلأم .هـەژاری‌و نـەبونی وای بەسـەردێنی كـە ئـەو كتێبـە بفرۆشـێ كابرایـەك بـەناوی( شـەریف موڕتـەزا) بەشەست دینار لێی دەكڕێ !.كاتێك (شـەریف موڕتـەزا) كتێبەكە لێـك دەكاتـەوە بـۆ خوێندنـەوە سـەیردەكا بەدەسـت خـەتی فرۆشـیارەكە (ئـەبی حەسـەنی غـالی) چەند هەڵبەستێكی تێدا نوسراوە كە دەڵێ:

انست بهاعشرين حولا وبعتها لقد طال وجـدي بعدها و حنين

وما كان ظني أنني سـأبيعها ولو خلدتني في السجون ديوني

ولكن لضعف وافتـقار وصبية صغار علـيهم تستهل شؤنني

فقلت ولم أملك سوابق عبرتي مقالة مكوى الـفؤاد حـزين

وقد تخرج الحاجات يام مالك كـرائم مـن رب بهـن ضنين

واتـە:مـاوەی بیـست سـاڵ هـاودەمم بـوو كەچـی فرۆشـتم . زۆر هـەوڵم داوە هـاوارم كـرد ئـەو كتێبە نەفرۆشم وە بە هـیچ جۆرێكیش بیرم وانـە بـوو كـەدەی فرۆشم ئەگەر چی لە ژێر بەندوسجنی قەرزان دا بڕزێم .

بـەلأم دەردی هـەژاری ناچاری كـردم,وەلەبەرمنـداڵی بچوكم كـە پێویـست بـوو شێوە ی خۆشی ژیانیان بەڕێوەبەرم فرۆشتم, دوایی بەنەفسی خۆم ووت: خـەم مـەخۆ مـن لـە پـێش دا خـاوەنی هـیچ نـەبووم بـە ئاگاهاتـەوە وە دڵـم زۆر بەكەساسـی پێـچراوە تەوە،ئـەی دایكـی مالـك بەڕاسـتی مـن پێویـستیم بـەهیچ شـتێك نـەماوە چـونكە خـودای گـەورە ئەوەنـدە نیعمـەت‌و میهرەبـانی بەسـەردا

## دۆستی باوەڕداران

ڕشتومو پێی بەخشیوم لە هەموو پێویستیەك بێ نیاز بووم وچومە دەرێ ئینجا بەهۆی ئەو بەخشیشانە هیچ دڵ تەنگیم نەماوە. بەوشێوەیە کردمە هەڵبەست:

بیست ساڵ بێ هیوا هیوام هەر ئەوبوو
زۆرم کـــۆشش کـرد لەدەسـتم دەرچـوو
هـیچ بـیرم نـــە بـوو کـــەدەی فـرۆشـــم
گـــەرچـــی تـــاڵاوو ژە قنـــە بنۆشـــم
بـــەڵام چـــی دەکـــەی لەدەســـت هـــەژاری
لـــەگەڵ منـــد ڵ وبـــێ ئـیش وکـــاری
نـــاچاریان کـردم دڵ مـا تـوو حـــەزین
بـــۆ ژیـــان فـــرۆشتم بـــەدڵی غـــەمگین
دوایـــی دڵـــی خـــۆم بـــــەوە دایـــەوە
پـێـــشدا هـــیچ نـــەبوم دڵ پێـــچرایەوە
کـــــردەوەو کـــاری هـــەردوك دونیامـــان
بـــە دەســـتی خوایـــە بـــۆ بم پەرێـشان

ئینجا لەدوای خوێندنەوەی ئەو هەڵبەستانە شەریف مورتەزا زۆر بەبڕوایەکی بەهێزەوە بە پەرۆشێکی پڕ بەدڵ کتێبەکەی هێنایەوە بۆ ئەبی حەسەنی غالیو داوای لێ بوردنی لێ کردو پارەکەشی لێ وەرنەگرتەوە.

## ﴿ ئافرەت ئامۆژگاری زانا دەکات﴾

(إمرأة تعظ عالما)

(قاسمی کوڕی محمد) دەگێڕێتەوە دەڵێ خێزانێکم هەبوو زۆرم خۆش دەویست. کاتێك کۆچی دوایی کرد (محمدی کوڕی کەعب) ی قەرەزی بۆسەرە خۆشی هاتە لام بەسەر هاتێکی بۆگێڕامەوە ووتی: لەناو بەنی ئیسرائیلیان دا کابرایەکی زانای خوداپەرستی تێ کۆشەر هەبوو، ژنێکی هەبوو زۆری خۆش دەویست ژنەکەی کۆچی دوایی کرد, ئەو زانایە زۆر نارەحەت وکەساس کەوت بە جۆرێك لە ژیان بێزار بوو دڵی بەهیچ دانە دەکەوت . ڕۆیشتە ژورێکەوە دەرگای لەسەر خۆی پێوە داو ڕێگەی کەسی نەدەدا بچێت بۆلای: ئافرەتێك هەر لەبەنی ئیسرائیلیان ئەو خەبەرەی پێ گەیشت هات بۆلای زانایەکەو لە دەرگاوە بانگی لێ کرد ووتی: من دەمەوێ چاوم پێت بکەوێ ئیشی تایبەتی خۆم هەیەو نامەوێ کەس ئیشم بۆ بەجێ بهێنێ خۆم نەبێ بەهەرشێوەیەك بوو کابرای زانای ڕازی کردو ڕۆیشتە ژورەوە بۆلای ووتی: ئەی برام دەمەوێ ڕای خۆتم لەشتێك دا بۆ دەربڕی بزانم ڕای تۆ چیە .؟ کابرای زانا ووتی: خوشکم چیت هەیە بڵێ.؟

ئافرەتەکە ووتی: من ماوەیەك زێرم لەئافرەتێك بەدەست پاکی(امانە) لێ وەرگرت بۆ لەبەرکردن و خۆڕازاندنەوە لە دوای ماوەیەکی زۆر داوای لێ کردمەوە بیدەمەوە, بەڵام من حەزناکەم بیدەمەوە،ئایا بیری تۆ چۆنە هەر لەلای خۆم بیت،یان بۆی بنێرمەوە کابرای زاناووتی: خوشکم زۆرباش پێویستە کەبیدەیەوە دەنادەبیتە فێڵبازو خەیانەت کار ئینجا ڕامەوەستەوبۆی بەرەوە :

ئەمجار ئافرەتەکە ووتی: ئەی بە بەر میهرەبانی خودا کەویت چۆن تۆ دڵ تەنگ دەبی لەسەر شتێك کە خودا بەدەست پاکی پێی بەخشیوی بۆ ماوەیك کەدوایی بۆی بگەڕێنیەوە.کەبۆخۆی لێ ی وەرگرتویەوە: بێ گومان ئەوە زۆر پێویست ترە بۆ تۆ کەبیری لێ کەیەوە: ئینجا سەیرکەو پەندی لێ وەرگرە،بەو شێوەیە کابرای زانا بەقسەکانی ئەو ئافرەتە زۆر شادمان بوو خەمو ئازاری بەلاوەنا .

## ﴿ کردەوەی دروستی خودا ﴾
### (حكمة الله)

ڕۆژێك کابرایەك لەگەڵ ژنەکەی دانیشتبوو نانیان دەخوارد لەو کاتەدا لە دەرگایان دا کاتێ ژنەکە چوو دەرگای کردەوە هەژارێك ڕاوەستاوەو داوای یارمەتی دەکات کابراکەش مریشکێکی سورەوە کراوی لەبەردەم دا داندرا بوو, ئافرەتەکە بەمێر دەکەی ووت: بائەو مریشکە بەخێر بدەینە ئەو هەژارە :بەڵام کابرا ووتی: ئافرەت بڕۆ ئەو هەژارە لەبەر دەرگا دەرکە و بابڕوا چاوی دەریێ .؟ بەو شێوەیە هەژاری بێ چارە بەدڵی شکاوەوە دەڕوات ڕۆژان دێت و تێ دەپەڕێ ئەوکابرایە سەروەتی نامێنێ و هەژار دەبێت بە جۆرێك هەژاری ڕووی تێدەکات ژنەکەی بەڕەڵا دەکات واتە: تەڵاقی دەدا .

ئافرەتەکەش بەشێوەی یاسای ئیسلام لە دوای تەواو بوونی ماوەی عدەی شەرعی شوی بەکابرایەکی کە دەکاتەوە, ڕۆژێك بەهەمان شێوە لە گەڵ مێردی دووەمی دانیشتبوو خواردنیان دەخوارد مریشکێکی سورەوە کراوەیان لەبەر دەم دابوو . لەوکاتەدا لەدەرگایاندا کەسەیریان کرد هەژارێکەو داوای یارمەتی دەکات کابراش خێرا مریشکەکەی دایە ژنەکەی ووتی: بڕۆ بۆ ئەو هەژارەی بەرە ئافرەتەکەش ڕۆیشت ودایە دەستی هەژارەکەو گەڕایەوە لای مێردەکەی و دەگریا! مێردەکەی پێی ووت: ئافرەت بۆچی دەگریەی .؟ لەبەر مریشکەکە دەگریەی کە کردوومانەتە خێر ژنەکە ووتی: نەخێر بۆیە ناگریەم بەڵکو بۆ شتێکی زۆر سەیر, سەرسامی کردووم, کەچەرخی ڕۆزگار هەڵی دەسووڕێنێ بۆت ڕون بکەمەوە بزانە ئەو هەژارە کێ بوو.؟ ئەوە مێردی یەکەمم بوو ئێستا دەروزەی دەکات کابراش ووتی: ئافرەت ئەی نازانی منیش کێم ؟!. منیش هەژارەکەی یەکەم: جارم کەهاتمە بەر دەرگاتان دەروزەم دەکرد .!!

## ﴿ سێ بە سێ ﴾

(ثلاثة بثلاثة)

حەزرەتی (خدر) سەلامی خودای لەسەربێ بەحەزرەتی (موسای) فەرموو:ئەی موسا بەڕاستی من سەرم لەتۆ سوڕماوە تۆ سەر زەنشتی منت کرد کەکەشتیەکەم کون کرد لەوە ترسای کە نقوم بێن بەلاَم: نازانم تۆ خۆت لە بیرچۆوە کەخودای گەورە لە نقوم بوون ڕزگاری کردی ئەوکاتەی دایکت لەناو سندوقێکەوە فڕێی دایە ناو دەریاوە.؟ وەئەی موسی: تۆ سەرزە نشتت کردم لەسەر ئەوەی بەندەیەکم بەبێ تاوان کوشت, بەلاَم تۆ ئەو ڕۆژەت لەبیرچوو کەپیاوێکی نەوەی فیرعەونت کوشت!.ووتت ئەی خودایە من تاوانم لە نەفسی خۆم کرد لێم ببورە خوداش لێت بورد.ئەی موسا، تۆ سەرزەنشتت کردم لەسەر ئەوەی دیوارەکەم بەبێ کرێ چاك کردەوە بەلاَم تۆش ئەو ڕۆژەت لەبیر کرد کەمەڕەکانی کچەکەی شوعەیبت بەبێ کرێ ئاودا. ئینجا پێویست ناکات سەرزەنشتم بکەی ئەوە سێ شت بەسێ شت .

## ﴿ ئامۆژگاری گەورە و بە نرخ ﴾

(وصايا جليلة)

دینی سەربەرزی ئیسلام لەهێزوگەورایەتیدا گەیشتە ڕادەیەك کەباوکان ئامۆژگاری کچەکانیان بکەن لەکاتی بوکێنی و گواستنەوەیاندا لەگەڵ مێردو هاوسەرەکەیاندا بەرەوشتی زۆر جوان هەڵسوکەوت و ڕەفتار بکەن .

سەیری موسڵمانی بەڕاستی( عبدالله کوڕی جعفرﷺ) لەشەوی گواستنەوەی کچەکەی دا پێی دەڵێ ئەی کچم خۆت لەتوڕەیی و پرکێشی دووربخەوە؟. چونکە بەڕاستی توڕەیی دەرگای بەرەڵا کردن دەکاتەوە ؟. وە هەروەها زۆر

خۆت لەسەرزە نشت بپارێزە؟ چونکە خۆشەویستی ناهێڵێ؟وە زۆر باش بزانە کەچاکترین خۆشیو شتی سود بەخش ئاوە, واتە: بە ئارام بەو توندو تیژ مەبە.

## ﴿ شەوی بوکێنی وگواستنەوە﴾

(ليلةالزفا ف)

ئەو ڕۆژەی کە (ئەبودەرداء ﷺ) ژنی هینا بۆ شەو چووە پەردەی بوکێنی لەپێش ئەوەی لەگەڵیدا جووت بێ ئامۆژگاری هاوسەرەکەی کردو ووتی: هەرکاتێ چاوت بەمن کەوت گرژو توڕەم،تۆ ئارامم بکەوە ,وەکەمن چاوم بەتۆکەوت توڕەی، ئاشتت دەکەمەوە، وە ئەگەر وانەبین ئەوا لەئێستاوە ژیانی من و تۆپێکەوە ناگونجێ .؟.

## ﴿ دە ( ۱۰ ) ئامۆژگاری﴾

(الوصايا العشر)

ئافرەتێك لەئافرەتانی موسڵمان ئامۆژگاری یەکی بەنرخی کچەکەی دەکات لەو کاتەی کەدەی گوازنەوە بۆ ماڵی مێردەکەی پێی دەڵێ کچم ئامۆژگاری بەئاگا هێنانی ئادەمیزادی بێ هۆشەو, یارمەتی دانی ئادەمیزادی بەهۆش وئاگایە،کچم بزانەخودا ئافرەتی بۆ پیاودروست کردووە،وە لەئافرەتانیش پیاو بەوەلەد دەبن .

ئەی کچم:ئەگەردەتەوێ خۆشەویستیتان بەردەوام بێت لەگەڵ مێردە کەت تۆ بۆی ببە بەجاری یە واتە: ئامادەی فەرمانی مێردەکەت بە، ئەویش بۆ تۆ دەبێتە بەندەی گوێ ڕایەڵ، وەتۆ ببە بەزەمین, ئەویش دەبێ بەئاسمان،وەئەو دەرەوشتە پارێزگاری بکە بۆت دەبێتە گەنجینەی نەبراوە :

ئامۆژگـاری یەکـەم و:دووەم: هـەموو کاتێـك بۆمێردەکـەت گـوێ ڕایـەڵ و لـە فەرماندابیت، وەچاو تێرو مل کەچ بی بۆی .
ئامۆژگاری سێهەم و:چوارەم: مێردەکەت چی ئارەزو دەکات تۆش بەشێوەی ئارە زووی ئەو ڕەفتار بکە بەهیچ شێوەیەك پێچەوانەی ئەو ڕەفتار مەکە .
ئامۆژگاری پێنجەم و:شەشەم: چاوەڕوانی کاتی خواردن ونوستنی بکە چونکە بەڕاسـتی برسـیەتی زۆر ئـاگرێکی گڵپـەدارەو زەرەر دەگەیەنیَ،وەهەسـتانی ناوەخت وکاتی پشودانی لەخەو تورەبوونی تێدایە!.
ئامۆژگاری حەوتەم و:هەشتەم: پارێزگاری لەسەروەت وسامانی ماڵی بکەیت و بەڕەفتاری باش لەگەڵ خانەوادەی دا ڕەفتار بکەیت و، بەبیری جوان و هەڵسو کەوت و خانمێتی ماڵ بەڕێوەبەرەو لەماڵ دا زۆر ڕێزو خۆشەویستی بەکار بهێنە

ئامۆژگـاری نۆیـەم و:دەیـەم: نهێنـی مـاڵ و مێـرد بـەدەر مەخـەو بەنافـەرمانی مێردەکـــەت مـــەجولێوە چـــونکە نهێنـــی بەدەرخـــستن,ســـەبروئارامی ناهێڵـێ,وەنافـەرمانی هاوسـەرەکەت مەکـە,دەنـا ئاسـودەو دڵنیـا نابیـت و, لەشەڕوخەراپەی دڵنیاو ئەمین نابیت .دوایی بەو ووتانە کۆتایی بە ئامۆژگاری یەکانی هێنا .
ووتـی: ئـەی کـچم نەکـەی کـەیف خۆشـی دەربـڕی لەبـەردەم مێردەکـەت دا لەکاتێکدا کە غەمبارو مەلول بوو, وە دووبارە نەکەی غەمبارو مەلول بیت کە مێردەکەت کەیف خۆش وشادمان بوو.

# ﴿ ڕاستی ووتن ڕێگەی ڕزگاری یە ﴾

## (الصدق طريق النجاة)

گەنجێکی تازە پێگەیشتو تەمەنی لە دوانزە ساڵانە تێ نەپەڕی بوو لەمەککەی پیرۆزەوە بەڕێ کەوت بۆ بەغداد بۆ فێربونی زانین‌وزانیاری بەڵام . لەپێش بەڕێ کەوتنی بەدایکی ووت دایە ئامۆژگاری یەکم بکە.؟
دایکی ووتی: کوڕم پەیمانم بدەرێ کە درۆنەکەی؟. بەو جۆرە ئەو گەنجە نەوجەوانە لەگەڵ دایکی پەیمان دەبەستێ بەهیچ جۆرێك درۆ نەکات ئەو گەنجەش (٤٠٠)چوار سەد درهەمی ئەوسەردەمەی پێ بوو بۆ ئەوەی لەدووری نیشتمان بیکات بەڕۆژی خۆی . بەوشێوەیە کوڕە سواری وڵاغەکەی بوو بەرەو بەغدا کەوتەڕێ .
لەڕێگا توشی بە توشی دزو ڕێگران هات، ڕایان گرت‌ولێی ڕاپەڕین ووتیان: کوڕە چیت پێیە پێمان بڵێ .؟
کوڕەگەنجەکەش پەیمانی لەگەڵ دایکی کردوە درۆ نەکات, خۆئەگەر ڕاستیش بڵێ ئەوپارەی پێیەتی لێی دەستێنن!. بەڵام بەنهێنی ووتی: لێم بستێنن باشترە لەوەی پەیمانی دایکم بشکێنم بۆیە ووتی: برایان(٤٠٠) چوارسەد درهەمم پێ یە, دزەکان سەریان ڕادەوەشاند وایان دەزانی درۆیان لەگەڵ دەکات بۆیە بە تورەیی یەوە پێ یان ووت: بڕۆدواوە پیسکەیەکی وەك‌وتۆ گاڵتەمان پێدەکات، تۆکەی پیاوی ئەوەی چوارسەد درهەمت پێ بێ, بەو جۆرە کوڕەکە لەوێ بەهۆی ڕاست گۆیی ڕزگاری بوو بەڵام لەڕێگا دووبارە تووشی دێتەوە بەتوشی دزو ڕێگران, کەئەوانەی دوایی سەرۆکی دزەکانی یەکەم بوون: بەشێوەی جاری یەکەم: ڕای دەگرن‌وپێی دەڵێن: چیت پێیە کوڕە پێمان بڵێ .؟ کوڕەش دەڵێ چوار سەد درهەمم پێ یە سەرۆکی ڕێ گرەکان لێی دەستێنێ‌و, لەدوای ماوەیەك چەند پرسیارێکی لێ دەکات دەڵێ: کوڕم تۆ بۆچی

ڕاستت ووت و: درۆت نەکرد لەگەڵم دا خۆ دەت زانی کە ئەو پارەت لەکیس دەچێتولێت دەستێنم, وەئەگەر درۆت بکردبایە باوەڕم دەکرد کەدەم ووت: شڕوڵێکی وەك‌و تۆ کەی خاوەنی ئەوەندە پارەیە،گەنجە تازە پێگەیشتووەکە هاتە گوفتارو ووتی: من پەیمانم لەگەڵ دایکم بەستووە لەگەڵ کەسدا درۆنەکەم ؟. بۆیە ڕاستیم ووت: سەرۆکی ڕێ گرەکان کەگوێی لە ووتەی ئەوگەنجە بوو،ڕەنگی گۆڕاو ترسی خودای کەوتە دڵەوەو بەگەنجەکەی ووت: بەڕاستی سەرم لە تۆ سوڕماوە !. لەوە دە ترسیٚ ی ناپاکی لەپەیمانی دایکت دا بکەی، بەلاّم من ناترسێم ناپاکی لە پەیمانی خودا بکەم ؟! ئەی کوڕم ئەوە پارە کەتوبەرێکەی خۆت دابڕۆ دڵنیابە لە هەموو شتێك : منیش پەیمان بێت لەگەڵ خودای گەورە پەیمانی ڕاستی پەشیمانم لەهەموو خەراپەیەك لەسەردەستی تۆ لەو کاتە بەدواوە تاوان ونافەرمانی خودا نەکەم, ئێوارە کەهەموو دزەکان کۆبوونەوە بۆ ئەوەیکۆیان کردوتەوە بیدەنە دەستی سەرکردەکەیان،کەسەیریان کرد واسەرکردەیان دەگریاو فرمێسکی پەشیمانی بەچاودا دێتەخوارو بەشوێن کەوتووەکانی ووت: برایان خودای گەورە لەقوڕان دا دە فەرموێ :﴿ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً لَّهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَنُدْخِلُهُمْ ظِـلاًّ ظَلِيلاً﴾ نساء/٥٧.

واتە: خودای گەورە فەرمانتان پێ دەدات کە ماڵی لێ پرسراو بدەنەوە دەستی خاوەنەکانیان, لەدوای ئەوە شوێن کەوتوەکان ووتیان : گەورەمان کەتۆ سەرکردەو گەورەمانی پەشیمان بوویەوە ئێمە کەشوێن کەوتەی توێن باشتر لەتۆ پێویست ترە کەپەشیما ن ببینەوە،!! بەو جۆرە بە هۆی ڕاست گۆ یی ئەوگەنجە نەوجەوانە ئەو ڕێگرانەش هەموویان پەشیمانی خۆیان بەرامبەر بەخودا دەربڕی .

## ﴿ وەرن بۆ خانەی پیرۆزی خودا ﴾

### (إلى بيت الله الحرام)

ئەو کاتەی خودای گەورە بەحەزرەتی (ابراهیم خەلیل علیەالسلام)ی فەرموو: ئەی ابراهیم بانگی کۆمەلانی خەلك بکە بێن بۆ حەج بۆ دیدەنی ئەومالە پیرۆزەی خودا حەزرەتی ابراهیم فەرمووی : ئەی خودای گەورە کێ دەنگم بە کۆمەلانی خەلك ڕادەگەیەنێ خۆمن دەنگم بەهەموویان ناگات خودای گەورەش وەلامی ابراهیمی دایەوە فەرمووی: ئەی ابراهیم تۆ بانگ ڕابێلەو ئێمەش بلاوی دەکەینەوەو دەی گەیەنین:بەو بۆنەوە حەزرەتی ابراهیم ڕۆیشتە سەر کێوی (ئەبی قوبیس) لەمەکەی پیرۆز.بانگی ڕاهێشتو ووتی : ئەی کۆمەلانی خەلك بێ گومان خوداتان خانویەکی دروست کردووە بەناوی خانەی خوداوە ئێوەش وەرن دیدەنی ئەو مالە پیرۆزە بکەن . هەموو گیانێك لەجیهانی نهێنی دا وەلامی بانگ ئاوازەکەی خودایان داوەتەوە ووتویانە : ئەی خودای گەورە ئامادەو کەمەر بەستین هاتووین بەدەم فەرمانتەوە کەبەڕاستی هیچ هاوەلت بۆنیە, هەموو سەناو سوپاسێك لەسەر هەموو هەبوونیەك هەر شایانی تۆیە خاوەنی هەردووك جیهانیو هاوەلت بۆنیە .

## ﴿ چەند وانەیەك لەعەرەبی دەشتەکی﴾

### (دروس من الأعرابي)

لەسەردەمی خەلیفە (عبدالملکی کوڕی مەڕوان)دەگێڕنەوە ئەوکاتەی (حەجاجی کوڕی یوسفی) سەقەفی پادشای نیشتمانی عیراق بوو، حەجاج ڕەوشتێکی هەبوو هەرگیز بەتەنها نانی نەدەخوارد دەبوو یەکێك بێجگە لە فەرمان بەرەکانی ئامادەی نان خواردنی بێت، ڕۆژێك بوڕاو شکار دەچێتە دەشت و دەر: کاتی نزیك بوونی نان خواردن یەکێك لەپاسەوانەکانی نارد

بزانیٚ لەودەشتە یەکێك بدۆزێتەوە بیهێنیٚ نانی لەگەڵ بخوات زۆر گەڕا کەسی نەدۆزیەوە تەنها عەرەبێکی دەشتەکی نەبێت کەلەبن سێبەری شاخێك دا خەوی لیٚ کەوتبوو پاسەوانەکە کابرای لەخەو هەستاند عەرەبی دەشتەکی بەچاوی خەواڵو بەترسەوە ووتی: بۆچی لەخەوت کردم خودا میهرەبانیت لەگەڵدا بکات ؟ پاسەوانەکە ووتی: بۆیەم هەستاندی نانی نیوەڕۆ لەگەڵ پادشای عێراق دا بخۆی: دەزانی کییٚ یە ؟

کابرا ووتی: بەڵیٚ دەزانم (حەجاجی کوڕی یوسفە) پاسەوانەکە کابرای بردو ڕۆیشتن بۆلای حەجاج لەپێشیەوە ڕاوەستا حەجاج ووتی:ئەی عەرەبی دەشتەکی دەزانی من کێم .؟ کابرا ووتی: بەڵیٚ پادشای عێراقی (حەجاجی کوڕی یوسفی)

حەجاج ووتی: دانیشە لەگەڵم نانی نیوەڕۆ بخۆین!. کابرای عەرەب ووتی: نانت لەگەڵ ناخۆم؟ چونکە لەتۆ گەورەتر بانگی کردوم خواردنی لەگەڵ دا بخۆم!.

حەجاج ووتی: ئەی کابرای دەشتەکی کیٚ لە من گەورەتر هەیە.؟ کابرا ووتی: من ئەمڕۆ بەڕۆژووم بۆ دەعوەتی سەر سفرەی خودای گەورە داواکراوم؟! . حەجاج ووتی: ئەی کابرا بەوڕۆژە گەرمایە کەی وەختی ڕۆژو گرتنە؟ کابرا ووتی: ئەی حەجاج ئەمڕۆ بەڕۆژ و دەبم بۆ ڕۆژێك کەزۆر لەو ڕۆژە گەرم وبەتین ترە .

حەجاج ووتی: ئەی دەشتەکی لەبەر من ئەمڕۆ ڕۆژوەکەت بشکێنەو بەیانی بیگرەوە کابرا ووتی :ئایا حەجاج تۆ زانیاری نهێنیت هەیە کەتاكوبەیانی دەژیەم! دوایی کابرای دەشتەکی ووتی: بابزانم ئەی حەجاج ئێستا چیت لیٚم دەویٚ. حەجاج ووتی: تەنها خواردنەو هیچی ترم لەتۆ ناوێت کابرای دەشتەکی ووتی: مادام وایە وازم لیٚ بێنە من لەگەڵ خودای خۆم دادەبم. ئەوەی ووتوپشتی لەحەجاج کردو ڕۆیشت.

## ﴿دوورکەوتنەوەی حەزرەتی یوسف وحەزرەتی یەعقوب سەلامی خوایان لەسەر بێ﴾

### (فراق یوسف ویعقوب علیهما السلام)

هەرچەندە برایەکانی حەزرەتی یوسف هەوڵیان دا ئەو لاپەڕەیەی نێوان حەزرەتی یوسف و حەزرەتی یەعقوب علیهما السلام وەرگێڕن وحەزرەتی یوسف لەبیر باوکیان بەرنەوە بێ سودبوو! حەزرەتی یەعقوب لەدوای چل ساڵ بزربوون و دوورکەتنەوەی لە حەزرەتی یوسف، شەوێك لەخەوییدا چاوی بەگیان کێشی گیان لەبەران کەوت لێی پرسی توخودا پێم بڵێ گیانی یوسفت کێشاوە ؟ لە وەڵام دا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا دڵنیابە گیانی یوسفم نەکێشاوە! وە هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: گیانی یوسف ناکێشم هەتا بە یەکیان شاد دەکەمەوە ئینجا لەدوای تێپەرینی(٤٠)چل ساڵ کە حەزرەتی یوسف و حەزرەتی یەعقوب باوکوکوڕ بەدیداری یەکتر شادبونەوە حەزرەتی یوسف فەرمووی: ئەی بابە بۆچی ئەوەندەت پەژارەو ئازار بۆ کێشام ؟ هەتا چاوەکانت ڕووناکیان نەما؟. ئەی نەت دەزانی کەخودا لەودونیایەش دا بە یەکترمان شاد ئەکاتەوە لەجیهانی دوایی دا بەیەکتر شاد دەبوینەوە !. حەزرەتی یەعقوب وتی: ئەی کوڕم بێ گومان دەم زانی بەڵام لەوە دەترسام وغەمگین بووم کەتۆ نافەرمانی خودا بکەیت و لەئاینی ئیسلام پاش گەز ببیتەوە, خودای گەورەش لەڕۆژی دوایی دا لەیەکمان دووربخاتەوە .

## ﴿ داپۆشەری تاوان ﴾

## (ستار العيوب)

حەزرەتی (موسی علیه السلام) لەگەڵ ئەو هەموو رێزو پلەی گەورایەتی کەخودا پێی بەخشیبوو, بەهۆی تەنها کابرایەکی تاوان بار خودای گەورە دەرگای مهرەبانی بارانی لێ پێوە دابوون هەرچەند لەبەر خودا دەپاڕانەوە بارانیان بۆ نەدەباری وە ئەو کابرا تاوان بارەشیان لەگەڵ دابوو بۆپاڕانەوە بەڵام تەنها بەڕواڵەت بوو بۆیە هیچ سودی نەبوو .

ڕۆژێك حەزرەتی موسی ووتی: ئەی تائیفەی بەنی ئیسرائیلی کامتان خۆتان بەتاوانبار دەزانن بالەناوماندا نەمێنێ بەڵکو خودای گەورە دەرگایەکی مهرە بانیمان بۆ بکاتەوەوبارانمان بۆ ببارێنێ بەڵام بێ سود بوو کەس نەڕۆیشتە دەرێ وەحەزرەتی موساش دەی زانی تاوان بارەکە هەرماوەو نەچۆتە دەرەوە، بەڵام ئەوان درێژەیان بەنوێژو پاڕانەوەدا هەتا خودای گەورە بەمهرەبانی خۆی بارانی باراند, حەزرەتی موسی ووتی: ئەی خودایە تۆ فەرمووت ئەو تاوان بارەی لەناوتان دایە بڕواتەدەرەوە ئینجا بارانتان بۆ دەبارێنم بەڵام ئەو تاوان بارە نەڕۆیشت وبارانیشت بۆ باراندین خودای گەورە فەرمووی:ئەی موسی ئەو تاوان بارە بەباوەڕی تەواو پەشیمان بۆتەوە منیش پەشیمانیم لێ وەگرتووە دوایی حەزرەتی موسی فەرمووی : ئەی خودای گەورە دەمەوێ ئەو تاوان بارەم پێ بناسێنی بزانم کێ یە ؟

خودای گەورەش فەرمووی : ئەی موسی چۆن شتی وادەبێت ئەو بەندەیەم کاتێ تاوان باربوو بەتاوان باری بەئێوەم نەناساندو لێم شاردنەوە .بەڵام ئێستا لەتاوان پەشیمان بۆتەوەو پەشیمانیم لێ وەرگرتووە چۆن تازە بە ئێوەی دەناسێنم .؟

## ﴿ لەهەرشوێنێ بن مردن دەتان گاتێ﴾

## (أ ينما تكونوا يدرككم الموت)

ڕۆژێك حەزرەتی (سلێمان كوڕی داود) سەلامی خودای لەسەر لەگەڵ وەزیرو لێ پرسراوانی دادە نیشن لەناكاودا پیاوێكی بەشێوە جوان و بەڕێز دێتە لایان و ماوە یەك دەمێنێتەوەو دوایی دەڕوات,لەدوای ڕۆیشتنی ئەو پیاوە یەكێك لەوەزیران ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو پیاوە بەسامەوەهەیبەتە كێ بوو.؟ حەزرەتی سلیمان ووتی: ئەوە گیان كێشی گیان لەبەران بوو!. كاتێ وەزیر گوێی لەوقسەیە بوو هەموو گیانی هاتە لەرزەو دەمارەكانی گرژ بوون: ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا یارمەتیم بدە فەرمان بەبا بكە باهەڵم بگرێ وبم بات بۆ وولآتی هیندستان بێ گومان تازە ناتوانم لەو جێگەیە دابنیشم كەگیان كێشی لێ دانیشتووە!.حەزرەتی سلیمانیش خێرا فەرمانەكەی بەجێ هێنا باهەڵی گرت و بردی بۆ وولآتی هیندستان ؟ لەدوای ماوەیەك گیان كێشی گیان لەبەران هاتەوە بۆلای حەزرەتی سلیمان ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا كوا ئەوپیاوەی لێرە لەلات دانیشتبو؟ حەزرەتی سلێمانیش ووتی: بێ گومان لەترس وبیمی تۆ داوای كرد بچێ بۆ ولآتی هیندستان، بەفەرمانی خودا با هەڵی گرتو بردی بۆ هیندستان، گیان كێشی گیان لەبەران ووتی: ئەی سولەیمان ئەو كاتەی هاتمە ئێرەو ئەو كابرایە لەلات دانیشتبو زۆر سەرسام بووم؟! چونكە خودای گەورە فەرمانی پێ دام بچم گیانی ئەو كابرایە لەولآتی هیندستان لە فلآن سەعات وكاتەدا بكێشم بەلآم سەیرم كرد ئەو كابرایە لێرە دانیشتووە سەرم سوڕما ووتم: پاك و بێ لەكەیی بۆ خودای مهرەبان بەڕاستی شوێن وكات ناگۆڕێ, كەلێرە هەستام وڕۆیشتم بۆ ئەو جێگایەی خودای گەورە فەرمانی پێ دابوو لەهیندستان وە لەوكات و كات ژمێرەش دا ئامادەبوو هەرلەوێ گیانم كێشا .

# ﴿ پڕوو پوچ و ڕاستی﴾

## (الباطل والحق)

دەگێڕنەوە دوو پیاو دراوسێی یەکتری بوون یەکیان دەوڵەمەند بوو ئەسپێکی هەبوو, ئەوی تریان هەژار بوو مانگایەکی هەبوو, خودای گەورە وای هێنا مانگای هەژارەکە گوێرەکەیەکی بوو دەوڵەمەندەکە ووتی : ئەو گوێرەکە هی ئەسپەکەی منە, هەژارەکە ووتی: براگیان تاکو ئێستا نەمان بیستووە ئەسپ گوێرەکەی ببێ هەرچەند هەژارەکە ووتی: دەوڵەمەندەکە گوێی پێ نەدا کێشەکەیان درێژەی خایاند.

بەناچاری چوون بۆ دادگا, دادپرس بەهەرشێوەیەك بوولایەنی دەوڵەمەندەکەی گرت ووتی : ئەو گوێرەکە هی ئەو ئەسپەیە؟! سەیرکەن چاوی وەکو چاوی ئەسپەکە وایە, ئەوگوێرەکە چوار قاچی هەیەو ئەسپەکەش چوارقاچی هەیە؟

بەو جۆرە دادپرس فەرمانی دا ئەو گوێرەکە هی ئەسپی دەوڵەمەندەکەیە کابرای هەژار بێ بەش کراو لەدادگا دۆڕاندی بەلأم. بەوە وازی نەهێنا و بەناچاری گلەیی خۆی بردەوە بۆلای دادگاو دووپاتی کردەوە (استئناف) بەلأم. ئەو جارەش بێ سود بوو بڕیاری دادگا هەربۆ دەوڵەمەند دەرچوو؟!.

بەوجۆرە هەژاری بێ نەوا لەدادگا دەی دۆڕاند بۆجاری سێهەم: هەژاری کوڵنەدەر ڕۆیشت بۆ دادگای کۆتای (محکمە التمییز) داد پرسی ئەو دادگایە پیاوێکی موسڵمانی لەخودا ترس بوو. کاتێ هەژارو دەوڵەمەند لەبەرامبەر یەك ڕاوەستان لەبەردەمی دادپرس هەردووکیان قسەی خۆیان تەواو کردو دادپرسیش گوێی ڕاگرتبوو کاتێ دادپرس لەڕوداوەکە تێ گەیشت پێی ووتن: ئەمڕۆ مۆڵەتم بدەن ناتوانم بڕیار بدەم, کابرای دەوڵەمەند ووتی: بۆچی ناتوانی بڕیار بدەی .؟ دادپرس ووتی: ئەمڕۆ بێ نوێژم واتە: وەکو ئافرەت عادەی

مانگانەمە؟! هەر ڕۆژێك بێ نوێژبم بڕیار دەرناكەم كابرای دەوڵەمەند ووتی :گەورەم چۆن پیاو بێ نوێژ دەبێت .؟دادپرس ووتی: كوڕم كە تۆ باوەڕناكەی پیاو بێ نوێژ بێ ئەی چۆن باوەڕ دەكەی ئەسپ گوێرەكەی ببێ؟. بەو جۆرە داد پرسی موسڵمان بڕیاری دا گوێرەكەكە بدەنەوە بەهەژارە كە .

## ﴿ زانیاری ئادەمیزاد بانگ دەكا بۆ ئیسلام بوون﴾

### (العلم يد عوا للاسلام)

جارێك مامۆستایەكی مندالْ ناسی (علم الأجنة) لەزانكۆی لندەن، هەستاو ووتی: زانیاری وای سەلماندوە منداڵ لە زگی دایكی دا لەقۆناغی یەكەم كەدەست پێ دەكات خاووشلە،بەڵام. من بۆم دەركەوتووە لە نیوەی سەدەی بیستەم لەپێش ئەوەی ببێ بەگۆشت ڕەقە, ئەو مامۆستایە بەودۆزینەوەی زانیارییە زۆر كەیف خۆش بوو وای دەزانی كەس ئەو قسەیەی نەووتووە بەڵام . لەهەمان پۆلی ئەو زانكۆیەدا قو تابیەكی موسڵمانی پاكستانی هەستایە سەر پێ و ووتی: ئەی مامۆستا وادەزانی ئەوە زانیاری یەكی تازەیە دات هێناوە بەڵام. قورانی پیرۆز كەبەرنامەی ژیانی ئادەمیزادی موسڵمانە بەهەزارو چوارسەد (١٤٠٠)ساڵ پێش ئەو تاقی كردنەوەی تۆ فەرموویەتی: مامۆستایەكە بەسەرسوڕمانێكەوە ووتی: كەی شتی وابووە ئایا بەڕاستی تە .! قوتابیە موسڵمانەكە بەڵێ :بەڕاستیمە تۆ دەڵێی تازە بۆم دەركەوتووە منداڵ لەناو منداڵ دانی دایكی دا لەقۆناغی یەكەم بەڕەقی دەست پێ دەكات لەگەڵ ئەوەش دا زانایانی تر بۆیان دەركەوتووە كەمنداڵ لەمنداڵ دانی دایكی دا لەقۆناغی یەكەم :بەشلی دەست پێ دەكات. مامۆستاكە ووتی: باشە تۆچی دەڵێی .؟ قوتابیەكە ووتی: ئەو قسەیەی تۆ كەتازە بۆت دەركەوتووە ئەو قورئانەی كەبۆ پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی محمد (ﷺ) هاتووەو ڕێبازی دینی

سەربەرزی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە زۆر لەپێشی تۆ فەرموویەتی و:باسی کردووە ماموستاکە ووتی: دەشتێکم بۆبلێ .؟ قوتابیە موسلمانە پاکستانیەکە ووتی: خودای گەورە دە فەرموێ:

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً﴾المؤمنون/١٤ واتە: دوای ئەوەی کەتۆوەکەمان کرد بەخوێن پارەوخوێن پارەکەشمان کرد بەگۆشت پارەو ئەوگۆشت پارەشمان کرد بە ئیسقانی لەشی ئینسان و دوایی ئەو ئیسقانەمان بەگۆشت داپۆشی . دوایی ماموستا بەشێوەیەکی شەرمەزاری بەقوتابیەکەی ووت: بۆ دەست کەوتوو ڕاستی ئەوئایەتە لەناو قورئان وبەرنامەی موسلمانان بەیەك دەگەینەوە,لە دوایی ماموستای بەریتانی لەگەڵ موسلمانە پاکستانیەکە دانیشتن‌ودەستیان بەووت ووێژکردو قورئانی پیرۆزیان هێنایە مەیدانی گۆڕەپان و قوتابی موسلمان لەسورەتی( المؤمنون) لەئایەتی چواردە ئایە تەکەی خوێندەوە ماموستاکەش چەند جارێك ئەو ئایەتەی بەقوتابیەکە دووبارە کردەوە, لەکۆتایی دا ماموستای بەریتانی ووتی:( اشهد ان لااله الا الله . واشهد ان محمد رسول الله) خۆی لە دڵە ڕاوکێ ڕزگار کردو موسلمان بوو .

## ﴿ زانیاری ئادەمیزاد بانگ دەکا بۆ باوەڕ بوون بەخودا﴾

### (العلم يد عوا للايما ن)

ماموستایەکی ئافرەتی ( فەرەنسی) گاوری کاسولێکی لەزانکۆی ( سیربون) لە (فەرە نسا) وانەی بەشی پز یشکی دەووتەوە ڕوژێك لەبارەی خوێنی بێ نوێژی ئافرەتەوە دواو ووتی: زانایانی ئەورووپا وابیر دەکەنەوە هاتنی خوێنی بێ نوێژی ئافرەت وەك‌وکردارێکی جادوو(سحر) وەهایە بەلأم .زانیاری ئەمڕۆ لەسەدەی بیستەم دا دەریان خستووە کەخوێنی بێ نوێژی لەئافرەت دا بەهۆی

چـەند خواردنێکـەوە ڕوودەدات، وە درێـژەی بەووتەکـانی داو لـەبارەی زەرەرو زیانی ئیشی (جنسی) نێوان پیاوو ئافرەتەوە دووا لـەکاتی خوێنی بیێ نوێژیـدا تووش دەبن ووتـی: پیـاو کەلـە ئـافرەت نزیـك دەکەوێتـەوە بـۆ کـاری (جنسی) لـەکاتی خـوێنی بـیێ نوێـژی دا ئـەو کـارە جنـسیە سـەردە کێـشیێ بـۆ چـەندەها نەخۆشی بەتایبەتی نەخۆشی بۆ ڕیەی میزو گورچیلەو نەخۆشـی پێست, بـەو جۆرە ئەوئافرەتـە ئەوقسانەی دەکـردو شـانازی یـەکی زۆری بـەزانیاری تـازەوە دەکـرد لـەو کاتـەدا قوتابیـەکی موسـڵمانی سـعودی هەسـتاو ووتـی: مامۆسـتا قوڕئـانی پـیرۆز کەبەرنامـەو ڕێبـازی دینـی سـەربەرزی ئیـسلامە چواردە سـەدە پێـشی ئێـستا ئـەوەی ووتـووە مامۆسـتاکە ووتـی: کـوا قورئـان چـی وتـووە .؟ قوتابیەکە ئەو ئایەتەی خوێندەوە کەخودا دەفـەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾البقرە/٢٢٢ واتـە:ئـەی پێغەمبەری خودا لەبارەی خوێنی بیێ نوێژی ئافرەتەوە پرسیارت لێ دەکرێ ئایا پیـاو چـی بکـات لەگـەڵ خێزانیـدا لـەکاتی بـیێ نوێـژی؟. تـۆش بڵـیێ ئـەی محمـد(ﷺ)هـەروەك‌و بێنوێـژی ئەرکێکـە بـۆ ژنـان, هەربـەوجۆرەش ئـازارو ناخۆشییە, بۆ ئەو پیاوانەی لـەکاتی بـیێ نوێـژی دچنە لای ژنـەکانیان بـۆ ئیشی (جنسی) کەواتە لە کاتی بیێ نوێژی دا لـە ژنـان دووربکەونـەوە نزیـك مەبنـەوە لێ یان واتە: ئیشی جنسیان لەگەڵدا مەکەن هـەتا بەتـەواوی پاك دەبنـەوەو خۆیـان دەشۆن ئینجا لەدوای خۆشوشتن بڕۆنە لایـان لـەو شوێنەوە کە خودا فـەرمانی پـیێ داون، وەبـیێ گومـان خـودا ئەوکەسـانەی خـۆش دەوێ کـە لەشـتی خراپـە پەشیمان دەبنەوە, وەخودا پاکی خۆش دەوێ،لەدوایی ئەو ئافرەتە( فەرەنسیە) ووتـی: بـۆ قورئـانی پـیرۆزی ئێـوە شـتی علـم‌و زانـستی تێدایـە .؟ قوتابیـە موسڵمانەکە ووتی:بەڵیێ تێی دایە ئافرەتەکـە ووتـی :دەمـەوێ لـەوبارەوە لەگـەڵ زاناو لێهاتوانی دا هێندێك بدوێم ئافرەتەکە بـانگ هێشتن کرا بۆ زانکۆی (ریا

ض) لە ولاتی سعودیە لەگەڵ چەند زانایەکی موسڵمان دانیشت و ووتوو و یژیان دەست پێ کرد لەپێش ئەوەی کۆڕەکە چۆڵ بکرێ مامۆستا فەرەنسیەکە ووتی: قەڵەم وکاغەزێکم بۆ بێنن شتێك بنوسم کە ئێوە چاوەڕوانی دەکەن !لەدوای ئامادە بوونی قەڵەم وکاغەز ووتی: پێی لێ دەنێم و ددانی پێدا دەنێم وەبە ڕاستی دەڵێم:

(اشهد ان لا الـه الاالله واشهد ان محمد رسول الله) بەوشێوەیە ئەو ئافرەتە لەدوای ئەوەی ڕاستی بۆ دەرکەوت و لەزانیاری قورئانیش تێ گەیشت باوەڕی هێناو موسڵمان بوو .

## ﴿ ڕەوشت وهەڵسوکەوتی بەخشندەو دڵفراوان ﴾

## (كرم وأخلا ق )

جارێکیان کەنیزەیەکی حەزرەتی (حوسە ینﷺ) چەند تەڵە ڕەیحانەیەك بەدیاری پێشکەش بەحەزرەتی حسێن دەکات .ئەویش لەپاداشتی ئەودیاری یە بەکەنیزەکە دەڵێ برۆ ئازادم کردی، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لای حەزرەتی حسێن دانیشتبوون ووتیان: ئەی کوڕی کچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ ئەو کەنیزەت ئازاد کرد لەپێناوی چەند تەڵە ڕەیحانەیەك حەزرەتیی حوسەینیش ووتی:لەوکاتەدا فەرموودەی خودام یادکەوتەوە دەفەرموێ ﴿وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا ﴾ النساء/٨٦ .واتە: هەر کاتێك سەلامتان لێ کرا ئێوەش وەلامی ئەوسەلامە بدەنەوە زۆر بەباشتر لەخۆی یان هیچ نەبێ وەك خۆی وەلامی بدەنەوە. بێ گومان هیچ شتێکم لەبەرامبەری ئەو تەڵە ڕەیحانەیە بەباشتر نەزانی لە ئازاد بوون بەولاوە، بۆیە منیش ئازادم کرد .

## ﴿ ئازاری داو، قینی خواردەوەو، بەخشی و، ئازادی کرد ﴾

### (أذى فكظم وعفى وأ عتق)

(عەلی کوڕی حوسێنﷺ) ناز ناوی (زين العابدين) بوو کەنیزەیەکی دەبێت جارێك (عەلی کوڕی حوسێنﷺ)دەیەوێ دەست نوێژ هەڵبگرێ ئەوکەنیزەکە مەسینەیەك ئاو ئامادە دەکات وبەدەستی (عەلی کوڕی حوسێنﷺ)ی دادەکات بەڵام (قەدەر) ڕێکەوت وای هێنا مەسینەکە بەردەبێتەوە بەسەر دەم وچاوی علی داو برینداری دەکات کەنیزەکە زۆر شەرمەزاردەبێ،لەپێش ئەوەی بەڕێز عەلی سەربەرز بکاو قسە بڵێ:کەنیزەکە ووتی: خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾ال عمران/١٣٤.واتە:ئەوانەی قینی خۆیان دەخۆنەوە .

بەڕێز عەلی فەرمووی: ئەوا قینی خۆم خوار دەوە کەنیزەکە ووتی:

﴿والعا فين عن الناس﴾ال عمران واتە: ئەوانەی لەئادەمیزاد خۆش دەبن ودەیان بەخشن بەڕێز عەلی ووتی: ئەوا بەخشیمی دوایی ئافرەتەکە ووتی:(والله يحب المحسنين)واتە:خودائەوکەسانەی خۆشدەوێ کەچاکەی دەکەن، بەڕێز (عەلی کوڕی حوسەینﷺ) ووتی: بڕۆ لەبەر ڕەزای خودا ئازادم کردی .

## ﴿ ئامۆژگارییەك ﴾

### (نصيحة)

ڕۆژێکیان بە سەرکردەی موسڵمانان (عومەری کوڕی عبد العزيزيانﷺ) ووت: ئەی سەرکردە کوڕەکەت ئەنگوستیلەیەکی لەدەست دایە نرخی هەزار درهەمە خەلیفە عومەریش نێردراوێکی بۆ (عاسمی) ناردو ووتی: هەرکاتێ هەواڵی منت پێگەیشت ئەو ئەنگوستیلەی لەدەستت دایە بیفرۆشەو پارەکەی بەسەر هەژاراندا ببەخشەوە دوایی ئەنگوستیلەیەکی ئاسن بکڕەو لەسەر نقێمەکەی بنوسە مهرەبانی خودا لەسەر ئەو کەسە بێ کەڕێزی خۆی دەزانێ .

## ﴿ حەزرەتی عومەرو ﷺ خانەوادەکەی﴾

### (عمر ﷺ واهـلە)

ڕۆژێك لەڕۆژان خێزانی سەرکردەی موسڵمانان خەلیفە(عومەر ﷺ) ئارەزوی دەچێتە شیرینی (حلوی) بەخەلیفە دەڵێ بۆحەلوا,خەلیفە عومەریش پێی دەڵێ ئینجا لە کوێ پارەی شیرینی بێنمو بۆتی بکڕم خێزانەکەی دەڵێ ئەی عومەر ئەمڕۆ هەندێك پارە لەڕۆژی ئەمڕۆمان زیادەیە بەشی کڕینی شیرینی دەکات حەزرەتی عومەر لە وەڵام دا دە فەرموێ: (ماازاد من قوتنا فالمسلمون بە ا ولی فقومی لبیت المال ردیها)

واتە: ئەوەی لە ڕۆژی ئەمڕۆمان زیادە موسڵمانان پێویستیان پێی هەیە بڕۆ بیبەوە بۆ خەزێنەی موسڵمانان .

## ﴿ نیشانەو تاییەت مەندی خودای گەورە﴾

### (صفات الله)

جارێك بە حەزرەتی (عەلی کوڕی ابی تالب ﷺ) یان ووت: ئەی عەلی نیشانەی خودای گەورەمان بۆ بەیان بکە .؟ حەزرەتی عەلیش ووتی: پاك وبێ لەکەیی بۆ ئەوخودایە گەورەیەی کەبەهەرپێنج هەستەکان هەستی پێ ناکەین وە بەپێوانەو لێك دانەوە لێك نادرێتەوە وە هیچ شتێك وێنەی ناکات، وەخودا لەبەرزی هەمووشتێك دایە لەژێریەوە هیچ نیە ؟ وەخودا لەهەمووشتێك داهەیە هەرچی بیری لێ دەکەیەوەو ئەوەی بیریشت پێ نا شکێ!. وە وەك وشت نییە لە ناوشت دا واتە: وەك و ئاونیە لەناو گوزەدا ..هتد ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾الشوری/ ١١.واتە: خودا هیچ شتێك شێوەی ناکات وەخودا بەهەمووشتێکیش گوێاو بینایە.

## ﴿ ووتەی وردو وجوان﴾

### (كـلام د قيق)

جارێـك پرسـياريان لـە پێـشەوا (جەعفـەری صـادقﷺ) كـرد ووتيـان: ئـەی پێشەوا خودای گەورە ئەوشتەی كەلەسـەر نوسيبين دەبێ هـەر بيكـەين ؟بۆچی لێمان دەپرسێتەوە ولـە سـەری ئازارمان دەدات ؟!پێـشەوا (جەعفـەرﷺ) ووتـی: خودای گەورە ئارەزوی كـرد بـۆ خـۆی چـەند شـتێكی ناديارمـان بـۆ دابمـەزرێنێ وەك وچارە نوس و ناديارى، وە ئارەزوشـی كـرد بـۆ ئێمـە چـەند شـتێكی ديـاری بـۆ دامەزرانـدين, وەكوئەوپێويـستيانەی ئـاينی، ئينجـا خـودای گـەورە ئـەوەی ويستی بناغەيمان بـۆ دابمـەزرێنێ لـە ئێمـەی شاردەوە !. وەئـەوەی لەسـەريشی پێويـست گێڕايـن بـۆی ديـاری كردين،بـەڵام ئێمـە بەڵگـە دێنينـەوە بەوشـتەی كەخواسـتی خودايـە وە ئـەوەی كـە خـوداش لەسـەری پێويـست كـردوين و لـە ئێمـەی دەوێ، وازمـان لێ هێنـاوە واتـە: ئـەوەی لەسـەرمان پێويـستەو توانامـان بەسـەريدا هەيـە نـای كـەين ئـەوەی ناديـارەو خواسـتی خودايـەو بـيری ئێمـە دەرەقەتی نايا باسی لێ دەكە ين.

## ﴿ دادگەری ئیسلام﴾

### (عـدالة إسلامية)

لەسـەردەمی خەليفـەی موسـڵمانان (عومـەری كـوڕی خـەتابﷺ)گرانـی و نەهاتيـەكی پڕمەترسـی دووچـاری موسـڵمانان هـات خەليفـە عومـەر بۆئـەوەی لەونەهاتييە بەشداری هەژارەكان بكات خواردنی تەنها ڕۆنی زەيت بوو ئەوەنـدە بەردەوامـەی كـرد دەم وچاوی زەرد هەڵگـەڕا كەلـەپێش دا وەك مـانگی چواردە دەدرەوشـايەوە، وەزگـی وای لێ هـاتبوو دەنگـی لێـوە دەهـات ئـەويش دەسـتی لەسەرزگی دادەناو دەی ووت :كەيفی خۆتە دەنگت لێوە بێت, يان، دەنگت لێوە نـەيات، بـێ گومـان نـابێ گۆشـت و خـواردنی بـاش بخـوێ هـەتا وای لێ دێ منداڵانی موسڵمانان تێر دەخۆن .

## ﴿ خۆپاریزی زانایان﴾

(ورع العارفين)

کابرایەك لەشەوێکی زۆر ساردو سەرمای زستان دەچێتە لای زانای خواپەرست و بەناوبانگ (مەعروفی کەرخی) کەسەیر دەکات تەنها کراسێکی لەبەردایەو دانیشتووە لەسەرمان هەڵدە لەرزێ کابراش دەڵێ: ئەی زانای بەناوبانگ تۆ ئەو هەموو پۆ شاکەت لەلایە بۆ هەندێك لەبەرناکەیت گەرمت ببێتەوە لەسەرمان هەڵ دەلەرزی زانای بەناو بانگیش لە وەڵامدا دەڵێ: برام هەژارانم بەبیر کەوتۆتەوە ئێوا هەیە هیچی نیە !! وەلەسەرمان هەڵ دەلەرزێ وەمنیش ئەوەندە بەرگم نیە بیکەمە خێرو دابەشی بکەم بەسەریان دا هیچ شتێکی وام بەدی نەکرد یارمەتیان بدەم، هەر چەندە بیرم کردەوە تەنها بەوە نەبێ بەشداری لەژیانیان و ناخۆشیان دا بکەم بۆیە تەنها کراسێکم لەبەردایەو سەرمامەو هەڵدەلەرزم .

## ﴿ ووتە و قسەی ژیربێژی باوەڕدار ﴾

(منطق المؤمن)

جارێك بەحەزرەتی( یوسف علیە السلام)یان ووت: هۆی چیە زۆر بەرۆژوەبی لەچی دەترسێی تۆ خەزێنەی وڵاتت لەبەر دەست دایە لە وەڵامدا ووتی: لەوەدەترسێم بۆخۆم تێر بخۆم وبرسیەکانم لە یاد بچێتەوە !!

## ﴿ پێویستە شاهید هەبێت ﴾

(لابد من بينة)

(شەعبی) کەیەکێك بووە لەوزانا بەرزانە دەفەرموێ: ڕۆژێك لەلای( شوڕەیح)ی داد پرس دانیشتبووم لەناکاو ئافرەتێك بەناڵەوگریانەوە هاتە لای شوڕەیح سکاڵای لەدەستی مێردەکەی دەکرد بەڵام. مێردەکەی ئامادە نەبوو, (شەعبی) دەڵێ: منیش بەشوڕەیحم ووت: خودا چاکت بۆ بکات بەڕاستی ئەو ئافرەتە زۆر ستەم لێ کراوە شەعبی دەفەرموێ: شوڕەیح پێی ووتم: بەچی دەزانی ئەو ئافرەتە ستەم لێکراوە,دەڵێ منیش ووتم: بەگریانەکەی دیارە وا دەناڵێنی شوڕەیح لە وەڵام دا ووتی: باوەڕ مەکە بەبێ شاهید چونکە براکانی حەزرەتی یوسف ستەمیان زۆر لە یوسف کرد کاتێ ڕۆیشتنەوە لای باوکیان دەگریان هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً يَبْكُونَ﴾یوسف١٦ واتە: براکانی یوسف کاتی خەوتنان هاتنەوە لای باوکیان بەکوڵ دەگریان لەڕاستیش دا ئەوان لەگەڵ باوکیان درۆیان کرد .

## ﴿ چاكەكانی دە بەخشی ﴾

### (أهدى حسناته)

دەگێڕنەوە ڕۆژێك بە حەزرتی (حوسێنی كوڕی امام عەلی) یان ووت: ئەی حوسێن فلانە كابرایە زۆر ڕقی لێتەوقسەی ناشرینی زۆر پێ ووتی:حەزرتی حوسەینیش هەرخێرا هەڵدەستێ و قاپێك خورمای زۆر چاك دەپێچێتەوە بۆخۆی هەڵی دەگرێ بەرەو ماڵی كابرا دەكەوێتەڕێ لەبەردەرگای ماڵی كابرا ڕادەوەستێ لەدەرگا دەدا كابرا دەچێ دەرگا دەكاتەوە كەسەیردەكا وا حەزرەتی (حوسەین كوڕی حەزرەتی عەلی )یە و قاپێك خورمای بەدەستەوەیە، كابرا زۆرسەرسام بوو ووتی: ئەی كوڕی كچی پێغەمبەری خودا() چۆنە هاتوی لەبەرچی ؟ حەزرەتی حوسەینیش ووتی: ئەو خورمایە بگرە دیارییە بۆم هێناوی لەباتی ئەوەی تۆ كردەوە چاكەكانت بەمن بەخشیوە .

## ﴿ چەند ئامۆژگاری یەكی گەشاوە ﴾

### (إرشادات منيرة)

جارێكیان(حەسەنی بەسری)بەهەندێك لەقوتابیەكانی ووت: كوڕەكانم ئەو كارتو پسولەیە هەڵگرن لەهەزار پەڕاو باشترە بۆتان, كە ئەو ئامۆژگاریانەی تێدایە:

یەكەم:هەڵمەفریوێن بەجێگەی خۆش چونكە هیچ جێگەیەك لەبەهەشت خۆشترو گەورە تر نەبووە، باوكە گەورەمان ئادەم چی لێ بەسەرهات . ؟

دووەم:بەزۆری و خۆپارێزو یادی خودا هەڵمەفریوێن, سەیركەن شەیتان لە دوای ئەو هەمووخۆپارێزی و یادی خودایە چی بەسەرهات.؟

سێهەم: بە چاوپێکەوتنی پیاوی چاك هەڵمەفریوێن چونکە کەس لە پێغەمبەر (ﷺ) گەورەتر نەبووەو نابێ، دووڕو بێ باوەڕەکان سودیان لێ وەر نەگرت !

چوارەم: وەبە زۆری زانست وزانیاری هەڵمە فریوێن چونکە( بەلعامی کوڕیباعورا) لەگەڵ ئەوهەموو زانیاری یەی، لەدوای چونە سەرتەختی پادشایی لەخۆی بایی بووچی لێ بەسەرهات !. حەزرەتی لوقمان بەکوڕەکەی ووت : ئەی کوڕم ئەگەر گومانت لە مردن دا هەیە مەنوو، وە زۆرچاك بزانە وەك دەنوی ئەوهاش دەمری، وە ئەگەر گومانیشت لەزیندو بوونەوەی دوا ڕۆژ هەیە لەخەو هەڵمەستە، دەنا زۆر چاك بزانە وەكو لەخەوهەڵدەستی ئەوهاش لەدوای مردن زیندو دەکرێیەوە، حەزرەتی( عبدالله ی کوڕی عەباس ﷺ) دە فەرموێ: خاوەنی کردەوەی باش ناکەوێ، وە ئەگەر بکەوێش لەسەر لادەکەوێ، وە ئەوکاتەی سکەی درهەم ودینار لێ درا، شەیتان هەڵی گرت ولەسەر چاوی داناو ووتی:

(أنت ثمرة قلبي وقرة عيني بك اطغى وبك اكفر وبك أدخل) واتە:ئەی پارە میوەی دڵی منیو ڕووناکی چاوانمی خەڵك بەهۆی تۆوە بێباوەڕ دەبێ،وە خراپە دەکات وەهەر بەهۆی تۆوەش دەڕۆنە بەهەشت وەبەڕێز (عەلی خەواس) دە فەرموێ: پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك لەسەردەمی ئێستا کەخواردنو خواردنەوەی ئامادەکراو دەستی بۆنەبات هەتا بەبڕوایەکی تەواوە ئەو نزایە دەخوێنێ؟ :

(ا للهم ان كان في هذا الطعام شبهة حرام فاحمنى منه وان لم تحمني منه فلا تجعلـه يقـيم في بطني وان جعلته يقيم في بطني فاحفظني من المعاصي الناشئة من أكله فـان لم تحفظـني منها فمن علي بالتوبة النصوحة فان لم تمن عـلي بالتوبة فالطف بي ولا تؤاخذني يا اكـرم الأكرمين ويأأرحم الراحمين).

واتە: ئەی خودای گەورەو مهرەبان ئەگەر ئەو خواردنە گومانی ناڕەوای لێ دەکرێ بم پارێزی وە ئەگەر لە خواردنی پارێزگاریم لێ نەکەی لەناو گەدەو

ڕیخوڵەکانم دا ئەی هێڵیەوە وەئەگەر لەناو گەدەشدا هێشتەوە لەوکردەوە تاوانانە بم پارێزی کەبەهۆی ئەو خواردنەوە توشم دەبێت, وە ئەگەر لەوەش پارێزگاریت نەکردم یارمەتیم بدە لەسەر پەشیمان بوونەوەیەکی ڕاستوپاك، وە ئەگەر لەسەر پەشیما نیش یارمەتیت نەدام، نەرمی وشیرینم لەگەڵ بەکار بهێنیٚ و بەخراپە نەم گری ئەی چاك ترین ڕێزگرتن وجوامێری و،ئەی مهرەبان ترین لە مهرە بانان.

دەگێڕنەوە (مەعاویە) نامەیەکی بۆ حەزرەتی (عائیشە) نوسی کەلە وەڵامی نامەکەیدا چەند ئامۆژگاری یەکی باشی تێدا بنوسیٚ و زۆر درێژەی پیٚ نەدا، حەزرەتی عائیشەش بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە !

(سلام عليك أما بعد فاني سمعت رسول اللهﷺ( )يقول من التمس رضا الله بسخط الناس كفاه الله مؤونة الناس ومن التمس رضا الناس بسخط الله وكله الله تعالى الى الناس والسلام ): رواه الترمذي

واتە: سەلامی خوات لەسەربیٚ لەدوای ڕێزو سەڵاو ئەمن لەپێغەمبەری خودامﷺ بیستووە دەی فەرموو: هەرکەسێك ڕقی لەخەڵك بۆوە لەبەر ڕەزای خودا ئەوە خودای گەورە لەخەراپەی خەڵکی دەی پارێزیٚ. وە هەرکەسێکیش نافەرمانی خودا بکات لەبەر ڕەزابوونی خەڵك ئەوە خودای گەورە کۆمەڵانی خەڵکی بەسەردا زاڵ دەکات: ئیتر وەسەلام:وەهەروەها(مالیکی کوڕی دینارﷺ)) بەیەکێك لەموریدەکانی دە فەرمویٚ: هەرکاتێك دڵ ڕەقیەکتان کەوتە دڵەوە یان لاوازی‌و سستیەکتان کەوتە سەر گیانتان،وە ناگوزەرانی و ناتەواوی یەکتان لەڕۆزیتان پەیدا بوو, ئەوە باش بزانن ووتەیەکتان وتووە کەهیچ کارتان لەو وتەدا نەبووە .

وە هەروەها:جارێك (فەزیلی کوڕی عەیازﷺ) ئامۆژگاری هاوەڵەکانی دەکات کەگەنج وپیریان تێدابووە دەی فەرموو: ئەی لاوەکان زۆر چاك بزانن زۆر باخ و باخات‌ودانەوێڵە پێش ئەوەی بەبەرهەم بێت نەهامەتی‌و گێچەڵ وکارەساتی بۆ

ڕێك كەوتووەو فەوتاوە، وەدەی فەرموو: ئەی بە تەمەن وپیرەكان زۆر چاك بزانن باخ و باخات ودانەوێڵە هەركاتێ پێ گەیشت دروێنە دەكریٚ ولێیە كرێتەوەو دەڕندرێ ؟

ئینجا ئێوە چاوەڕوانی چی دەكەن وە دوا ڕۆژ بەڵگەی چیتان هەیە كە خودای بە خشندەو قسە لەجێ دە فەرموێ:

﴿نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءكُمُ النَّذِيرُ﴾فاطر/٣٧ واتە:ئایائێمە تەمەنمان نەدابەئێوەبۆئەوەی بیربكەنەوە بۆ ئەوكەسانەی خاوەن بیرن,وەئەی پێغەمبەری ترسێنەر یشمان نە نارد بۆلاتان,

## ﴿ حەزرەتی عومەرڕەزی وام (قەرز) دەكات ﴾

### (عمر رضي الله عنه يستدين)

جارێك حەزرەتی(عومەری كوڕی خەتاب رضي الله عنه) دەنێرێتە لای( عبدالرحمن كوڕی عەوف رضي الله عنه) (٤٠٠)چوار سەد درهەمی بەقەرز بۆ بنێرێ( عبد الرحمن رضي الله عنه)یش بەحەزرەتی عومەر دەڵێ باشە تۆ گەنجینەی موسڵمانانت لەبەر دەست دایە بۆچی لەوێ پارە هەڵناگری دوایی بۆی بگێڕەوە .؟

حەزرەتی (عومەر رضي الله عنه) فەرمووی: لەوە دەترسێم پارە لەگەنجینەی موسڵمانان وەربگرم پێڕا نەگەم بیدەمەوەو بمرم، ئینجا لە دوای مردنم تۆو هاوەڵەكانت بڵێن ئەو پارەیەی لەسەر عومەرە با بۆخۆی بیٚو لێی وەر نەگرنەوە, منیش لەڕۆژی دوایی دا لەكردەوە چاكەكانم هەڵبگرن،بۆیە منیش دەمەوێ لەتۆ پارە قەرز بكەم ئەگەر مردیشم تۆهاتی لەگەل وپەل بەجێ ماوەی ماڵەكەم وەربگریەوە.

## ﴿خێرو چاکەی خودا زۆرو پاکە﴾

### (کثر خیر الله وطاب))

(ئەنەسی کوڕی مالك‌ﷺ )دەگێڕێتەوە جارێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر کێوی عەرەفات لەنزیکەی ڕۆژئاوا ڕاوەستا بوو فەرمووی: ئەی بلال بەخەڵك بڵێ باببێدەنگ بن بلالیش هەستایە سەرپێ‌و ووتی: ئەی ئادەمیزادەکان بێ دەنگ بن پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیشی هەیە لەدوای ئەوە خەڵکەکە بێ دنگ بوو, پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی کۆمەڵانی خەڵك حەزرەتی جبرائیل تۆزێك پێش ئێستا هاتە لام‌و سەلامی خودای پێ ڕاگەیاندم فەرمووی :خودای گەورە فەرموویەتی: من تاوانی ئەو کەسانە دەپۆشم کەئامادەی (عەرەفات) و(مە شعرالحرام) بوون وەدەبمە دەستەبەریش بۆ ئەوانەی کەلەمەودواش ئامادە دەبن, حەزرەتی (عومەرﷺ) هەستاو ووتی: ئەی ڕەسولی خودا ئەو خێرو چاکەیە بە تەنها بۆ ئێمە یە .؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ ئێوەیەو بۆ ئەو کە سانەشە کەلە دوای ئێوە دێن هەتا ڕۆژی دوایی ئینجا حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی چاکەی خودا زۆر و فراوان و پاکە .

## ﴿ نمونەی بەرز﴾

### (مثل علیا)

جارێك دەمەقرەو ناخۆشیەك لەبەینی حەزرەتی (حوسێنﷺ ) وحەزرەتی (محمد حەنیفە کوڕی ئیمام عەلیﷺ) ڕووی دا هەندێك قسەی ناشیرینیان بەیەك ووت: هەردووکیان بەتوڕەیی جیابوونەوە کاتێك (محمد کوڕی حەنیفەﷺ) گەیشتەماڵەوەو دانیشت پارچەیەك لەشێوەی کاغەزی هێناو تێیدا نوسی:

بەناوی خودای گەورەومهرەبان لە(محمد کوڕی عەلی کوڕی ابی تالبەوە )

## دۆستی باوەڕداران

لەدوای ڕێزو سەلام ئەوەیە, برام بەڕاستی تۆ ڕێزو گەورایە تیەکی زۆرت بە سەرمەوە هەیە بێ گومان من ئەو ڕێزەم نییە بکەم بە تۆ!

ئینجا هەر کاتێ ئەو نامەیەی منت خوێندەوە خێرا کراسەکەت لەبەر بکەو کەوشەکانت لەپێ بکەو وەرە بۆلام ئاشتم بکەوە :

بەڵام ئەگەر وانەکەیو خێرا نەیەی دوا بکەوی،منیش خۆم بۆنەگیرێو بێم بۆلات خێری هاتنت بەنەسیب نابێت، چونکە تۆ ڕێزت لەمن زیاترە ئیتر خۆشیت :

کاتێ حسین نامەکەی خوێندەوە کراسەکەی لەبەرکردو کەوشەکانی لەپێ کردو خێرا بۆلای برایەکەی محمد ڕۆیشت و ئاژ بوونەوەو ناخۆشیان نەما.

## ﴿ دایکی باوەڕداران ﴾

### (أم المؤمنين)

دەگێڕنەوە ڕۆژێک حەزرەتی( عائیشە) دەگریا پێغەمبەری خودا(ﷺ ) فەرمووی: بۆچی دەگریەی عائیشە.؟ئەویش فەرمووی: ئاگری دۆزەخم بیرکەوتۆتەوە بۆیە دەگریەم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا ئێوە ئاگاداری خانەوا دەتانن و بیریان دەکەن لەڕۆژی دوایی دا لەکاتێکدا کە کەس ئاگای لەکەس نیەو, هەرکەسە بەئیشی خۆیەوە خەریکە ؟ پێغەمبەرﷺ لەوەڵام دا ووتی: بێ گومان لە سێ شوێن دا کەس ئاگای لەکەس نییە,

یەکەم: لەوکاتەی کەکردەوەی ئینسان دەدرێتەوە دەست هەتاك و دەزاندرێ کردەوەکانی لەلای ڕاستی دەدەنە دەستی، یان لەلای چەپی.

دووەم: لەوکاتەی کەکردەوەی ئینسان کێشانە دەکرێ تابۆی دەر دەکەوێ کردەوەکانی سوکە، یان گرانە .

سێهەم: لەوکاتەی لەسەر پردی سڕاتە, بزانێ دەردەچێ یان دەکەوێتە خوارێ.

## ﴿ ڕەوشتمان بەرامبەر چاکەی دایك وباوکمان﴾

### (أخلاقنا في بر الوالدين)

بە(عومەری کوڕی زەریان‌ ) ووت: ڕەوشتی چاکەی کوڕەکەت لەگەڵت دا چۆن بووە؟ لەوەڵام دا ووتی: بەڕۆژ بۆ هەرشوێنێك ڕویشتبم کوڕەکەم لەدواوە بووە، وەبەشەو بۆ هەرجێگەیەك ڕۆیشتبم کوڕەکەم لەپێشمەوە بووە، وەئەگەر بۆ بەرزایی ڕۆشتبێ من لەژێرەوە بووم.

## ﴿ خاوەنیەتی و، نەی کڕیوە﴾

### (يملك ولايشتري)

کاتێك( عبدالله ی کوڕی عەباس ) لە بانگ هێشتنی بەجێهێنانی داوەتی ژن هێنان کۆتایی هات ووتی: سوپاسی بێ پایان بۆ ئەو خودایەی کەخۆشی وەمەیل و ئارەزوی پێبەخشیوین:( ئەبوبەکری صدیق ) لە ناو کۆڕەکەدا هاتە قسەو ووتی: ئەی عبداللە بۆ کەس هەیە ئارەزوی شتی وانەکات، عبداللە ووتی: بەڵێ زۆرهەن خاوەنی شتن بەڵام ئارەزو ناکەن، وەزۆریش هەن ئارەزو دەکەن، بەڵام خاوەنی هیچ نین وەکۆمەڵێکی تریش هەن نەئارەزو دەکەن نەخاوەنی هیچشن.

## ﴿ کلیلی بە هەشت ﴾

### (مفتاح الجنة)

پێغەمبەری خودا( ) دە فەرموێ: ئەی کۆمەڵانی خەڵك ئێوە دەستە بەری شەش شتم بۆ بکەن لەگیانی خۆتان دا منیش دەبمە دەستەبەری بۆ چوونە بەهەشتتان

یەکەم: لەکاتی قسەتان کرد ڕاستی بڵێن .
دووەم: هەرکاتیَ پەیمانتان دا بەجێی بهێنن.
سێهەم: لەڕاسپاردەدا ناپاکی مەکەن و, بیان دەنەوە خاوەنیان.
چوارەم :چاوتان لەشتی ناڕەوا بنو قێنن.
پێنجەم: پاش وپێشتان لەشتی ناڕەوا بپارێزن.
شەشەم: پارێزگاری دەستتان بکەن لەناپاکی.

## ﴿ پرسە و دڵ دانەوە﴾

## (عزا ء)

(ئەسکەندەری مەقدۆنی) بەدایکی ووت: ئەی دایە هەرکاتیَ من مردم لە دوای شاردنەوەم خواردنێکی چاك دروست بکە، ئەوکەسانەی لەژیان دا توشی دڵ تەنگی نەهاتوون بانگیان بکە، دایکیشی لە دوای مردن وشاردنەوەی کوڕەکەی، ڕاسپێریەکەی دایکی بەجیَ هێنا،بانگەوازی خەڵکی کرد ئەوکەسانەی کەلە ژیانیان دا دڵ تەنگیان نەدیتوە بێنە سەر داوەت بەلاَم. کەس نەبوو بێت وخواردنی داوەت بخوات، لە دوای ئەوە دایکی ووتی: بیَ گومان کەس ئەوەندەی کوڕەکەم دڵ نەوازی و دڵدانەوەی لەگەڵ نەکردوم.

## ﴿ فە رمان ڕەوای باوەڕدار ﴾

## ( حا کم مؤمن)

حەزرەتی( عومەرﷺ) نوێنەرێکی نارد بۆ دانیشتوانی (حمص ) بۆ ئەوەی ناوی هەژارەکانیان بۆ بنوسن بزانن کیَ هەژارە، لەپێش هەموو ناوەکانەوە ناوی (سە عیدی کوڕی عامرﷺ) نوسرا کە لێپرسراوی نیشتمانی (حمص) بوو !!

## ﴿ باوەڕگەورەی کردووین﴾

### (عـز الأ يما ن)

حەزرەتی( عومەری کوڕی خەتابﷺ) دەفەرموێ: ئێمە لەسـەردەمی نەفامیـدا دەسـت بەسـەرو چەوسـاوە بـووین، خـودای گـەورە بـەهۆی دینـی سـەربەرزی ئیسلامەوە،سەربەرزو گەورەی کردین، هەرکاتێ بەبێ بەرنامەی ئیسلام گەورەی و سەر بەستیمان بو ێت، ئەوە خودا دە ست بەسەر و سەر شۆڕمان دەکات.

## ﴿ کاتی باوەڕدار﴾

### (وقت المؤمن)

حەزرەتی (عەلیﷺ) دە فەرموێ: هەرکەسێك ڕۆژێ بەڕی بکـات وەلـەو ڕۆژەدا ئیش و کاری باش بەجێ نە هێنـێ و، کردەوەی چاك نـەکات و، پێویسـتی ئـەو ڕۆژە بەجێ نەهێنێ و، گەورایەتی وپاشماوەیەکی چاك نەڕوێنێ و، سوپاسێك پەیدا نەکات و چاکەیەك دانەمـەزرێنێ و، زانیـاری یـەك وەرنـەگرێ، ئـەوە مانـای وایە حەق و مافی ئەوڕۆژەی نەداوەو ئازاری پێگەیاندووە.

## ﴿ دینداری ڕاستی ﴾

### (الزهد الحق)

جارێـك دایکـی موسـڵمانان حـەزرەتی (عائیـشە) چـاوی بەکابرایـەك کـەوت، لەسەرشان دایـان نـابوو بەدەوری مـاڵی بـەیت دا دەیـان گێڕا حـەزرەتی عائیـشە فەرمووی: ئەوە کێیە دەی گێڕن ؟ وتیان: ئەوە کابرایەکە لـە ترسـی خـودا دڵـی مـردووە حـەزرەتی عائیـشە فـەرمووی: بـێ گومـان خوداناسـی و،دینـداری و، داد

پـەروەری و ڕاسـتییە، مرۆڤـی موسـڵمان پێـی کـزو نـابووت نـابێ و، بـێ هێـزی ناکـات, بـەڵکو هـەموو کاتێـك هێـزو توانـای زیـادەی پـێ دەبەخـشێ, سـەیری حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتاب) بکەن لە هەمومان زیاتر لە خودا دەترسا بـەڵام کاتـێ دەڕۆیـشت خێـرا بـوو لەڕۆیـشتنندا کەقسەی دەکـرد گوێمـان لێـی دەگرت وەکەلە ڕێبازو پێناوی خودا گورزی دەوەشاند بەهێزبوو ئازاری دەبوو.

## ﴿ ئامۆژگاری باوك بۆ کوڕەکەی﴾

## (وصية أب لأبنه)

( عومەری کوڕی عەتبە) دەفەرموێ: کاتێ تەمەنم گە یشتە پانزە ساڵی باوکم پێی ووتم: ئەی کوڕم وارەوشتی ئارامیت لێ پچڕاوە ئینجا ئابڕو بەکار بهێنە باخاوەنی ئابڕوبیت،وە بەقسەی ئەوانە هەڵمەفریوێ کەپێت هەڵ دەڵێن: بەوشتانەی کە بۆ خۆت دەیزانی، ئەوشتەی پێت هەڵ دەڵێن: لە تۆدانیە وە ئەو کەسـەی قسەی پێـوە دەکـرێ لـەبارەی خێرەوە،کـەبۆخۆت ئـەو چاکەیەت تێـدا نەبوو. کەیف خۆش مەبە هەروەك و یەکێك قسەیەکی ناڕەوات بەرامبەر دەکات پێـت ناخۆشـە واتـە: بەرامبـەر چاکەش پێـت نـاخۆش بێت،هـەروەك وکـوڕی( میعاد) جوانی ووتووە کە دەڵێ : احب مكارم الاخلاق جهد ی وا كره ان اعيب وان اعا با

واتە: کردەوەی ڕەوشت پاکم خۆش دەوێ وە هەوڵیشم بۆ داوە، وەزۆرم پێ ناخۆشە خەڵك بەندو باوم پێ وە بڵێ با بۆخۆ شیا ن نەنگ و بەد ناویان هەبێت

## ﴿ حەزرەتی لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات ﴾

( لقمان يعـظ إبنه)

حەزرەتی (لوقمان عليه السلام) بەکوڕەکەی ووت: ئەی کوڕم خۆت لەهاوەڵی خـەراپ بپـارێزە چـونکە بەڕاسـتی وەك وشـیری تیـژو سـواو، تەماشـا کردنـی سەرسـامت دەکـاتو جێگـەی لێ دانـی ناشـیرینت دەکـات، وە کـوڕم بەچـاوی سـوکایەتی سـەیری ئەوکەسـانە مەکـە کـەجل وبـەرگیان کۆنـەو دڕاوە، چـونکە خـودای گـەورە تەماشـای دڵ و دەرونـی لـە خـودا تـرس دەکـات، وەبـەهۆی کرداریـشەوە پاداشـتی دەداتـەوە وەحـەزرەتی (عـەلی کـوڕی ابـی تالـب) فەرموویەتی: هەرکەسێك خۆی بە پێشەوای خەڵك دابنێ پێویستە لەپێشەوە تەربیەتی گیانی خۆی بکات لەپێش تەربیەتی کۆمەلآنی خەڵك وەپێو یستیشە لەپێشەوە تەربیەتی ڕەوشت و کرداری بکات لەپێش تەربیەتی ووتەو زوبانی.

## ﴿ شاهیدی گەواهی﴾

(شهادة)

جارێك( فەزلی کوڕی ڕەبیع) وەزیری خەلیفە (هاڕون ڕەشید) لەلای داد پرسی دادپرسان( ئەبا یو سف ) شاهیدیەك دەدات، بەلآم ئەبا یوسفی داد پـرس شـاهیدیەکەی لێـوەر نـاگرێ، خەلیفـە (هـاڕون ڕەشـید) لۆمـەی ئـەبا یوسـفی داد پـرس دەکـاودەڵێ بۆچـی (فـەزلی کـوڕی ڕە بیعـت) بەشـاهیدی وەرنەگرت نازانی وەزیری منە.؟

ئەبایوسـفی داد پـرس ووتـی: ئـەی خەلیفـە نـاتوانم وەزیرەکـەت بەشـاهید وەربگرم چونکە بۆ خۆم گوێم لێ بوو ڕۆژێك( فەزلی کوڕی ڕە بیع) بە تۆی دە ووت: من بەندەی تـۆم ئەگـەر ڕاست بکـات بەنـدەی تـۆبێ ئـەوا بەنـدە بەشـاهێد وەرنـا گـیرێ،وە دووبـارە ئەگـەر درۆ بکـات ئـەوە درۆزنـەو درۆزنـیش بەشـاهید وەرناگیرێ .

## ﴿ گیان ودەرونی ڕەوشتی دادا ﴾

### (مؤدب نفسه)

پرسیاریان لە(عبدالله ی کوڕی مو قفع ﷺ) کرد کێ شێوازو ئەدەبی فێرکردی ؟ لە وەڵامدا ووتی:گیانم ووتیان:چۆن گیانت ڕەوشتی فێرکردی بەبێ ڕەوشت فێرکارێك ؟ ووتی: چۆن هەرکاتێ کردەوەیەکم دەکرد کەجوان بوایە وەرم دەگرت، وە ئەگەر کردەوەکەشم ناڕەوا بوایە وازم لێ دەهێنا بەو جۆرە بەتەنها گیانم فێری شێوازو ڕەوشتی کردم.

## ﴿ چەند ئامۆژگاری یەکی پڕشەنگ دارو ڕووناك ﴾

### ( وصايا منيرة )

حەزرەتی ( عەلی کوڕی ابی تالب ﷺ) دەفەرموێ: ئامۆژگاریتان دەکەم بە(٥)پێنج شتی بچوك : ئەگەر لە بن باڵی حوشتری دا بنێن هێشتاکەمە.

یەکەم: هیواتان بەکەس نەبێ تەنها هەر لەخودا داوا بکەن.

دووەم: لە هیچ شتێك مە ترسێن تەنها لە تاوانەکانتان نە بێت.

سێهەم: شەرم مەکە لەوەی نای زانی کەپرسیاریان لێ کردی بڵێ نای زانم .

چوارەم: کە شتێکت نەزانی هەوڵ بدە فێری بە.

پێنجەم: بزانە ئارام گرتن لەباوەڕەوەیە، وەك و سەر وایە، بەلاشەوە هەرکاتێ سەرت بڕی لاشەکەش دەڕوا هەر بەو شێوەیە کەئارام نەما باوەڕیش نامێنێ .

## ﴿ قورئان و ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

## (الكتاب والسنة)

(شێخ احمەدی ڕوفاعی رضي الله عنه) دە فەرموێ: هەرکەسێك گوفتارو کردارو، ڕەوشتەکانی لەهەمووکات و سەردەمێکدا لەگەڵ قورئان وڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) کێشانەو بەرامبەریان پێ نەکا واتە: بەگوێرەی فەرموودەی ئەوان بەرێدا نەڕواو دڵی لەبیری تاوان وگێچەڵ نەپارێزێ ئەوە لەلای خۆمان بەپیاوی دانا نێین.

## ﴿ دەرمان وچارەسەری گیان ﴾

## (دواء القلب)

حەزرەتی (ابراهیمی خەواس رضي الله عنه)دەفەرموێ: دەرمان وچارەسەری گیان (روح) پێنج شتە:

یەکەم: خوێندنی قورئان بەتێگەیشتنەوە .

دووەم : گەدەوزکی خاڵی.

سێهەم : شەو نوێژ

چوارەم: مل کەچی لە هەموو کاتێ بۆ خودا بەتایبەتی بەیانیا ن.

پێنجەم: دۆستایەتی پیاوچاکان .

## ﴿ئەو بەڕێزانە وتویانە﴾

## (هؤلاء قالوا)

پرسیاریان لەزانای بەناوبانگ (شەعبی) کرد لەبارەی شتێکەوە لەوەڵامدا ووتی: نای زانم پێیان ووت:شەرم ناکەی دەڵێی نایزانم ووتی:بۆچی شەرم بکەم لەشتێك کەفریشتەکانی خودا شەرمیان نەکردوە کە وتوویانە (لاعلم لنا الا ماعلمتنا﴾ البقره /٣٢واتە:ئەی خودایە ئێمە ئەوشتانە نازانین تەنها ئەوانە نەبێ کە فێرت کردووین.

## ﴿ ترس وسامی عومەر رضي الله عنه ﴾

(مهابة عمر رضي الله عنه)

کابرایەکی قورەیشی بە حەزرەتی( عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه) ی ووت: ئەی عومەر تۆزێك نەرمی لەگەڵ ماندا بەکار بهێنە بەڕاستی هەموو گیانمان پڕ بووە لە ترس و سامی تۆ حەزرەتی عومەریش رضي الله عنه فەرمووی: ئایا هیچ ستەمێکی منی تێدایە .؟

کابرا ووتی:نەخێر حەزرەتی عومەر رضي الله عنه فەرمووی: خودای گەورە ترس وسامم لەناو دڵتان زیاتر بکات .

## ﴿ باوەڕدار ﴾

(المؤمن)

(ئەحنەف رضي الله عنه) فەرموویەتی: باوەڕ داران لەنێوانی چوارشت دان:

١ – باوەڕدار ئێرەیی وحەسادەتی پێوە دەبەن.

٢– دوو ڕوەکان ڕقیان لێ یەتی و بەربەرەکانی لەگەڵ دەکەن.

٣– بێ بڕواکان جەنگی لەگەڵ بەرپا دەکەن.

٤– شەیتان ئاژاوەو گێچەڵی بۆ دەنێتەوە.

## ﴿ ڕاوێژ لەگەڵ ئەوانەدا مەکەن﴾

(لاتشاور هؤلاء)

(قەیسی کوڕی ساعدە) ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکردو ئەی ووت:

ئەی کوڕم: ڕاوێژ لەگەڵ مرۆڤی سەرقاڵ وخەریك بوودا مەکە, بائیشەکەشی زۆرباش و ڕێك و پێك بێت.

وەڕاوێژ بە مرۆڤی تورە مەکە، بائامۆژگاری کاری باشیش بێ.

وەڕاوێژ بەمرۆڤی غەمبار مەکە، بابە هۆش وبەتواناش بێت.

## ﴿ لە میرات وبۆماوەی دوور لەنەنگی﴾

( من موا رث السلا مة)

خودای گەورە پەیامی بۆ حەزرەتی (عیسا علیە السلام) نارد فەرمووی: هەرکاتێ بەتەنها بووی پارێزگاری گیانت بکە . وە هەرکاتێ لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا بووی پارێزگاری زوبانت بکە. وە ئەگەر لە سەر سفرەی نان خواردن دابووی پارێزگاری لە گەدەو زگت بکە. وەئەگەر لەڕێگاو بان دا بووی پارێزگاری لەچاوت بکە. بێگومان ئەو شتانە ئاسایشت پێ دەبەخشێ.

## ﴿هەرکەسێك خۆپارێز بێ خودا دەرگای خۆشی لێ دەکاتەوە﴾

(ومن يتق الله يجعل له مخرجا)

دەگێڕنەوە(سالمی کوڕی عەوف) کە برای (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) بووبێ باوەڕان لەجەنگێکدا بەدیل دەیگرن، باوکیشی دەچێتەلای پێغەمبەر سکاڵای کوڕەکەی لەلا دەکات پێغەمبەریش () پێی دەفەرموێ: ئەی عەوف لەخودا بترسێ و خۆپارێزبەو زۆر فەرموودەی:( لاحول ولاقوة الا

بـاالله العلـي العظـيم )بـەكار بهێنـە عـەوفيش بەفەرمانەكـەی پێغەمبـەرﷺدڵـی دامەزراوبـەردەوام ئـەو فـەرموودەی : دەوت هـەتا ڕۆژێـك بێئاگالەماڵـەوە لەگـەڵ خێزانەكـەی دانیـشتبوون, لـەناكاو لـەدەرگا درا كـەدەرگایان كـردەوە سـەیریان كـرد واسـالمی كوڕیانەولـە دەسـتی بـێ باوەڕان ڕای كـردووەو لەوكاتـەی كـەبێ باوەڕان بێ ئاگاو سـەرقاڵ بـوون بـەكاری خۆیانـەوە,(١٠٠) سـەد سـەر حوشـتری بێ باوەڕەكانی بەپێشی خۆی دابوو هێنا بوو نیەوە بۆ ماڵەوە.

## ﴿ زیرەكی و ڕووكەش زانی﴾

## ( فراسة)

دەگێڕنـەوە كابرایـەك دەچـێتە لای( عوسمـا نـی كـوڕی عـەفانﷺ) كەلەگـەڵ ئافرەتێك دا داوێن پیسی كرد بوو حەزرەتی عوسمان ووتـی: چۆن یـەكێك دێتـە لای من كە نیشانەی داوێـن پیـسی لـەناو چاویدا دیارە، كـابرا ووتـی: بۆ ئـەی عوسمان لە دوای پێغەمبەریش (ﷺ) پەیام دێت، حەزرەتی عوسمانﷺ ووتـی: نەخێر پەیام نایات بەڵام ئەوە نیشانەی ز یرەكی موسڵمانە.

## ﴿ ڕەوشتی موسڵمانان﴾

## (أخلاق المسلمين)

(عبدالله ی كوڕی مبارك‌ﷺ) دراوسێیەكی گاوری هـەبوو ویـستی خانوەكـەی بفرۆشێ پێیان ووت: نرخەكەی چەندە ؟

ئەویش ووتی: (٢٠٠٠ )دووهەزار درهەمە، پێیان ووت: برام خانوەكەت تەنها هەزار درهەم دەهێنێ چۆن دەڵێی دووهـەزار ووتـی: ڕاسـت دەكـەن تـەنها هـەزار درهەم دێنێ، بەڵام هەزار درهەمیشم لەبەر چاكی دراوسێیەكەم داناوە: (عبدالله

ی کوڕی مبارەکیانﷺ) ئاگادار کرد لەوبارەوە ئەویش بانگی گاورەگەی کردو پارەی خانوەکەی دایەو وتی: مەی فرۆشە .!!

## ﴿ من لەسوپا نا ترسێم لە بەر زۆری دووژمن, بەلاَم لەوە دە ترسێم تاوان ونافەرمانی خودا بکەن ﴾

(أنالاأخشى على الجيش من عدوه وإنما أخشى على الجيش من ذنوبه)

( کسرای) پادشای نیشتمانی فارس کەناوی:( یەزد جرد) بوو دەستی بەسەر کۆمەلاَنی خەلَك دا گرتبوو دەی ویست هەموو موسلَمانان لەئاین پاش گەز بکاتەوە و بیان کات بەئاگرپەرست چونکە ئەوکاتە خۆیان خودایان نەدەناسی تەنها ئاگر نەبێت. وە دەتوانم بلَێم شتێکی شاراوەنیە هەموو زەبرو زەنگێك و چەوسانەوەیەك لەژێر پەردەی بیٚ باوەڕیدا دەکرێت، چونکە بیٚ گومان ئیسلام ڕێگەی دیکتاتۆری و خوێن ڕێژی و ستەمکاری نادات وەهەموو ئەوسەرۆك و فەرمان ڕەوایانەی کەزەبرو زەنگ بەسەر گەل‌ونەتەوە هەژارەکان بەکار دەهێنن، ئەوە شتێکی ڕاستە لە سەر ڕێبازو بەرنامەی خودا لایان داوە بۆیە دلٚ سۆزی و مهرەبانیان لیٚ بەدی ناکرێت تەنها بیر لە کورسی بەرزو پاروی چەورو زەبرو زەنگی زۆر دەکەنەوە دەیانەویٚ بەوزەبرو زەنگەی خۆیان بسەپێنن لە نیشتمان دا ئینجا هەرکاتیٚ جەورو ستەم لەنیشتمان دا زۆر بوو پێویستی سەرشانی دەولَەتی ئیسلام‌وموسلَمانەکانە بەگشتی هەولٚ بدەن و تیٚ بکۆشن بۆ نەهێشتنی ستەم و زەبروزەنگ وگەڕانەوەی خۆشی وئاسایش بۆ گەل ونیشتمان .

ئەوکاتەی کە کیسرای بیٚ باوەڕوئاگرپەرست ئەوزەبروزەنگەی دەکێشا لەسەردەمی خەلیفەی موسلَمانان( عومەری کوڕی خەتابﷺ) بووحەزرەتی عومەر فەرمانێکی دەرکرد لەشاری مەدینەی پایتەختی موسلَمانان کیٚ خۆی

## دۆستی باوەڕداران

فیـدا دەکـات بۆجـەنگ لەڕێگـەی بـەرز کردنـەوەی ووشـەی:( لاالـه الاالله)وە بـۆ نەهێشتنی کوفرو بـێ بـاوەڕی، لەگـەڵ دەرکردنـی فەرمانـدا لـەناو موسـڵمانانی خۆشەویستدا سێ هەزار (٣٠٠٠) موسڵمانی جەنگاوەر هاتـه مەیدان حـەزرەتی عومـەرﷺ ویـستی بۆخـۆی ببێتـه سـەرکردەی سـوپاو بڕوا بـۆ جـەنگ!. بـەڵام حەزرەتی( عەلی کوڕی ابی تالبﷺ) ناڕازی بـوو ووتـی: نابێ تـۆ بچیت بـەڵکو یـەکێك لەجێگـەی خـۆت دا بنێـره تـۆ خەلیفـەی موسـڵمانانی نـابێ پایتـەختی موسڵمانان چوڵ بکرێ ئەوجا حـەزرەتی عومـەرﷺ کەوتە ڕاوێژ تالـەکۆتایی دا یـەکێك لـەو دەکەسـەی کەپێغەمبـەری خـودا بـەڵێنی بەهەشـتی پـێ دا بـوون هەڵبـژارد ئـەویش( سـعدی کـوڕی ئـەبی وە قـاسﷺ) بـوو لێپرسـراوی سـوپای درایە دەست خەریکی خۆ ئامادە کردن بوون لـه مەدینـەی (مونەوەرە) وە بەرێ بکـەون بـۆ وڵاتـی فارس، کـه ئـەو کاتـه ئیمپراتۆریـەتی کسرا: ئێران وعێراقی داگرتبو کەبەڕاستی ئەو جەنگـەش بەگـەورە تـرین جـەنگ دادەنرا وەهـیچ کـەس لەمـەوپێش نـەی توانیـوە بـەرەنگاری جـەنگێکێی واگـەورە ببێتـەوەو بـەرگری بکات،بـەڵام وائێـستا سـوپای ئیـسلام بـەبڕوای تـەواوەوە بـەرەو مەیـدانی جـەنگێکی واگـەورە دەڕوات،سـەرکردەی موسـڵمانان حـەزرەتی عومـەرﷺ لەپێـشوازی بـەرێ کردنیانـدا فـەرمووی: بـەناوی خـودای بەخـشندەومهرەبان لەسەر پیرۆزی پێغەمبەری خودا ئەی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسﷺ) نەکـەی بـەفێڵو تەڵەکـەی بـێ بـاوەڕان هەڵنـەفریوێی بـێ گومـان تۆخـاڵی پێغەمبـەری خودای و هـاوەڵی ئەویشی هـەموو کۆمـەڵانی خـەڵك گـەورەو بچوکیان لـەخودی خودادا وەك و یەکه بەبێ جیاوازی،تەنها جیاوازیـان لـەژیان وخۆشیدایه بەهۆی یـادی خـوداوە دەگـەنـه ئـەو شـتـەی کـەخودا بڕیـاری داوە بۆیـان، ئـەی سـەعد ئامۆژگاری تۆو ئەو موسڵمانانەی لەگەڵ تۆ دان دەکەم خۆپارێزبن و یادی خودا بکەن, چونکه ئێمـه ئەگـەر تـاوان و نافـەرمانی بکـەین وەك ودوژمنمـان لێ دێت لـه تاوان وخەراپەدا وەبەژمارەی نەفەرو چەك و تفاق لەئێمـه زۆر تـرن و سـوپاکەمان

دەشکێ،ئەی سەعد من لەبەر زۆری دوژمن ناترسێم لەئێوە: بەلآم لەبەرئەوە دەترسێم تاوانو نافەرمانی خودابکەن؟! ئینجا بەپشتیوان و پیرۆزی خودا بۆبەرەنگاریو سەر کەوتن بڕۆن ئەی سەعد .

بەوشێوەیە سەعد لەگەڵ سوپای باوەڕدارو بەهێز کەوتەڕێو دەشت وبیابانیان بڕی بۆشاری( قادسیە) وە قادسیەش لەخاکی عێراق دایە وکلیلی دەرگای فارس بوو, کاتێ هەواڵ گەیشتە (کسرا) کە لەمەدائن دادەنیشت پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی فارسەکان بوو, وەلەناو فارسەکان دا هەرکەسێك لەسەر تەختی فەرمان ڕەواییدا دادەنیشت پێی دەوترا کسرا، هەروەك وچۆن لەناو ڕۆمەکاندا هەرکەسێك لە سەر تەختی فەرمان ڕەواییدا دادەنیشت ناودەبرا بە(قەیسەر):

لەولاوە پادشای فارس کسرا فەرمانێکی بۆ ڕۆستەم دەرکرد کەسەرکردەیەکی لیهاتو بوو،وەجێگای لەدلی خەلکی فارس دا کردبۆوە کە سەرکردایەتی سوپا بگرێتە دەست و،نێرراوێکی نارد بۆلای سەعدی کوڕی وە قاس ووتی: ئەی سەعد:نێرراوێکمان بۆلا بنێرە بۆ ووتو وێژی ڕێك کەوتن، سەرکردەی موسلمانیش چەند کەسێکی لەپیاوە ناودارەکانی موسلمانان هەلبژارد بۆ ووت و وێژی ڕێك کەوتن: ئەو موسلمانانەش ئەوانە بوون( نەعمانی کوڕی مەقرون ﷺ) و (موغەیرەی کوڕی شەعبﷺ) و( عاصمی کوڕی عەمرﷺ) و (ئە شعە سی کوڕی قە یسﷺ) ئەو موسلمانە خۆنەویستو بەجەرگانە ڕۆیشتن بۆ کۆشکی سپی کسرا، کەتاكوئێستاش مێژوو شتی وای بەخۆوە نەدیوە لە شێوەی هونەرو ئەندازیاریوفەڕشو وەرتەی ڕاخراو, دوای دانیشتن، ووت ووێژ دەستی پێکردو کسرا ووتی: بۆچی هاتونە ولآتەکەمان وچیتان دەوێ ؟ لە وەلآم دا ووتیان: ئەی کسرا ئێمە هاتوین بانگتان بکەین بۆ خودا بەیەك ناسی ؟ بەو ووتەیە کسرا تووڕە بوو دەمارەکانی گرژ بوو ووتی: ئەگەر وەلآمتان نەدەینەوە ؟ ووتیان: دەبێ سەرانە بدەن؟ بەو قسەیە کسرا

ئەوەندەی تریش توڕە بوو ووتی: ئەگەر ئەویش نەکەین ووتیان: جەنگ دەکەین وشیرمان لە نێواندایە، لەدوای ئەو وتوو وێژە کسرا زۆر بەنامەردانە بە پاسەوانەکانی ووت: ئەوانە بەزەلیلی وملکەچییەوە دەریان بکەن ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەنێردراو ناکوژرێ دەنا هەموو تانم دەکوشت : پێی ووتن: کامەتان گەورە کەتانە ووتیان: بۆچی ووتی: بۆ ئەوەی کوڵێك گڵ بەسەر سەر هەڵگرێ ولەگەڵخۆی بیباتەوە ئەگەر هەڵی نەگرێ لێرە دەیکوژم (عاسمی کوڕی عەمرﷺ) بۆ ئەوەی ئەوکوڵە گڵە بۆخۆی هەڵبگرێ لەباتی هاوڕێکانی ووتی: من گەورە کەیانم,بەو جۆرە عاسم کوڵە گڵەکەی هەڵگرت و بەرەو سوپای موسڵمانان کەوتنەڕێ (سەعدی کوڕی ئەبی وە قاسﷺ ) لێی پرسێ ئەنجامی ووت و وێژ چی بوو .؟ عاسم هاتە وەڵام ووتی: من کلیلی کسرام هێناوە : لە دوای ئەوە سوپای فارس بە سەرکردەی (ڕۆستەم)ی هاتە مەیدانی جەنگ ڕۆستەم لەناو خێمەی مەیدانی جەنگدا لەپێش هەڵگیرسانی شەڕ نێراوێکی نارد بۆلای سەعد پێی ووت: پێی بڵێ پیاوێکی بەهۆش و زیرەکم بۆ بنێرێ چەند ووت و وێژێکی لەگەڵ دەکەین، بەوشێوەیە ووت و وێژی ڕێك کەوتن لەپادشای وڵاتەوە بۆ سەرکردەی سوپا دابەزی، لە (کسراوە) بۆ (ڕۆستەم) (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسﷺ)یش موسڵمانێکی لێهاتوی بەناوی (ڕەبعی کوڕی عامرﷺ) نارد، نێردراو گەیشتە لای خەیمەی سەرکردەی گشتی سوپای فارس، ئەوەی لەناو خەیمەکەدا دیتی لەژیانیدا چاوی بەشتی وانەکەوتووە فەرشی بەنرخ وقەنەفەی ڕازاوەو تەختی ڕەنگاو ڕەنگ بە کورتی هەرچی بتەوێ لەشتی بە نرخ تێیدا هەبوو بەهەر جۆرێك بوو موسڵمانی چاونەترس بەخۆی و ڕمەکەیەوە لەبەرامبەری ڕۆستەم دانیشت،ڕۆستەم لێی پرسی چۆن بوو ئێوە هاتن بۆ ئێرە, وە لەبەرچی ؟ (ڕەبیع) ووتی: خودای گەورە ئێمەی ناردووە ئەوەی کەخودا ئارەزوی لێ بێ لەبەندایەتی بەندەکان بیان گێڕینەوە بۆ بەندایەتی خودای گەورەومەرەبان، وەلەستەمی ڕێچکە دروست کراوەکاندا بیان

گێڕینەوە بۆ ڕاستە ڕێگای دادگەری ئیسلام، وەلە تەنگەبەری ئەودوونیایە بیان گێڕینەوە بۆ فراوانی ئەو دونیاو دوونیای دواڕۆژ بەوجۆرە ڕۆستەم سودی لەووتەکانی (ڕەبیع) نەدیت نامەیەکی نوسی دایە دەستی (ڕەبیعی)کەبیبات بۆلای سەعدی سەرکردەی گشتی سوپای ئیسلام، داوای لێ کرد ئەو نێردراوە زۆر توندو تیژو داخ لە دڵە، نێردراوێکی ترم بۆ بنێرە ووت وێژی لە گەڵ دا بکەم ئەوجارە سەعد (موغەیرەی کوڕی شعبە) ی نارد کەبەڕاستی پیاوێکی ناودارو داناو لێزان بوو لەکەڵ ڕۆستەم دانیشتن بۆ ووت ویێژ،ڕۆستەم ووتی: هۆی چییە ئێوە هاتونە ئێرە .؟ لەوەلاَمدا ووتی: بۆ ئەوە هاتوین لە تاریکی کوفرو نەزانی دەرتان بهێنین بۆ ڕووناکی وخودا بەیەك ناسی (لاالە إلاالله) ڕۆستەم ووتی: ئەگەر وانەکەین.؟ موغەیرە ووتی: دەبێ سەرانە بدەن،دووبارە ڕوستەم ووتی: ئەی ئەگەر ئەویش نەکەین موغەیرە ووتی: شیرمان لەسەر ئەستۆ تانە ڕۆستەم هاتە قسەو ووتی: بێ گومان ئێمە سوپامان زۆرە, لەبەرامبەری ئێوە وەك و مێش وە هاین هەروەكو دەڵێن: ووتویانە هەرکەسێك بمان گەیەنێتە هەنگوینی دوودرهەمی دەدەینێ بەلاَم کاتێ گەیشتنە هەنگوین دەڵێن: هەرکەسێ لەهەنگوینمان ڕزگار بکات چوار درهەمی دەدەینێ!.

ئێستاش تۆ بڕۆ بۆلای هاوەڵەکانت پێیان بڵێ ڕۆستەم ووتویەتی : ئەگەر واز نەهێنن و شەڕمان لەگەڵ هەڵگیرسێنن هەموویان لەخاکی قادسیە گۆڕەکەم ئەوەش کۆتایی ووت و وێژی ئاشتی بوو لەنێوان موسڵمانان وبێ باوەڕاندا, ئەمجار موسڵمانان خۆیان ئامادە کرد بۆمەیدانی جەنگ ژمارەی سوپای موسڵمانان(۳۰۰۰) سێ هەزار سەربازی جەنگاوەر بوو, وە ژمارەی سوپای بێ باوەڕ( ۱۲۰۰۰۰) سەدو بیست هەزار سەربازی جەنگاوەربوو( ۳۳) سی و سێ فیلیان پێ بوو بۆ شەڕو جەنگ : هەردوو سوپا ئامادەی جەنگ بوون (سەعدی کوڕی وە قاس‌ﷺ) فەرمانی بەبانگدەری سوپادا کەلە هەموو پارچەکانی(کتائب) سوپا بانگ بدرێ بەوجۆرە ئەو ڕۆژە لەناو هەموو سوپای

جەنگاوەران بانگیان داو نوێژی بەجەماعە تیان کرد وە هێشتا خۆر (ڕۆژ) بە تەواوی بەدەر نەکەوتبوو بەهەشت وەك و خانەوادەیەکی سەوزو جوان ئامادەیی خۆی پیشان دەدا دەرگای کراوەی خۆی خستبوە سەرپشت بۆ موسڵمانە شەهیدو هەرگیز نەمردووەکان، ئەو بە هەشتەی کەجۆگە ئاوی سازگار بەناو باخەکانیدا تێ دەپەڕێ، لەجێگەیەکی خۆش و ڕازاوە لەلای پادشایەکی بە تواناو بەدەسەڵات.

وە لەو لاشەوە دۆزەخ دەرگای بەدبەختی و ئاوارەیی خستبوە سەر پشت بۆ بێ باوەڕو ستەم کارەکان جەنگ لە نێوان موسڵمانان و بێ باوەڕاندا بەرپابوو لەبەر ئەوەی موسڵمانەکان تەنها حوشتریان پێ بوو شپرزە بوون، چونکە حوشتر کەچاوی بەفیل کەوت ڕادەکات، لەوکاتەدا (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی ﷺ) ووتی: بۆ ئەوەی حوشترەکانمان بەسەر فیلەکاندا سەرکەوێ تاك تیك بەکار بهێنین، پەچەو ڕووپۆش بەسەر دەم وچاوی حوشترەکاندا بدەین بۆ ئەوەی فیلەکان وا بزانن ئەوە جنۆکەن و بەسەریان دا سەرکەوین, لە دوای ئەوەی کەڕوو پۆشیان بەست بە فەرمانی خودای گەورە فیلەکان ڕایان کردو توانای مانەوەیان نەما, بەوجۆرە سێ ڕۆژ جەنگ بەردەوام بوو لەکاتی خۆر ئاوا بوونی ڕۆژی سێهەم : یەکێك لەموسڵمانان بەفیداکاری و چاونەترسی بەناوی (هلالی کوڕی عەلقەمە ﷺ) وەك و بروسکە خۆی گەیاندە خەیمەکەی ڕوستەم و,شێرانە شیرێکی لەڕۆستەم داو کوشتی و بەرەو دۆزەخ ڕەوانی کردو دەنگی (الله اکبر) بەرز بۆوەو( الله اکبر) وائەمرۆ دوژمنی خودا ڕوستەمم کوشت و بەدۆزەخم سپارد کاتێ دەنگ وباسی کوشتنی ڕۆستەم لە ناو سوپای بێ باوەڕ بلاّو بۆوە، ورەیان بەرداو کۆسیان کەوت و هێزیان نەما بەرەو دواوە گەڕانەوە موسڵمانەکانیش بەدوایان کە وتن و سواری ملیان دەبوون وشیریان لێ دەدان، بەو شێوەیە فەرمانی خودای گەورە سەرکەوتن وپیرۆزی بووبەبەشی شوێن کەوتوانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) سوپای ئیسلام سوپای پێغەمبەری

خودا،سوپای قورئانی پیرۆز سەرکەوت وپشتی بیٚ بڕوایانیان بەچۆکدا هێنا, جەنگ هەربەردەوامە بە سەرکەوتوویی موسلٚمانەکان بە سەر کافری بیٚ باوەڕەکاندا بائەو جەنگە بەسەرکەوتویی موسلٚمانان نەختیٚ بەجیٚ بهیلٚین سەرێك لەخەلیفەی موسلٚمانان حەزرەتی عومەرﷺبدەین، حەزرەتی عومەر بەر دەوام لە بەر خودا دەپاڕایەوە کەسوپای ئیسلام بەسەر کوفردا سەربخات نوسەران ومێژو نوسان دەلٚێن: لەماوەی جەنگ دا حەزرەتی عومەرﷺ خەولەچاوانی نەکەوتووە بەشەو ڕۆژ زۆربەی کاتەکان دەڕۆیشتە دەرەوەی شاری مەدینە یان لەسەر ڕێگاکانی شار داد ە نیشت و چاوە ڕوانی دەکرد کەی نێردراوێك لەمەیدانی جەنگەوە بێت و هەواڵی مسلٚمانەکانی پیٚ بێت خەلیفەی موسلٚمانان هەردووچاوەکانی لەبەر بیٚ خەوی سورو ئەستور هەلٚگەڕابوون هەر بەو جۆرە حەزرەتی عومەرﷺ چاوەڕوانی ڕێگای دەکرد هەتا ڕۆژێك چاوی بە سوارێك کەوت دەهاتە شاری مەدینە، خەلیفەی موسلٚمانان پرسیاری لیٚ کرد ئەی برام بارو دۆخی موسلٚمانان چۆنە ولەچی دان .؟ کابرا نەی زانی ئەوە سەرکردەی موسلٚمانانەو عومەری کوڕی خەتابە وەلاٚمی دایەوە ووتی: مزگێنی بیٚ ئەی برای موسلٚمان کەبەڕاستی سەر کەوتون و سوپای گەورەی فارسیان بەچۆك هێناوە کابرای نێردراویش زۆر بەتالوکە بوو بگاتە شوێنی سەرکردە لەخانوی خەلافەتی دا بۆیە حەزرەتی عومەری بەجیٚ هێشت، حەزرەتی عومەریش ﷺلە دوای کابراوە کەوتەڕیٚ, کابرای نێردراو هەردەڕۆیشت وپرسیاری دەکرد،تاگەیشتە کۆمەلٚێك لەموسلٚمانان ڕایان گرت و ووتیان: وا سەر کردەی موسلٚمانان لەدواتەوەیە کابرا کە سەیری کرد ئەو پیاوەی کەلەڕێگا توشی هاتووە حەزرەتی عومەر بووە کابرازۆربەشەرمەزارییەوە لە ولاٚخەکەی دابەزیو داوای لیٚ بووردنی کرد بەلاٚم حەزرەتی عومەرﷺ دلٚی کابرای دایەوە ووتی: هیچ شتێك نەبووەو پێویست بەخەجالٚەتی ناکات . بەس پیٚم بلٚیٚ بارودۆخی موسلٚمانەکان لەچی دایە .؟ کابرا ووتی: مزگێنی بیٚ

موسـڵمانەکان سـەرکەوتوون و ئـەوەش نامەیەکـە لەمەیـدانی جەنگـەوە بـۆم هێناوی.

حـەزرەتی عومـەر ﷺ نامەکـەی وەرگرت وکردیانـەوە نوسـرا بـوو لـە (سـەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە ﷺ)بۆ سەرکردەی گشتی هێزە چەك دارەکانی موسڵمانان لەمەیـدانی جـەنگی فارسـەکانەوە بـۆ سـەرکردەی موسڵمانان (عومـەڕی کـوری خەتاب ﷺ)مزگێنی بیٚ بەیارمـەتی خـودا سواری پشتی دووژمنانمـان بووین و شیرمان لیٚ بەکارهێنان و بەسـەر یاندا سەرکەوتین و ورەی سوپاکەمان بەڕاستی بـەرزە بـەڕۆژ وەك وشـێری بڕنـدە لەمەیـدان دا دەجـەنگن وە کەشـەویش دیـَت لەبەریادی خوداو قورئـان خوێنـدن دەنگ وئاوازیـان وەك ونالـەی مێش هـەنگوین وایـە: وە ئـەی سـەرکردەی موسـڵمانان چـەند موسـڵمانێکمان لیٚ شـەهید بـوون پێش ئێمە کەوتن بۆ خزمـەت خودای گـەورە ئێمـەش داوامان لەخودای گـەورە ئەوەیە بەپایەی ئەوشەهیدانە بگەین وە هەموو موسڵمانە جەنگاوەرەکان ئاواتی شـەهیدیان هەیـە لـەپێناوی ڕزگاری ڕێگـەی خـودادا کاتیٚ حـەزرەتی عومـەر ﷺ لەخوێندنـەوەی نامەکـە بـۆوە سـەری کڕنۆشـی بۆخـودا دانەوانـد و سوپاسـی خـودای گـەورەی کـردو دەسـتی کـرد بـەگریان ووتیـان: ئـەی سـەرکردەی موسڵمانان تۆلە ڕۆژی سەرکەوتندا دەگریەی ؟!حەزرەتی عومـەر ﷺ فەرمووی :
(اخشى أن تفتح عليكم الدنيا فينكر بعضكم بعضا وينكركم اهل السماء عند ذلك)

واتە:من لەوە دەترسێم کەئێوە هـەموو جیهـان بەفەڕو پیرۆزی بە سـەر تاندا بڕژیٚ و دەرگای تەواوتان لەڕودا بکرێتەوە و ئاواڵە ببێتەوە و بیهێننە ژێـر ڕکێفی ئیـسلامەوە :بـەڵام هەنـدێك لـە ئێـوە واتـە: مرۆڤـەکان مـل ملانیٚ ولاقرتێـی هەندێکتان بکەن و ئەو کاتە دانیشتوانی ئاسمانیش مل ملانیٚ و لا قرتێی ئێوە بکەن ولەبیرتان بەرنەوە.

ڕوداوی جەنگی قادسیە لەمانگی شەوالی ساڵی چواردەی کۆچی بوو سوپای

## دۆستی باوەڕداران

ئیسلام ماوەیەك پشووی دا بۆ ئەوەی ئامادەیی خۆی دەربڕی، بۆجەنگێکی بەهێزترو ناخۆش تر لە گەڵ فارسەکاندا ئەویش جەنگی تێ پەڕینی سوپای ئیسلامە لە سەر دەریای(دجلە)، لە دوای پشودان کەکاتی ئەوە هات لە دەریای دجلەوە تێ بپەڕن بەرەو کۆشکی کسرا لە مەدائن، (سەعدی کوڕی ئەبی وە قاس رضي الله عنه) ووتی: ئێوە موسڵمانەکان بیری چتان هەیە, بێ گومان ئەگەر کیسرا لە کۆشکی پادشایەتی خۆیدا بمێنێتەوە مانای وایە ئێمە هیچمان نەکردوەو هەموو کاتێ ئامادەیە بۆ شەڕێکی تر لە گەڵماندا، ئینجا ئێوە چۆن دەتانەوێ لە دەریای (دجلە)وە بپەڕنەوە بۆ ئەو مەبەستە ؟ سەرکردەی گشتی هێزە چەك دارەکان (سەعدی کوڕی ئەبی وە قاس رضي الله عنه) کۆ بوو نەوەیەکی لەگەڵ لێپرسراوانی سوپادا کرد لە ناو،ناو دارو گەورە پیاوانی سوپادا (عاسمی کوڕی عەمری تەمیمی رضي الله عنه) ووتی: من بەخۆم وئە سپەکەمەوە دەپەڕمەوە کاتێ موسڵمانان منیان دیت پەڕیمەوە بائەوانیش لە دەریابدەن و بپەڕنەوە بەوجۆرە عاسم دەستەیەکی پێك هێنا ناوی لێنا دەستەی ترس وسام (کتیبە الاهوا ل) وە یەکەم دەستە بوو لە مێژووی سوپا دا کەلەدەریا پەڕینەوە, پێش پەڕینەوە عاسم لە سەر لێواری دەریا ڕاوەستاو ووتی: بە ناوی خودای بەخشندەو مەرەبان هیواو ئاواتمان لەسەرخودایە, ئەوەی ووتو: لە دەریای دا بەفەرمانی خودا قاچی ولاغەکەشیان تەڕنەبوو پەڕینەوە (٦٠) شەست موسڵمانی ئازاو چاونەترسیش لەدوای ئەو بەخۆیان و ئەسپەکانیانەوە پەڕینەوە (قەعقاعی کوڕی عەمریش رضي الله عنه) سوار چاکی مغاویر ووتی: ئەی بۆ ئێمە ڕاوەستاوین باوەك ئەوان خۆمان لە دەریا بدەین قەعقاع لە دەریای داو لەدوای ئەویش (٦٠٠)شەش سەد جەنگاوەری سوار چاك لەگەڵیدا پەڕینەوە, ئینجا لە دوای ئەوانیش هەموو سوپا هەرچی کەما بوو لە دەریای (دجلە)یان داوپەڕینەوە، وە مێژوو نوسەکان سوێند بەخودای گەورە دەخۆن یەکێك لەو سوپایە لە دەریا نقوم نەبوو نەخنکا هەموویان بەخۆشی پەڕینەوە،وەسوپای فارسیش لەلایەکی

دەریـاوە ڕاوەسـتابوون‌و نـەیان دەتـوانی جوولـە بکـەن کەچـاویان بەوسـوپایە دەکــەوت لەودەریایــە دەپەڕینــەوە ترسـێکی زۆر یـان لێ نیـشت وبــەرەو دوا بەڕاکردن هـەڵاتن‌و دەیـان ووت: ئەوانـە ئینـسان نین لـە گێتـی جنۆکـەن :( عالم الجن): دەناچۆن دەتوانن ئاوا لـە دەریا بپەڕنەوە،بەبێ‌بەلـەم‌و کەشـتی, وەکاتێ کسرا بۆی دەرکەوت سوپای ئیسلام نزیك بۆتەوەوبەرەو ڕویان دێت وچاوەڕێی مەرگ‌ونـەمان نـەمان دەکـەن ڕایـان کـردو نیشتمانی مـەدائینیان بـەجێ هێـشت لەدوای ئەوە سەرکردەی موسڵمانان( سـەعدی کوڕی ئـەبی وە قـاس) بەپێی پێ خواسی‌ومەندیلی سەری، بە دەستێك ڕمـی پـێ بوو بـەدە ستێکیش ڕ یشی گرتبــوو ڕۆیــشتە نــاو کۆشــکی ســپیەوە کــەتاك‌و ئێــستا شــتی وەهــا نەدیتراوە،بەرزییەکەی سەدو پەنجا مەتر بوو هەمووی بە فەرشی جوان‌و نایاب فەرش دار کرا بوو قاچ بە تـەواوی لـەناو فـەرشەکاند بزردەبوو هەرچی خۆشی جیـهان هــەبوو لەوشوێنە دا بـەدی دەکراوبەرچاوت دەکەوت .( سـەعدی کوڕی ئـەبی وە قـاس) دەگــەڕاو ئەوئایەتــەی دەخوێنــدەوە کــەخودای گــەورە دە فەرمویێ:

﴿الرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُواْ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾ ابراهیم/٤٥.

واتـە: ئایـا ئێـوە نـەبوون سـوێندتان دەخـوارد هـەرگیز لەوسـەرزەوییە ناڕۆن ونـامرن و بـەجێی نـاهێڵن‌و هـەتا هەتایـە دونیـای ئێـوە نابڕێتـەوە ئـەی ئێـوە لەشوێنی ئەوئادە میزادە پێشوانەدا نەنیشتبوون کە ستەمیان لەخۆیان کردبوو وەبۆ ئێوەم باس کردووە کەچۆن کردماننە پەندی ڕۆژگار کەچی ئێوەش پەندو ئامۆژگاریتـان لێ وەرنـەگرتووە وە بـەو جـۆرە سـەعد لـەناو کۆشـکەکەدا دەگـەڕاو بەرمبەکـەی لـە فەرشـە نایابـەکانی دەداو ئـەو ئایەتـەی دەخوێنـدەوە کـەخودا دە فەرموێ:

﴿كَمْ تَرَكُوا مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ * وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ * وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ * كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَـا قَوْمـاً آخَـرِينَ * فَمَـا بَكَـتْ عَلَـيْهِمُ الـسَّمَاء وَالْـأَرْضُ وَمَـا كَـانُوا

مُنظَرِينَ﴾الدخان/٢٥ - ٢٩

واتـە: چـەندەها بـاخی جـوان وسەرچاوەی ئـاوی ڕوونـاك وجێگـەو شـوێنی بـەرزو خـۆش وئەوشـتانەی کـەمۆی ڕابـواردنی ئـادەمیزادن لـە نـاو ئـەو لـەزەت وخۆشیانەدا دەژیان کەچی بەجێیان هێشت وئەوهـەموو سـەروەت و سـامانەیان لـەدوا بـەجێ مـاو ئێمـەش بـەمیرات دامانـە نەتەوەیـەکی کە،وەهـەرگیز ئاسمـان وزەویش بۆیان نەگریان و ماوەیان نەدان هەتا کاتێکی تر کە تێـی دانـەمێنن وە لـەناو کۆشـکی فـەرمان ڕەوایـی کسرادا جێگـەی تایبـەتی ئـاگر هـەبوو، لـەباتی خـودای گـەورە کڕنۆشـیان بـۆدەبرد یەکـەم شـت کەسـەرۆکی سـوپای ئیـسلام فەرمانی پـیێ دا لـە و شـوێنەدا بانگدەری بـانگی خـودا بوون کە بۆ یەکـەم جار لـەژیانی ئـادەمیزاددا بـانگی تێـدا بـدرێت بانگدەر ڕاوەسـتاو دەنگـی( الله اکبر) دونیای دەهێنایە جۆش کە گە شتە ووشـەی (اشهد ان لااله الاالله) ئاگری ئـاگر پەرستان بەهێزی برایەتی و خودا پەرستی نەماو کوژایەوە لە دوای نوێژ کردن کەل وپەلی دەست کەوتی شەڕیان کۆ کردەوە . لە دوای دا( سەعدی کوڕی ئـەبی وە قاس﷽) بەشی جەنگاوەرەکانی بەسـەریاندا دابـەش کرد ئـەو بەشـەی کـەما بـۆوەش بـۆ خـەزینـەی موسـڵمانان ڕەوان کـرا لەگـەڵ بازنـەو بـاز بەنـدی کیـسرا بـۆلای حـەزرەتی عومـەر﷽ کـاتیێ حـەزرەتی عومـەر ﷽وەری گـرت سـەیری حەزرەتی( عـەلی کـوڕی ئـەبی تالب﷽) ی کردو ووتـی: بـیێ گومـان ئەونەتـەوەی ئەوەی کردووە زۆر دە ست پاك وئەمینـە حـەزرەتی عـەلی وەلآمـی دایـەوە ووتـی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان تۆ پارێزگارو دەست پاکی بۆیە ژێر دەستەکانیشت پارێزگارو دەست پاکن، وە ئەگـەر تـۆش خـراپ وناپـاك بووبایـە ئـەوا گـەل و ژێـر دەستەکانیشت خـەراپ وناپـاك دە بوون، ئینجـا لـە دوای ئـەوەی کـەبت خانـەی ئـاگر پەرسـتانی کـسرا لـەولآت دا نـەما دانیـشتوانی عێـراق و ئـێران پـۆل پـۆل دەهاتنـە نـاو کەمەنـدی دینـی سـەربەرزی ئیـسلام و دەبونـە براوخۆشەویـستی یـەکتری وە (ا ن شـاء الله) ئێمـەی چەواشـەو دەسـت بەسـەر بەیارمـەتی خـودای

## دۆستی باوەڕداران

گەورەو تێکۆشانی موسڵمانە لەخودا ترسەکان بەدڵسۆزیو خۆشەویستی یەکتری دەگەڕێنەوە ناو کەمەندی دینی سەربەرزی ئیسلامو سەربەرزو سەر فیراز دەبێنو ڕێچکەی خوارو هەڵدێرو دروست کراوەکانی بێ باوەڕی واز لێ دێنین و خۆشی وئاسایشمان بۆ دەگەڕێتەوە بە بەختەوەری یەکتری خۆش نودو خۆشحاڵ دەبین.

## ﴿ گیانی ئاوەدان بەخۆشە ویستی خودا ﴾

## (قلوب عامرة بالحب الإلهی)

دەگێڕنەوە (یەحیای کوڕی بەستام ﷺ) وتوویەتی ڕۆژێك لەگەڵ چەند کەسێك لە دۆستەکانم چووین بۆلای (عەفیرە) خاتونی خوداپەرستی چاوکوێر ئەو ئافرەتە بە یادی خوداو خۆپارێزی زۆر خۆی هیلاك دەکرد وە لە ترسی خودا بەردەوام دەگریا هەتا چاوەکانی کوێرونابینا بوون یەکێك لە دۆستەکانم بەپیاوێکی تەنیشتی خۆی ووت:بێ گومان کوێری شتێکی ناخۆشە بەتایبەتی بۆکەسێك کەلەپێشدا بینا بووە (عەفیرە) گوێی لە ووتەی ئەوپیاوە بوو ووتی: ئەی بەندەی خودا کوێری دڵ واتە: خودا نەناسی زۆر گەورە ترو خەراپترە لە کوێری چاو, بێ گومان، من ئارەزوم دەکرد خودای گەورە جەوهەری خۆشەویستی خۆی پێ ببەخشیمایە:
ئەوکاتە بەپەرۆشەوە نەبووم هەرچی گیانم هەیە لێی وەربگرتبامایەوە.

## ﴿ ڕەفتارو نەریتی پێشوەکان پێشە نگی چاکی ئێمە بوون. بە تێپەربوونی چە رخی ڕۆژگار﴾

## (أخلاقهم قد وة صا لحة عـلى مر العصوروالأجيال)

أقسمتُ يا نفس لتنزلنه إن أجلب الناس وشدوا الرنة ما لي أراك تـــكرهن الجنة قــد طا لـما قــد كنت مطمئنة هل ا نت الا نطفة في شنة ؟

واتە:سوێند بە خودا دەخۆم ئەی نەفس بەڕاستی تۆ دادەبەزی کاتێ خەڵك کۆ بوونەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ مەیدانی جەنگ خـۆیان ئامادە کردو بەچریکەی بەرز هاواریان کرد بۆچی من تۆ دەبینم لەو کاتەدا لە بەهەشت بێزاری بەمەرجێك کاتی زۆری ژیانت بەخۆشی بەڕێ کردووە، وە ئایا تۆپارچەو نوتفەیەك نەبوی ئێستابوویە ئەوئینسانەو هێرشت بردە سەردوژمن و پەرتەوازەت پێکردن.

بەڵێ ئەو سرودە بەتینە بوو بەهەموو هەست و سۆزێکەوە کۆتایی بەژیانی دۆستی پایەبەرز(عبدالله ی کوڕی ڕەواحە) هێنا: وەکۆتایی دواین بەش لەبە شەکانی خووڕەوشتی کاروانی ئازایەتی و چاپوکی و هونەری پڕ لە سەروەری و شکۆمەندی بەنوری خۆپارێزی و خودا پەرستیەوە بەرێ کرد، ئەو ڕۆژەی کە نـوری سـەرداری عالـەم لـە مەکـە دەرکـەوت (عبـدالله کـوڕی ڕەواحـە) کەڵـە شاعیرێکی بەرز بوو لەناو شاعیرانی مەدینەدا، وەسەرکردەو سەردارێکی بەناوو شۆرەت بوو لەناو سەرکردە کانی هۆزی خەزرەج دا،کاتێ بانگەوازی ڕێ نمونی ڕاستی پـێ گەیشت خـودا دڵ و دەرونـی ڕوونـاك کـردەوە بـۆ وەرگرتنـی ئـاینی ئیسلام، وە دەم و زوبانی بەتـەواوی ڕام کـرد بـوو, تـەنها بـۆ خـودا پـەرەسـتی و ڕەزامەندی خوداو پێغەمبەرە ناوازەکەی.

(عبـدالله ی کـوڕی ڕەواحـە) بـەهۆی زانستو زانیارییەکـەی و شـعرە تـەڕو پاراوە کانی بەشێوەیەکی زۆر بەرزو بەڕێز بـەرگری لـە پێغەمبـەرو لـە ئاینەکـەی

دەکرد وەخودا دەربارەی ئەو کەڵە شاعیرەو د ووهاوڕێ بەڕێزەکەی کە( حسا نی کوڕی سابت ﷺ) و( کەعبی کوڕی مالك ﷺ) بوو، ئایەتی ناردە خوارو تایبەت مەندی ئەوانی خستە ڕوو کە هەتا دوونیا هەیە لە پێشەنگی کاروان دا ناویان دیارەو دەبیستریێ. وەك و خودا دەفەرمویێ: ﴿وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ* أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ* وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ* إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيراً وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا ﴾الشعراء/٢٢٤-٢٢٧.

واتە:شاعیرەکان بەتەنها بێ باوەڕو لەڕێ لادراوەکان بە شوێنیان دەکەون ئەی نازانی شاعیران بەهەموو دۆڵ و شیوێك دا دەڕۆن و زیادە ڕەوی دەکەن و لە هەموو گۆماوێك دا مەلە دەکەن . وەشتێك دەڵێن: بەڵام عەمەلی پێ ناکەن بەتەنها شاعیرە باوەڕ دارەکانن لە سەر ڕێبازی چاکەن و سیفەتی بەرزیان هەیە کە باوەڕی تەواو یان بەخودا هەیە و کردەوەی چاکە دەکەن و زیکرو یادی خوداش زۆر دەکەن باسی بەخەراپە ناکەن و تەنها یادی خوداو هاندانی خەڵکی لەسەر چاکە کردن دەکەن، وە باسی کەس بەخەراپە ناکەن تەنها ئەوانە نەبێ کە لەپێشەوە باسی ئەوانیان بەخەراپە کردووە، وە بەڕاستی ئەو شاعیرانەش بەرگریان کرد لە ئیسلام و لە پێغەمبەرە (ﷺ) کەی لەکاتی جەنگی بێ باوەڕاندا، ئایا هیچ شتێ لە وە گەورە ترو بە نرخ تر هەیە کە خودا لە بەرامبەریدا قورئان دا بەزێنێ و وەسفی ئینسان بکات و، ئەو باسەش لە هەموو کەلەبەری جیهان بەشەو بەرۆژ هەتادونیا هەیە باس بکرێ و لە یاد نەچێتەوە،( عبدالله ی کوڕی ڕەواحە ﷺ) ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە کە چاکترین پەیمان بووە وە یەکێك بووە لەو زاناو سەرۆکانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) کردونیە پێشڕەو بە سەر گەلەکەیاندا بەڕاستی ئەوەش چاکترین فەرمان دەرو باشترین سەرکردە بوو هەر لەو کاتەوە کە عبدالله ی گەنجی هۆزی خەزرەج باوەڕی هێنا بەخوداو ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ)) ی گرتەبەر ئارەزوی وا بوو کە هەموو ئاواتی ژیانی لە فەرمانی خودا بباتە سەر، بۆیە بەڕاستی هەموو تەمەنی ژیانی بردە سەر بە

جیهادو پەرستن و ڕۆژوگرتن. بەڕۆژ بەڕۆژو دەبوو بەشەو شەو نوێژی دەکرد (ئەبوودەرداﷺ)دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: جارێکیان لە کۆچ و گەڕانێك دا لەگەڵ پێغەمبەری خودادا(ﷺ) لەڕۆژێکی گەرمای زۆر بەتیندا کە لەبەر هێزی گەرما ئینسان دەستی بە سەریەوە دەگرت، کەس توانای ڕۆژو گرتنی نەبوو تەنها پێغەمبەر(ﷺ) و (عبدالله ی کوڕی ڕە واحەﷺ) نەبێ بەڕۆژو بوون، وە عبدالله لە گەڵ پێغەمبەری خوداﷺ ئامادەی جەنگەکانی بەدرو، ئوحودو، خەندەق و، حودەیبیە، بووە کە ئەوەش بەڕاستی گەورەترین ڕۆژو بەڕێزترین جێگایە، وە لە سالی هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ، سێ هەزار جەنگاوەری بۆ وڵاتی شام بەڕێ کرد بۆ بەربەرەکانی دەوڵەتی ڕۆم بۆ ئەو مەبەستە (زەیدی کوڕی حارسەیﷺ) کردە سەر لە شکری سوپا وە فەرمووی: ئەگەر زەید پێکا یان شهید بوو ئەوا سەرکردەی سوپا ( جەعفەری کوڕی ئەبی تالبﷺ) دەبێ ئەگەر ئەویش پێکرا یان شهیدبوو، ئەوا سەرکردەی سوپا (عبدالله ی کوڕی ڕە واحەﷺ) دەبێ، ئەگەر ئەویش پێکرا یان شهید بوو با ئەو کاتە موسڵمانان یەکێك بکەن بەسەرکردەی سوپا، کاتێ جەنگاوەران ئامادەی ڕۆیشتن بوون ویستیان نیشتمان بەجێ بهێڵن:خەڵکەکە خودا حافیزیان لەسەربازو سەرکردەکانی سوپا یان دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) کردبوونی بەسەرکردە، کاتێ خودا حافیزیان لە عبدالله کرد سەیریان کرد دەگریا پێ یان ووت: ئەی عبدالله چی بووە دەگریەی؟، ئەویش فەرمووی: سوێند بەخودا بۆ خۆ شەویستی دونیا ناگریەم، بەڵام .گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئەو ئایەتەی خو ێندەوە کە باسی ئاگری دۆزەخ دەکات دەفەرموێ :﴿ كُلًّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِداً﴾ مريم/٧٢.

واتە: سوێند بەخودا هەموو کەسێك دەبێ بچێتە ناو ئەو ئاگرەوە ئەوەش کارێکەو خودا بڕیاری لە سەرداوە، ئینجا عبدالله فەرمووی: باوەڕی تەواوم هەیەکە دەچمە ناوی بەڵام, نازانم لەدوا ییدا چۆن ڕزگارم دە بێ، ئەمجار

## دۆستی باوەڕداران

موسڵمانان فەرموویان: خودا هامڕازو هاودەمتان بێت و، خەراپەو ناڕەواتان لێ لا بدات و، بۆلای ئێمەتان بگێڕێتەوە، کاتێ گوێی لە پاڕانەوەکە یان بوو کە وتیان: بۆلای ئێمەو خانەوادە تان بگەڕێنەوە: ئەم شعرەی فەرموو:

لكنني أسألُ الرحمن مغفرة وضربة ذات فرع تقذفُ الزبدا
أوطعنة بيدى حران مجهرة بحربة تنفذُ الاحشاء والكـــبدا
حتى يقال اذا مرّواعلى جدثي أر شدة يارب من غا ز فقد رشـدا

دوای ئەوە کە سوپا لەمەدینە دوور کەوتەوە عبدالله سەیری کرد لە دوایەوە (زەید ی کوڕی ئەرقەمﷺ) کە هەتیو بوو باوکی نەما بوو لە لای عبدالله ژیانی دەبردە سەر بەکوڵ دەگریاولە خۆیەوە دەی ووت :

اذا أدنيتني وحملت رحلي مسيرة اربـــع بعد الحاء
فشأنك انعم وخـــــلاك ذمّ ولا ارجع الى أهلي ورائي

وە هەر بەم شێوەیە ئەو کوڕە دەگریا، بۆیە (عبدالله کوڕی ڕە واحەﷺ) بە ئاگای هێنایەوە ووتی: ئەوە چیتە وا دەگری،ئایا لەوە خۆشتر هەیە کە خودا شەهیدیم پێ ببەخشێوبە سواری ولآخەکەم بگەڕێیەوە بۆمەدینە، ئینجا کاتێك جەنگاوەرانی موسڵمان گە یشتنە خاکی (مەعان) لە (ئوردەن) بۆیان دەرکەوت کە پادشای ڕۆم لە (بەلقا)کە جێگەیەکە بارگەی خستووە زۆر لە شوێنی موسڵمانەکان دوورنیە(٢٠٠٠٠٠ ) دوو صد هەزار جەنگاوەری ڕۆم و گاوری عەرەبی لەگەڵ دایە لە هۆزەکانی لەخم و، جوزام و، قوزاعەو، ئیتریش .

جەنگاورە موسڵمانەکان کە سە یری ئە و هەموو سوپا زۆرەی ڕۆیان دەکردو، سەیری کەمی خۆیان دەکرد، بیریان لەوە دە کردەوە نامەیەك بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بنوسن و ئاگاداری بکەنەوە، یان فەرمانی گەڕانەوەیان پێ بدا،یان هێزی یارمەتی دەریان بۆ ڕەوانە بکا، بەلآم (عبدالله ی کوڕی ڕەواحەﷺ) هەستایە سەرپێ فەرمووی: ئەی جەنگاوەرەکانی ئیسلام ئەوەی ئێوە ئاواتی بۆ دەخوازن

و داوای دەکەن کە شەهید بوونە ئەوە گەیشتوونە ئاواتەکەتان، وە ئێمە جەنگ ناکەین لەگەڵ دووژمن بە زۆری ژمارەیان یان بە زۆری هێز،بەڵکو بەناوی ئەو ئاینە جەنگ دەکەین کە خوداڕێزی لێناوین بڕۆن دەرچن بۆشەڕ یەکێك لەو دووانەمان پێدەگات یان سەرکەوتن یان شەهیدبوون

بەوجۆرە سوپای جەنگاوەر فەرمانی عبدالله یان وەرگرت‌ودەستیان کرد بەخۆ ئامادە کردن بۆ بەربەرەکانی دووژمن، بۆ ڕۆژی دوایی(٣٠٠٠) سێ هەزار جەنگاوەر بەرامبەر(٢٠٠٠٠٠) دوو سەد هەزار جەنگاوەری بێ باوەڕ ڕاوەستان، ئەو دوو هێزە لە نزیك گوندی (مؤتة) لە نیشتمانی (ئوردون) بەیەك گەیشتن لەپێشەنگی جەنگاوەرانی موسڵمان (زەیدی کوڕی حاریسە‌ﷺ) بوو هەڵگری ئاڵای پێغەمبەر(ﷺ) خودا، ئەو سەرکردەی بە توانایە لە شەڕێکی بەهێزی بەرامبەری مەیدان داری دا شەڕی کرد، بەڵام لەبەر زۆری و بەهێزی شەڕەکە زەیدپێ کراوە ڕەمبی دوژمنان لە سنگیەوە دەرچووەو گەیشتە پلەی شەهادەت. ئەمجار لە دوای زەید : شێری مەیدانو دوژمن شکێن (جەعفەری کوڕی ابی تالب‌ﷺ) برای حەزرەتی عەلی، ئاڵایەکەی بەرز کردەوەوچووە ناو جەنگەی مەیدان، بەڕاستی ئازایەتی ولێهاتووی ئەو سەرکردە نایەتە باس کردن بە جۆرێك شەڕی دەکرد کەس جەنگی ئاوای نەدیبوو،جەنگ زۆرتر گەرم بوو هێرشی دووژمن زۆر زیادی کرد بۆ سەر موسڵمانان خۆی لە سواری ولاغەکەی فڕێ داو لە ناو ئاپۆڕەی ڕۆم دا جەنگی دەکردو دەی ووت:

یا حبذا الجنة واقترا بها طيبة وبارداً شرابها
والروم روم قد دنا عذابها كافرة بعيدة أنابها
عليّ اذ لاقيتها ضرابها

واتە: خۆشی و خۆزگە بۆ بەهەشت و نزیك بوونەوەی پاكو بۆن خۆشە، ئاو خواردنەوەکەی ساردو سازگارە, وە ڕۆم ڕەومە وا تە: نەتەوەیەکی دێرینەو داواکارو ئارەزو دڵخوازیان زۆرە و، ئازارو سزایان لێ نزیك بۆتەوەو بێ باوەڕنو

گەڕانەوەیان زۆر دوورە بۆلای خودا بۆیە پێویستە لەسەرم کە تووشیان هاتم لێ یان بدەم و مۆڵە تیان نەدەم . بەو جۆرە کردمە هەڵبەست:

خۆزگەم بە بە هەشت دڵگیرو خۆشە نەسارد نەگەرمە بنوەو بنۆشە
ساردیوسازگاریوخۆشیوخواردنی بەر دەوام دەژیو بەبێ مردنی
خودا عەزابی گرتووە لە ڕۆمان بۆیە شەڕ دەکەن نابنە موسڵمان
پێویستە لە سەر ئێمە هەموومان کە توشیان هاتین نەیاندەین ئەمان

بەڵێ: ئەم سەرکردە شەڕی دەکرد بەلای چەپوڕاستی دا شیری دەوە شاندو دووژمنی فڕێ دەدا هەتا لە نەکاوێك دە ستی ڕاستی بەشیری دووژمن پەڕی،بەڵام . لەو کاتەش دا موسڵمانی خودا پەرست سەرکردەی جەنگاوەر نەی هێشت ئاڵای پێغەمبە ر (ﷺ) بکەوێتە سەرزەوی هەر خێرا بەدەستی چەپی ئاڵاکەی بەرز کردەوەو جەنگی دەکرد هەتا قەدەری خودا واهات کە دەستی چەپیشی پەڕی لەو کاتەش بە هەردو قۆڵی براویەوە ئاڵاکەی بەرز کردەوەو لە ناو دووژمن دا هێرشی دەبرد هەتا بەجارێ ڕووحی پاکی بەرەو بارەگای خودا کەوتەڕێ وشهید بوو.

ئەمجار: سەرکردەی سێهەم( عبدالله ی کوڕی ڕەواحە رضي الله عنه) کە تاكو ئێستا وەكو جەنگاوەرێك شەری دەکرد بەئازاییو مەردا نە پارێزگاری لە دینی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد، ئەوجار بوو بە سەرکردە, لێپرسراوی کەوتۆتە سەر بۆیە پەلاماری ئاڵاکەی داو بەرزی کردەوە, چوو بەشوێنی هاوەڵەکانی کەوت زۆر دڵ تەنگ بوو دوودڵیو دڵەڕاوکەیەك گرتیو ڕاوەستا, ئەمجار لەگەڵ نەفسی خۆی کەوتە گوفتارو ووتی:

یا نفس الا تقتلی تمو تی هذا حمامُ الموت قد صَلیت
وما تمنیت فقد اعطیت ان تفعلی کفعلهـــا هد یـت

واتە: ئەی نەفس باش بزانە ئەگەر نەشکوژرێی دەمری ئەوە ئاگری مردنەو هەڵگیرساوەو تۆش کەوتویە ناوی، ئەتۆ ئاواتت بۆنەخواستوەوداوای شەرت

نەکردوە . بەڵام واهاتۆتە پێش ودەرگای پێگرتووی، ئەگەر وەك و هاوەڵەکانت بەڕاستی بڕۆیە مەیدانو تێبکۆشی دڵنیابە سەربەرزو سەر فیراز دەبیت و، بەهەشتت پێ دەبەخشرێ :بەوجۆرە کردمە هەڵبەست:

باش بزانە ئەی نە فس کو شتنیش نە بێ دە مر ی
ئاگری شەڕ هە ڵگیرسا تۆ بۆچی وا بە سە بر ی
خۆ تۆ داوات نەکردووە شەڕت بۆ ها تۆ تە پێش
بڕۆ مەیدان بجەنگێ هەرگیز مەترسێ لەئێش

بەڵی. هەربە و جۆرە بیری دە کردەوە لە دڵەڕاوکەدا بوو سامی لێ نیشتبوو ئەمجار بەخۆی دا چۆوەو فەرمووی :

واللە لولا اللە ما اهتد ینا ولا تصد قنا ولا صلینا
فأ نزلن سکینة علینـــا وثبت الاقدام ان لاقینا

واتە: سوێند بەخودای ئەگەر خودا نەبا ئێمە شارەزا نەدەبووینو خێرمان نەدەکردو نوێژمان نەدەکرد، ئەی خودایە ئارامیمان بە سەردا بڕێژەو دڵ نەوایمان بکەو، هێزمان پێ ببەخشەو،قاچمان ڕابگرە کاتێ تووشی دووژمن، یاناخۆشی بووین :

اللە خودای ئێمە یە و ئە و هیدا یە تی د ا و ین
چاکەو پیاوەتی دەکەین نوێژان دەکەین تاماوین
چو نکە گە ر خو دا نە با، نەعو ذ با للە لە وە
وامان دەزانی دونیا بەس بۆخـــواردن وخە وە
خوا یە ئارامی و خۆشی بڕژ ێنە سەردەرونمان
خۆڕاگری و سەرکەوتن کە دووژمن هاتە ڕێمان

ئـەمجار: غیرەتـی دایـە خـۆیو ئاڵاکـەی هـەڵگرت و بـۆ ناوجەرگـەی شـەڕێ کەوتەڕێ لەوکاتـەدا کوڕی مامی پارویـەك خواردنی بۆ بردو ووتـی: سـێ ڕۆژە نانت نەخواردووە, ئەوە بخۆ باتۆزێك هێزت بێتەوە بەر ئەویش وەری گرت و بۆ دەمی بردو گەیشتە سەر دەمودانی و، سە یری هێرشی دووژمنی کرد کەچۆن شـاڵاو بـۆ موسـڵمانان دێـنن هـاواری کـردو فـەرمووی: چـۆن ئەوشـەڕو شـاڵاوە لەسەر موسڵمانانەو ئەتۆش دەتەوێ لەدونیادا بژی، هـەر خێـرا نانەکـەی بەلاوە ناو شیرە کەی دەست دایەو بۆناو ئاپۆرەی شەڕ ڕۆیشت، زۆر بەمەردانـە شـەڕی کـرد لــە ناوئەوهەمووحەشــاماتەی دووژمنــدا هــەتا شــهیدبوو: کەخەبــەری شـەهیدبوونی هەرسـێ سـەرکردەکە گەیشتە پێغەمبـەر (ﷺ) داوای نـزای خێـرو لێخۆش بوونی بۆ ئـەوانو هـەموو موسڵمانان کرد، وە فـەرمووی: خـودا ڕەحـم و مهرەبانی بە( عبدالله کوڕی ڕەواحە رضي الله عنه) بکـات کەبەڕاسـتی ئـەو کـوڕو کۆمەڵـەی خۆش دەویست کە فریشتەکانی خودا شانازیان پێوە دەکرد.

***

سوپاس بێ پاشان بۆ خودای تاك و پاکی مهرەبان لەخودا دەخوازم ئەو پەڕاوەم بۆ بکاتە بەشێکی کرداره چاکەکانم و هیوای خۆشیم پێ ببەخشی ومببێتە مایەی خێرو خۆشی بۆ هەموو ئازیزو خوێنەران و داوای نزای خێریان لێدەکەم .

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

ناوەرۆک- کلیلی دەرگای باسەکان